پرۆژەی تیشک |6

دیدارو پەیڤین

# دۆزی کورد

## له نێوان بیری نەتەوەیی و ئاینییدا

ئامادەکردن:

ئارام عەلی سەعید

# دۆزی کورد

# لە نێوان بیری نەتەوەیی و ئاینییدا

دیدارو پەیڤین

ئامادەکردنی:
ئارام عەلی سەعید

ناوی کتێب: دۆزی کورد لە نێوان بیری نەتەوەییو ئاینییدا

ئامادەکردنی: ئارام عەلی سەعید

ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٨٤)ی ساڵی (٢٠٠٩)

بابەت: دیدراو پەیڤین

نۆرەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

دیزاین: ئارام شوانی

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (62)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

## پێشکەشە بە:

- هاوڕێ و هاوسەری راستەقینەی ژیانم (رێناس جاف)

- کوڕە چاوگەشەکەم کاکە (میرباد)

- دایك و باوکی خۆشەویستم کە لەگەڵ سەختی و نەهامەتییەکانی ژیانماندا پێیانگەیاندم

- هەموو کوردێکی هۆشیار بە مەسەلەی نەتەوەکەی

# بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

نەك هەر جێی خۆیەتی بەڵكو زۆر پێویستیشە بۆ ئەو میللەتانەی كە لەڕووی سیاسیی، یا ئابوری، یا زانستی و رۆشنبیری، وەیا كۆمەڵایەتییەوە لە دوای میللەتانی ترەوەن لێكۆڵینەوە لەسەر هۆكارەكانی ئەو دواكەوتنەیان بكرێ ، كوردیش وەكو یەكێك لەو میللەتانەی كە لە هەموو ئەو ڕووانەوە لە دوای میللەتانی دەوروبەریەوەتی ، بەتایبەت لە ڕووی سیاسییەوە، كە سەرەڕای ئەوەی خاوەنی نیشتمانێكی بەرفراوان و حەشیمەتێكی زۆرە كەچی تاكو ئێستا خاوەنی قەوارەیەكی سەربەخۆو تایبەت بە خۆی نییە ، جێی خۆیەتی ئاوها پرسیارێك لە ناوەندە سیاسیی و ڕۆشنبیری و تەنانەت جەماوەرییەكانیشدا بوروژێت و خەڵكی بپرسن بۆچی ئێمەی كورد تاكو ئێستا نەبووینەتە خاوەنی قەوارەیەكی سەربەخۆی خۆمان، لە كاتێكدا كە میللەتانی دونیا بەگشتی ودەوروبەرمان بەتایبەتی هەموو خاوەنی قەوارەو كیانی سەربەخۆی خۆیانن؟

ئەوەی سەرنج دەدرێت لە كوردستاندا ئەوەیە كە تاكو ئێستا ئەو شتانەی دەوترێت دەربارەی دواكەوتوویی میللەتی كورد –بەتایبەت لە ڕووی سیاسییەوە– زۆربەیان شتی سەرپێیی و ڕووكەشین و لەدەرئەنجامی لێكۆڵینەوە نین ، بەڵكو زۆرێكیان دەرهاویشتەی باكگراوندێكی ئایدیۆلۆژی تایبەت یا پەرچەكرداری تایبەتن و لە نەزانی و دەمارگیرییەوەسەرچاوەیان گرتووە ! دەتوانم بڵێم تاكو ئێستا لێكۆڵینەوەیەك و توێژینەوەیەكی زانستی بێلایەنانەی بابەتییانە لەسەر ئەم پرسە نەكراوە، لێرەوە ئێمە لە پرۆژەی تیشكدا بە پێویستمان زانی دەستپێشخەرییەك لەم بوارەدا بكەین و وەكو بەركولێك بۆ ئەم مەسەلەیە هەوڵ بدەین سەرەتا دیدو بۆچوونە جیاوازەكان بخەینە ڕوو، بەهیوای ئەوەی سەنتەرەكانی لێكۆڵینەوە توێژینەوەی چڕوپڕترو زانستییانەتری لەسەر بكەن و

هۆکارەکان دەست نیشان بکەن و ئەو فاکتەرانە بخەنە ڕوو کە ڕۆڵیان هەبووە لە دواکەوتنی میللەتی کورد لەو هەموو بوارانەداو بکرێنە پرۆژەیەك و بخرێنە بەردەستی سیاسەتمەدارو بەرپرسانی میللەتی کورد بۆ ئەوەی لەسەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییانە نەخشە بۆ دوارۆژی کورد بکێشن و ئەو هەڵانە دووبارە نەکەنەوە کە پێشینانی کورد کردوویانە.

دیارە دەستنیشان کردنی ئەو فاکتەرو هۆکارانە بایەخ و گرنگییەکی زۆریان هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەداهاتوودا، هەروەکو چۆن دکتۆرێك ناتوانێت چارەسەری نەخۆشێك بکات بێ زانینی نەخۆشییەکەی، بەهەمان شێوە کورد ناتوانێت و بەبێ زانینی هۆیەکانی دواکەوتوویی و ژێردەستەیی هەنگاوی ڕاست بنێیت بۆ داهاتووی خۆی . لێرەوە پێویست دەکات لەسەر ئەوانەی لەسەر ئەم مەسەلەیە دەنووسن، یا لێکۆڵینەوە دەکەن دووربن لە هەموو دەمارگیری و پەرچە کردارو هەڵوێستی لەوەبەرو ئامادەکراو، زۆر زانستییانە لێکۆڵینەوە بکەن لەسەری بۆ ئەوەی سیاسەتمەدار و بەرپرسانی کورد سوودی ئیجابی لێوەرگرن بۆ داهاتوو، چونکە ئەگەر ئەو زانیارییانە هەڵەبن دەرەنجامەکانیش بە دڵنیاییەوە هەڵەدەبن و لەزەرەری کورد تەواو دەبن، ئەو کاتە تاوانی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی ئەو توێژەرو لێکۆڵەرەوانە، بەهەمان ئەو شێوەیەی کە بەرپرسیارێتی بەکارهێنانی دەرمانی هەڵە بۆ نەخۆشێك لەلایەن دکتۆرێکەوە کە بە پشت بەستن بە تاقیگەی هەڵە نووسیویەتی بەشێکی زۆری دەکەوێتە ئەستۆی ئەو تاقیگەیەی ئەو ئازمایشە هەڵەیەی کردووە ، بەرپرسیارێتی هەر هەنگاوێکی هەڵە کە لەلایەن سیاسەتمەدارو بەرپرسانی کوردەوە بە پلەی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی ئەو توێژەر و لێکۆڵەرەوانە.

ئەمڕۆ لە وڵاتاندا سیاسەتمەداران بڕیاری خۆیان لەسەر ڕۆشنایی ئەو توێژینەوەو لێکۆڵینەوانەوە دەدەن کە سەنتەرەکانی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە پێشکەشیان دەکەن ، ڕاستی و هەڵەی بڕیارەکانیان بەپلەی یەکەم وابەستەیە بە وردی و

ڕاستی ئەو زانیارییانەی ئەو سەنتەرانە پێشكەشیان دەكەن ، بەرپرسانی كوردیش پێویستە لەسەر ڕۆشنایی توێژینەوەو لێكۆڵینەوەی زانستی بڕیاربدەن و هەنگاو بنێن ، ئەمەش ئەوە دەخوازێت كە پێش هەموو شتێك هەوڵبدەن ئەو جۆرە سەنتەرو بنكانە بكەنەوە كە ئەم پرسانە بە شێوەیەكی زانستییانە تاووتوێ دەكەن . ئەو سەنتەرانەش پێویستە هەڵگرانی هەموو پسپۆری و بیروبۆچوونەكانی تێدا بێت بۆ ئەوەی لە هەموو گۆشە نیگاكانەوە تەماشای ئەو پرسانە بكرێت نەك قۆرخ بكرێت بەسەر ئەو لایەنانەی كە لەیەك گۆشەنیگاوە بۆ شتەكان دەڕوانن یا دەمارگیرانە یا بەپەرچە كردار مامەڵە لەگەڵ شتەكان دەكەن.

ئێمە لێرەدا چاوپێكەوتنمان لەگەڵ پێنج كەسدا كردووە ، سێیان كوردی كوردستانی باشور و دووشیان كوردی كوردستانی ڕۆژهەلات و چەند پرسیارێكمان ئاڕاستە كردوون و لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ بۆچوونەكانی هەندێكیاندا نین، بەلام وەلامەكانیان وەكو خۆیان بێ دەسكاری و زیادو كەم بلاوكردۆتەوەو خوێنەرمان كردۆتە دادوەر و دەتوانێت بڕیاربدات كام لەوانە زانستیترو بابەتییانەتر نووسراون، ئەمانەی لێرەدا بلاوكراونەتەوە دیدو بۆچوونی لایەنە جیاوازەكانن و دەكرێت بكرێتە بەشی یەكەمی ئەو توێژینەوەو لێكۆڵینەوانەو چاوەڕوانی كۆمێنت و ڕای خوێنەرانین بۆ ئەوەی بۆ بەشەكانی تر سودیان لێوەرگرین و لەگەڵ خەڵكانی تری پسپۆرو شارەزا وتووێژی زیاتری لەسەر بكەین و وەكو لێكۆڵینەوەیەكی پوخت و بەكەڵك و ئیجابی بیخەینە بەردەستی خەڵك و بەرپرسان و بتوانین لەئەنجامدا بەیەك دیدی تۆكمە و ڕاست دەربچین و هۆكارەكان بەشێوەیەكی زانستی و بابەتییانە بخەینەروو.

خوا هاوەڵ و یاریدەدەر بێت بۆ خزمەتی زیاتری میللەت و راستی.

**پرۆژەی تیشك**

**٢٠٠/٢/٦**

## وتەیەکی کورت و پێویست

نێوەندی عەلمانیەتی کوردی هەروەکو لە زۆربەی بوارە جیاوازەکانی تردا کەوتۆتە گێژاوو گەندەڵی برستی لێبڕیوە، بە هەمان شێوە لە ڕوانگە فیکریی و مەعریفییەکەشەوە تیۆریزەکردنی چەمك و پێدراوەکان بە سەقەتی وێنا دەکات، یەکێك لەو بابەتانە ڕوانینە بۆ مەسەلەی دین و دەوڵەت و پیرۆزی و بەها مرۆییەکان.

کورد لە مێژە دەوڵەت و جوگرافیا و سنورو خاکی دەستنیشانکراوی سەربەخۆی خۆی نییە وەکو گەلانی دی، ئیدی ڕەهەندەکانی ئەم نەبوونە پێوەندی بە خۆیەوە هەبێت یان نەیارانی نەیانخواستووە بەو مرادە بگات! بەدبەختیەکەش لەوەدایە کە تێکڕای پێوەندی و ئاڵوگۆڕەکانی لەگەڵ دەوروبەر مەسەلەی ئایین ڕۆڵی ئەکتیڤی تیا بینیوە بە تایبەتی ئایینی ئیسلام، چونکە هەموو دەسەلاتە سەردەست و فەرمانڕانەکان مۆرکی دین و نەخشی پیرۆزییان پێوە دیار بووەو زۆر جار بەناوی دین و هەندێ کاتیش بەناوی دەسەلاتی چینایەتییەوە چەوسێنراونەتەوە، بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا زێڕینترین سەردەم و گەشترین قۆناغی مێژوویی کە دەسەلاتی ناوچەیی کوردی لە شێوەی میرنشین و حوکمی خۆبەڕێوەبەریدا لە سنووری جوگرافیای خۆیدا بوویەتی سەردەمی دەسەلاتدارێتی ئیسلام بووە.

ئالێرەوە کورد کێشەیەکی نەبووە بەناوی کێشەی ئایینی و چەوساندنەوەی ئایینی و ستەمی دینییەوە، هەموو لاپەڕەکانی مێژووی تەی بکەی ڕۆژێك لە ڕۆژان یەکێك لەو کورتە دەسەلاتانە لە نێو نەبراوە بەناوی ئەوەوە کە دەبێت بە زەبری شمشێر یان بەناچاری تەسلیم بە ئیرادەی دەسەلاتی سیاسیی ئیسلام یان هەر دەسەلاتێکی دی ببن ، ڕەهەندی نەتەوەو نەتەوایەتیش یان ئامادەگی بوونی هەر جۆرێك لە فیکری ناسیۆنالیستانە و هەستی نیشتمان پەروەرییانە پەیوەست بووە بە قۆناغ و بارودۆخی سەردەمە مێژووییەکانیەوە کە خودی خۆیان نەیانتوانیوە دەستبەرداری ڕەهەندە فیکریی و بۆچوونە گشتییەکانیان بن، کەواتە پێوەرەکان بۆ کات و سەردەمەکان دەگۆڕدرێن و جیهانبینی و خوێندنەوەی تایبەتی هەڵدەگرن، گرفتی ناسیۆنالیست و عەلمانییەکانی ئێمە لەوەدایە بە پێوەرەکانی ئەمڕۆ لە ڕابردوو دەڕوانن، بێئاگان لەوەی کە هێندەی تیۆریزەکردنی مێژوویی

کورد لـە سـەردەمانی تایبەتیـدا کەشـێکی ڕەخـساو بەرجەسـتە دەکـات هێنـدەی گەڕانەوەو ئیشکردن لە سەر ئەرشـیفدۆزی مێـژوویی سـادەیی و سـاویلکەیی ئەوانـە نیشان دەدات، چونکە پێداگیری لە سەر بۆچوونێکی لەو شـێوەیە هێنـدەی بـەرەو پـاش گەڕانـەوەو خولانـەوەی تیایـە نیـو هێنـدە نامانگەیەنێتـە ئـەوەی کـە پێـی دەوترێ گۆڕانی ڕەوڕەوەی مێژوویی و بەرەو پێشڤە چوون.

چوار ساڵی خوێندنی زانکۆ لەبەشی مێژووی زانکۆی سلێمانی گـیرۆدەی ئـەوەبووین کە کۆمەڵێك نەخوێندەوارو نەشارەزاو تێنەگەیشتوو نە لە مێژووی سیاسـیی کـوردو نە لە ئیسلام لە مامۆستاو دکتۆری بێبـەهرەو هەنـدێ خوێنـدکاری نـەزان قـسەیان لەسـەر دیـن و ئیـسلام و تاوانبـارکردنی بـە لاوازی هەسـتی نەتەوایـەتی و ڕووح کێشانی کورد دەکرد سەبارەت بە خەمی نەتـەوەیی، لـەو چـوار سـاڵەدا بـەردەوام ڕاپـۆرت و نووسـینی بێنـاوەرۆك و نقڵکـراو لـە هەنـدێ سەرچـاوەوە ڕاسـتەوخۆ لـە لایـەن هەنـدێ لـە مامۆسـتا ئایدۆلۆژیـستە سیاسـییە ئاراسـتەکراوەکانەوە بـە ئەدەبیاتی حزب بە خوێندکاران دەنووسرا و ناوەرۆکەکەی بۆنی دژایەتی ئیـسلامی لێ ئـەهات وئیـسلام و سیاسـەتی ئیـسلامییان بـە تێکـەڵی وێنـا دەکـردو نـەبوونی فاکتەری دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی لـە سەرئیـسلام دەکرێتـە مـاڵ، لەگـەڵ هـەموو ئەمانـەدا کـاتێ بـاس لـە دیرۆکـی سیاسـیی کـورد دەکـرا نەئـەتوانرا ڕۆڵـی پیـاوانی دیـنی و فـەرمانڕەوایانی ئیـسلامیی لـە باسـەکاندا نـەکرێت بـە حـوکمی وابەستەبوونی هاوژیانی و دراوسێیەتی و هاوئایینی و شـتی دی، لـەم دیدگایـەوە بـە پێشکەشکردنی داوایەك لە پرۆژەی (تیـشك) هـەوڵی هێنانـە دی ئـەو خەونەمـدا لـە ڕێگـای گفتووگۆی لیکۆڵینـەوەوە لەگـەڵ کۆمـەڵێك مامۆسـتاو کەسـایەتی پـسپۆڕو شـارەزا لـە مـەڕ ئـەم بابەتـە تـا لـە چوارچـێوەی کتێبێکـی ئامـادەکراودا بیخەینـە کتێبخانەی کوردییەوە.

**ئارام عەلی سەعید**

**سلێمانی**

**١١ی ئەیلوولی ٢٠٠٨ی زایینی**

**١٢ی ڕەمەزانی ١٤٢٩ی کۆچی**

# نووسەرو لێکۆڵەر، مەسعود عەبدولخالق



لە کوردستانیش هەروەك چۆن لایەنە عەلمانیەکان دەیانەوێت بە ئامرازی سۆشیالیستی و شیوعی و لیبرالی دەوڵەتێك بۆ کورد دروست بکەن، ئاواش لایەنە ئیسلامییەکان دەیانەوێ بە ئامرازی ئایینیانە دەوڵەتێکی کوردستانی دروست بکەن.

- ساڵی ١٩٥٧ له بناری قەرەچووغ له دایك بووه
- قۆناغەكانی خوێندنی له هەولێر تەواو كردووه
- ١٩٨٠ ـ ١٩٨١ زانكۆی سلێمانی تەواو كردووه
- لەدوای دەرچونی لەزانكۆ چووەته ڕیزی شۆڕشی نوێ
- ساڵی ٢٠٠٦ بڕوانامەی ماجستێری له بواری فەلسەفەی زانسته سیاسییەكان له زانكۆی جیهانی بەریتانی وەرگرتووه
- ئێستا خاوەنی ئیمتیازی دەزگای ڕاگەیاندنی (ستاندەر)ه

## سایكۆلۆژیەتی پرسیارەكانی ئامادەكار:

ئەوەی دەمەوێ تۆماری بكەم پێش وەڵامی پرسیارەكان ئەوەیه ئەو كۆمەڵه پرسیاره له سۆنگەو دەروونێك هەڵقوڵاوه كەبەشی هەره زۆری مێژووەكەی به هەڵه نووسراوەتەوه، ئەو پرسیارانەش كاریگەری واقعی ئەو هەڵانەی به خەستی پێوه دیاره.

بەو تەرازووه چەوتەش دەیانەوێ مێژوو هەڵسەنگێنن، له ڕاستیدا داگیرو دابەشی كوردستان له سەرەتای سەدەی بیستەم و بەردەوامی ئەو مەینەتیه عەیاری ئەقلی كوردی تێكداوه، ناكەوێته سەر ستاندەر، شكست و بێ ئومێدی له كرۆمۆسۆمەكانی تاكی كورد گیربووه، ئەوەش ڕەنگیداوەتەوه سەر كاری كۆمەڵایەتی و سیاسیی و فیكری و هونەری و فەرهەنگی و.. هتد.

بۆیه كاتێ پرسیاریش ئاڕاسته دەكرا به زەقی ئەو دەردەی پێوه دیاره، له سۆنگەی شكستەوه ئەو پرسیارانەی لا دروست دەبێ بۆ واقعی ئێستا ومێژووش، ئەو دەرده ناگەڕێتەوه بۆ(پڕۆژەی تیشك)، بەڵكو ئەو دەرده لەسیستمی ئایدیۆلۆژیای كوردو پڕۆگرامی خوێندنوسیستەمی سیاسی وفكری به ڕوونی دەردەكەوێ، هەر به نموونه له پرسیارێكدا هاتووه: مێژووی دوورو درێژی كورد

وابووه سەركردەو دەسەڵاتداری میرنشین و شۆڕش و ڕاپەڕینەكان كەسانی ئاینی بووینه، ئایا بۆچی نەیانتوانیوه بیر له پرۆژەی قەوارەیەك بۆ كورد بكەنەوە؟ ئەو پرسیاره لەو (بەناو) ڕێسا مێژووییەوه دێت كه له پرۆگرامی خوێندن و مێژوونووسانی كورد وا هاتووه گوایه: كورد هەزاران ساڵه دەچەوسێتەوە، ئەوه لەلایەك، لەلایەكی تر گوایه سەركردەی ئایینی میللەتانی تر خەمیان له قەوارەیەكی سیاسیی نەتەوەیی خواردووەو كوردیش نەیخواردووه بۆیه له سەدەی بیستەم كورد نەگەیشت به دەوڵەت، نازانن ئەو خەمه له ئەوروپا له سەدەی (١٩) دەستی پێكردووەو له ڕۆژهەڵاتیش له سەدەی (٢٠)، لەگەڵ زۆر هەلوەستەی تر، تەقەلا دەدەین لەگەڵ وەلامی پرسیارەكان هەڵوەسته لەسەر لایەنی سایكۆلۆژییەتی پرسیارەكانیش بكەین.

**+ دەوڵەتداری چییه؟ پێناسێكی گشتی یاسایی هەیه چوارچێوەكانی دەوڵەت دەستنیشان بكات؟ فەلسەفەكەی چییه؟**

مەسعود عەبدولخالق: پێناسی دەوڵەت بریتییه له (دیاردەیەكی سیاسیی و یاسایی، دەزگای هەره باڵایه بۆ ڕێكخستنی ژیانی تاك و كۆ) بڕوانه: قانون الدولی العام، هەروەها د. وهبة الزحيلي، ص٦٣٠٤.

فەلسەفەی دەوڵەت :

وەك ڕوونه خێزانوتاك پێویستی به كەرەستەی گشتی و تایبەت هەیه، تایبەتیەكان دەكەوێته چوارچێوەی موڵكیەتی تایبەتی، بەڵام گشتیەكەی بێ خاوەنه، ئەگەر دەزگایەكی باڵا نەبێ پارێزگاری له ماف و سامان و كەرەستەی گشتی نەكا ئەوا كەس و كۆمەڵه بەتواناكان هەڕەشه دەخەنه سەر موڵكی گشتی، جا چ به پاوانكردنی چ به تێكدانی بێ یان نا! بۆیه دەزگایەكی باڵای وەك دەوڵەت پێویست دەكا، بەتایبەتی له سەردەمی گەشەی كۆمەڵگه خەڵكی پێویستی به یەكتر و به موڵكیەتی گشتی زۆر زیاتر بووه. بۆیه بوونی دەوڵەت زۆر خەستتر دەبێ، لەگەڵ زۆر لای تری ئیجابی دەوڵەت كەوا جێگرەوەی نەبێ، بەڵام هەندێ سەلبیاتیشی هەیه، لەوانه دەبێته هێزێك له دەست دەسەڵاتداران بۆ زاڵبوون، لەو ڕووەوه بەشێك له فەیلەسوف و زانایان پێیانوایه دەوڵەت زیاتر سەلبیه، وەك

ئایینی تاوی و زۆر مەدرەسەی تریش، لە هەمووان توندتر مەدرەسەی مارکسییەتە پێیوایە دەوڵەت دەزگایەکە بۆ چەوساندنەوەی چینی زەحمەتکێشان، بۆیە بڕیاریداوە لە کۆمەڵگەی شیوعیەت دەوڵەت پێویستی نەمێنێ، هەروەك لە سەرەتای کۆمەڵگەش نەبووە، هەڵبەتە بەڕای مارکسییەت هەرچی سیستمی سەرمایەدارییە پێی وایە دەوڵەت پێویستە، بەڵام شەرعیەت دەداتە چینایەتی و بنەمای (دەست تێوەرنەدانی دەوڵەت لە کاروباری بازاڕ)، ئەوەش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەمەندی زۆر دەوڵەمەندو هەژاری زۆر هەژار لە چوارچێوەی دەوڵەتەکەو لە جیهانیش، هەرچی سیستمی سیاسیی ئیسلامییە دەوڵەت بەپێویستی و سپاردە دەزانێ و دامەزراندنی دەوڵەتی دادپەروەر بەشێکە لە بڕوا.

بەو شێوەیە لە قوڵایی مێژوو دەسەڵاتی باڵا لەشێوەی ئیمپراتۆریەت، شاهەنشاهی، خیلافەت، حکومەت، میرنشین، سەریهەڵداوە.

لەکۆنەوە کە کۆمەڵگە پەرش و بڵاو بوو، بۆ هەر شارێك دەوڵەتێکی پێویست بوو کە لە ئەدەبیاتی یۆنانی بە (دەوڵەتی شار) ناودەبرا، لە کتێبی (کۆماری ئەفلاتۆن) و (ریسالە سیاسیە ـ ئەرستۆ) بەدرێژی باس لەوە دەکات شانبەشانی دەوڵەت و حکومەتی بچووك دیسان بەپێی فەلسەفەو هاریکاری مرۆڤایەتی دەزگایەکی باڵای سەرووی دەوڵەت و حکومەت لەسەر ئاستی جیهانی پێویستە بۆ پاراستنی ئاشتی و بەرژەوەندی باڵای بەشەرییەت لە پارێزگاری ژینگەو رووبەڕووبوونەوەی کارەساتە سروشتی و کۆمەڵایەتی و تەندروستییەکان و لەگەڵ زۆر ئەرکی تر، جا ئەو دەزگایە نەبوو، بۆیە ئیمپراتۆرەکان ئەو بانگێشەیان دەکرد، بەڵام لەم سەردەمە ئەو دەزگایە خۆی لە (نەتەوە یەکگرتووەکان) دەدۆزێتەوە.

**+ ئەو بنەما یاساییانە کامانەن کە هەبوونی دەوڵەت دەست نیشان دەکەن ؟**

مەسعود عەبدولخالق: بنەما یاساییەکانی دەوڵەت: بنەمای یاسایی لە پێویستی سیاسیی دێت، پێناس و ئەرکی یاسایی دەوڵەت جیایە لەگەڵ سیاسیی، ئەرکی یاساییەکەی بریتیە لە نوێنەرایەتیکردنی میللەتەکەی، واتە شەخسیەتێکی یاسایی

حسابە، بۆیە (موسوعە علم الاجتماع) پێناسی یاسایی دەوڵەت بەو شێوەیە دەكات:

(دەوڵەت بریتییە لە یاسا و یاساش دەوڵەتە)، كەواتە دەوڵەتی هاوچەرخ هەم پارێزەری یاساییە بۆ ناوەخۆ و پابەندیشە بە یاسای نێودەوڵەتی بۆ دەرەوە.

ئەزموونی دەوڵەتی یاسایی (یاخود دەوڵەتی مەدەنی، یان دەوڵەتی هاوچەرخ) دەگەڕێتەوە بۆ دوای رێكەوتنی ویستڤالیا (١٦٤٨ز)، لەگەڵ گەشەی بیری نەتەوەیی و وەرچەرخانی كشتوكاڵ بۆ پیشەسازی و دەرەبەگایەتی بۆ بۆرجوازی ئیمپراتۆریش بۆ دەوڵەت گۆڕا، یەكەم جار دەوڵەتانی( بەریتانیا، فەڕەنسا، هۆڵەندا، ئیسپانیا) دروست بوون، بەپێی پێوانەی سەردەم لە سنور و هەرێم و میللەتێكی دیاریكراو و مەسەلەی سەروەری و پابەندی بە رێكەوتننامەی نێودەوڵەتی و هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی یاسایی وەك (شەخسیەتی یاسایی)، لەدواییدا بەرەبەرە دەوڵەتەكانی تریش لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی هاوچەرخانە دروست بوون، لە هەموویان كاریگەرتر دروستبوونی دەوڵەتی ئەڵمانیا لە (١٨٧١ز) لەسەر دەستی (بسمارك)، تا سەدەی بیستەم هیچ بستە خاكێك لەسەر زەوی نەما بێ خاوەن و سەروەری، لە دەوڵەتی هاوچەرخ سنوری هەر وڵاتێك بە سنوری وڵاتە دراوسێكەی كۆتایی دێت، ئەو دەوڵەتە لەوسنورەی خۆی بەرپرسیارە، بەپێچەوانەی سەردەمی ئیمپراتۆریەكان سنور بریتی بوو لەو تیلمەخاكەی لەژێر پۆستاڵی دوا سەربازی جەنگاوەریدا بوو.

دەوڵەتی هاوچەرخ بەو رێگەو ئامرازانە دروست بوون:

١- میراتی ئیمپراتۆریەتێك بووە وەك توركیا، روسیا، ئێران ...تاد.

٢- لەرێی دۆزینەوەو ئاوەدانكردنەوە، وەك وڵاتانی هەردوو كیشوەری ئەمریكا و ئوستراليا.

٣- لەرێی شۆڕشی رزگاری وەك ئەمریكا و جەزائیر و وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقای... تاد.

٤- لەرێگای یاسایی وەك لیبیا و كەنەدا.. تاد.

٥- لەرێگای ئینتیداب، وەك عێراق سوریا.. هتد.

مەرج و كۆڵەكە یاساییەكانی دەوڵەتی هاوچەرخ:

بەپێی یاسای نێودەوڵەتی هەر وڵاتێك ئەو سێ كۆڵەكەو توخمە یاساییانەی خوارەوەی لێ سازابێت، ئەوا شایستەی بوون بە دەوڵەتیان هەیە: (هەرێم، گەل، دەسەڵاتی سیاسیی)

هەندێ شارەزای یاسایی (دان پێهێنانی نێودەوڵەتی - الاعتراف الدولي)بە كۆڵەكەی چوارەم پۆلێن دەكەن.

هەرچەندە دەوڵەت لە فەلسەفەی ئیسلام و عەلمانی هاوچەرخ لێك جیایە لەرووی سەرهەڵدان و ئەرك و ئامانجدا، بەڵام ئیسلامیش لەو سێ كۆڵەكەیە لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتی هاوچەرخ یەك دەگرێتەوە، بەجۆرێك كە دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ هەرێمەكەی (مەدینە) و دەوروبەر بوو، گەلەكەی (ئەنسار و موهاجیر) و خەڵكی تری مەدینە بوون، دەسەڵاتی سیاسیی و یاساكانیشی شەریعەت بوو، پابەندیش بوو بە رێكەوتننامەو نەریتە گشتییەكان، هەندێ زانای ئیسلامیی مەرجی پێنجەمیشی هەیە بۆ بوون بە دەوڵەت و دەڵێ (بەیعەت)یش كۆڵەكەیەكە، هەروەك دەوڵەتی مەدینە دوای دوو بەیعەت ئینجا دروست بوو، مەبەستیان لێی دەوڵەت لە ئیسلامدا مەدەنیەو لەسەر بنچینەی پەیماننامەی كۆمەڵایەتی دروست دەبێ، سیۆكراتی نییە، لە سیستمی عەلمانیدا هەرێم بریتییە لە نیشتمانی نەتەوەیەك و گەلەكەشی نەتەوەكەو دەسەڵاتی سیاسیی و دەوڵەتەكەشی لەسەر ئەو بنچینە دروست دەبێ، كەواتە لەناوەرۆكدا لەگەڵ روانگەی ئیسلام لێكجیان بەجۆرێك نیشتمان لە ئیسلامدا (دار الاسلام)ە و نەتەوەش لە ئیسلام (أمة)یەو دەسەڵاتەكەشی (شەریعەتە)، یەكەمجار ئەو مەرجە یاساییانەی نێو دەوڵەتی بۆ دروستبوونی دەوڵەت لە (١٩٢٩ز) پەیڕەوكرا.

رواڵەتە یاساییەكانی دەوڵەتی هاوچەرخ:

دەوڵەتی هاوچەرخ خاوەنی ئەم نیشانانەی خوارەوەیە:

١- سنورێکی دیاریکراوی هەیە .

٢- سەروەری هەیە .

٣- دەستورێکی هەیە .

٤- هەمیشە دەسەڵاتەکانی قەزایی و جێبەجێکردن و یاسادانانی لێك جیاکراوەتەوە.

٥- هەڵبژاردن و ئازادی دیموکراسی و موعارەزەی یاسایی و دەستگۆڕی دەسەڵاتی تێدایە.

٦- حکومەت و دەوڵەت لێك جیان، دەوڵەت شەخسیەتی یاسایی دەنوێنێت و بەرپرسە لەو هەرێمە (کە بە سنورە نێودەوڵەتیەکە دیاریکراوە)و ئەو میللەتەی لەسەری دەژی، نەك حکومەت .

٧- ئەندامیشە لە نەتەوە یەکگرتووەکان.

لەدوای یەکەم ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامیی (١٩٧٩ز) کە کۆماری ئیسلامیی ئێران هاتە پێش هەموو ئەو رواڵەتانەی سەرەوە ی لێهاتووەتە دی.

**+ ئایا دەوڵەت تەنها لەسەر بنچینەی نەتەوە بنیات دەنرێ، یاخود کۆمەڵێك ئامانجی هاوبەش هەیە لە نێوان هەندێك نەتەوەی جیاواز بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی یەکگرتووی سەربەخۆ؟**

مەسعود عەبدولخالق: کاتی خۆی دەوڵەت بریتی بوو لە دەسەڵاتی ئیمپراتۆرەکان، بەڵام دوای ئەوەی سیستمی ئیمپراتۆری گۆڕا بۆ دەوڵەتی هاوچەرخ کە لە سەدەی (١٨) دەست پێدەکات و دوا چوار ئیمپراتۆریەکانی (نەمسا و ئەڵمانیا و عوسمانی و روسیا) لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨ز) گۆڕان بۆ دەوڵەتی کۆماری هاوچەرخ، لە سەرەتادا کاریگەرییە نەتەوەییەکانی بوونە بنەمای دروستبوونی دەوڵەتی هاوچەرخ، هەریەکە لە جێگرتنەوەی سیستمی عەلمانی لەجیاتی دەسەڵاتی کەنیسە و پیشەسازی لەجیاتی کشتوکاڵی و شار لە جیاتی لادێ و بۆرجوازی لەجیاتی دەرەبەگ و یاسا لەجیاتی ئایین (مەبەست ئایینی مەسیحییە) .

هەموو ئەوانە فاكتەری گرنگ بوون بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتی هاوچەرخ، هەموو ئەوانەش سەرەتاكەیان دەگەڕێتەوە بۆ رێكەوتنی ویستڤالیا (١٦٤٨ز)، بەو شێوەیە تا سەرەتای سەدەی بیستەم سەرتاسەری جیهان بووە دەوڵەتی نەتەوەیی و نیشتمانی–عەلمانی. بەڵام هەر دەوڵەتێك بە دەروازەیەك لەوانە دروست بووە، هەر بەنموونە لە ئەڵمانیا لەسەر بنچینەی نەتەوەیی، لە ئیتاڵیا لەسەر بنچینەی مێژووی هاوبەش، لە فەڕەنسا لەسەر بنچینە نیشتمانی (پاتریۆتی)، لە روسیا لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی ماددی هاوبەش.

## دەوڵەتی نیشتمانی و دەوڵەتی نەتەوەیی:

ئەو دوو چەمكە لێكجیان، دەوڵەتی نەتەوەیی (وەك موسوعة العربیة العالمیة G-B-Encyclopedia) پێناسی كردووە، بریتییە لە جووتبوونی سنوری دەوڵەت بە سنوری نەتەوە، لێرەدا پەیوەندی خەڵك بریتییە لە هاونەتەوەیی (Nationalism)، نموونەش وەك دەوڵەتی عەرەبی سعودی، سۆماڵ، بەڵام دەوڵەتی نیشتمانی ئەوەیە لە چوارچێوەی وڵاتەكە خەڵكی تری رەگەزی و ئایینی جیا لە نەتەوە سەرەكییەكە هەبێ، پەیوەندی خەڵكی لەجیاتی هاونەتەوەیی دەبێتە هاووڵاتی (هاونیشتمانی) و واش لە دەستور تۆمار دەكرێ. واتە لەسەر بنچینەی (Patriotic)ی. بەرای من یەكەم جیاوازی نێوان ئەو دوو چەمكە لە شۆڕشی رزگاری ئەمریكی ساڵی (١٧٧٦ز) هاتووە، چونكە لەگەڵ ئینگلیز یەك رەگەز و نەتەوە بوون، كەچی لە نیشتمان لێك جیابوون و نیشتمانیەكەش لەوێ زاڵبوو بەسەر نەتەوەییەكەو ئەو شۆڕشەی لێهاتەدی و یەكەم دەوڵەتی نیشتمانی هاوچەرخ لەوێ دروست بوو بە سەرۆكایەتی (جۆرج واشنتۆن)، بەرەبەرە جیهانی شارستانی رووی لەو جۆرە دەوڵەتە كرد بەتایبەتی لەدوای شكستی دەوڵەتی نازی ئەڵمانی و فاشی ئیتالی و ڤالانژیسی ئیسپانی كە زادەی دەوڵەتی نەتەوەیی بوون، لەژێر سایەی چەمكی دەستووری هاووڵاتی كێشە نەتەوەیی و ئیتنیەكان تاراددەیەكی چاك چارەسەر بووە، جگە لە كێشەی ئێرلەنداو باسك و كورسیكا.

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە رۆژنامەیەكی وەك (لاند ئۆگ فۆلك)ی حزبی شیوعی دانیمارك گوزارش لەو وەرچەرخانە دەكا، ئەو ناوە بەمانای نەتەوەو

نیشتمان دێت، لە ولاَتانی رۆژهەلاَتی ناوەڕاست هێشتا دەولّەتەکان لەسەر بنچینەی نەتەوەیین، واتە دەولّەتی نیشتمانی نین، (ئەگەرچی واش بانگێشە دەکرێ)، بۆیە کێشەی نەتەوەیی و ئیسنی و تایفی زۆری لێ سەرهەلّدەدا، لە دەستوری تورکیا (Ana Yasa) لە ماددەکانی ٦٣-٦٨ باس لەو جۆرە ئینتیمایە دەکاو تەنها باسی تورك دەکا بێ ئەوەی بۆ جارێکیش باسی کوردو عەرەب وچەرکەسی تیابێ، لەسەر ئەو بنچینەیەش ناوی (تورکیا) هاتووە، لەکاتێکدا لە دەستوری ئێرانی ئەو جۆرە داکۆکیە لەسەر رەگەزی فارس ناکاتەوەو بە تەواوی مانا دەولّەتی نیشتمانیە لەگەلّ جیاوازی (تایفیەکەی)، ئەگینا ئوستانێکی بەناوی کوردستانە و بەناوی بلوج و.. هتد.

لەژێر سایەی تەواوی دەولّەتی نیشتمانی مافی کەمە نەتەوەو ئیسنی چارەسەر دەبێ، کە تیایدا هەموو لایەك لە بەرژەوەندی بالاَی ئەو ولاَتە هاوبەش دەبن، بەلاَم کێشەی نەتەوەی فراوانی پێ چارەسەر نابێ، بۆیە بیرۆکەی (تەوافوق) و دەولّەتی فیدرالّی و دواییەکەشی (مافی چارەی خۆنووس) هاتە کایەوە.

**+ ئایا ئایین یان ئایدیۆلۆژیا لەمپەرە لەرێگای دروستبوونی دەولّەتی سەربەخۆ بۆ گەلان و نەتەوەی جیاواز لە سەر خاکێکی دیاریکراو؟**

مەسعود عەبدولخالق: ئەمە یەکێکە لە پرسیارە (شلۆقەکان)کە بەپێی گوتاری چەوتی ئێستای کوردستان دروست بووە، ئەگینا لەمێژوودا ئایین یەکێ بووە لە دەروازەکانی دروستبوونی دەولّەت، کوردن چایلد دەلّێ:(تا٣٠٠٠پ ز هەر دەزگایەکی سیاسی یان دەولەتی هەبووبێ هەر ئاینی بووە) ،کەواتە یەکەم دەسەلاَت و دەولّەت لەسەر ئەم زەمینە لە ئایینەوە هاتووە، تەنانەت بەشی هەرە زۆری شارستانیە کۆنەکانیش یان راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بەرهەمی پێغەمبەرێکن یان درێژکراوەی ئەوەن، تەنانەت مەدرەسەی یۆنانی و ئیمپراتۆریەتی رۆمیش لەو رێسایە بەدەر نین، هەریەکە لە فیساگۆرس و ئەنگلامیدس تەلەبەی حەزرەتی سلێمان و سالّح بوونە (بڕوانە: الملل والنحل)، هەروەها دامەزرێنەری رۆمیش دەگەڕێتەوە بۆ (رۆمیۆ بن عیسۆ بن ئیسحاق نەبی)، (بڕوانە: الصحاح)، ئیتر ئەو دەولّەتانەی هەبوونە لەمێژوو بەشی زۆری

وابووە، بەتایبەتی لە ناوچەكانی خۆمان هەر لە (راشدین، ئومەوی، عەباسی، ئەیوبی، عوسمانی، سەفەوی) تا دەگاتە میرنشین و دەوڵەتە كوردیەكانی خۆشمان، قوتبوونەوەی ئەو پرسیارە لەوە دێت كە واهات كۆتایی دەسەڵاتی كەنیسە لە ئەوروپا بووە سەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن، بەڵام هەر لەدوای ماوەیەك جارێكی تریش وڵاتانی ئەوروپا (جگە لە فەڕەنسا) لە دەستور ماددەی تایبەتیان سەبارەت بە كارایی رۆڵی ئایین تۆماركردەوە هەر بە نموونە: لە ماددە (١) و (٤٧)ی دەستوری یۆنان، ماددەی (١) و (٢)ی دەستوری دانیمارك، ماددەی (١٢)ی نەرویج، ماددەی (٤)ی سوید، بەو شێوەیە(بڕوانە: مەوسوعەی جودی )

لە قۆناغی نوێشدا شۆڕشەكانی ئایینی وەك: خەتابی لە مەغریب، شێخ عەبدولقادر لە جەزائر، عومەر موختار لە لیبیا، مەهدی لە سودان، .... تا دەگاتە شۆڕشی بیستی عێراق و (١٩١٩ز)ی شێخ مەحموود و (١٩٢٥ز)ی شێخ سەعید و (١٩٢٧ز)ی ئیحسان پاشا و (١٩٤٦)ی قازی موحەممەد و (١٩٦١ز)ی مەلا مستەفا، .. هەمووی تەقەلای دروستكردنی دەوڵەتێكی هاوچەرخ بوون لە ڕێی ئایینی، هەر بە شۆڕشی ئایینی شاهەنشاهیەتی ئێران گۆڕا بۆ دەوڵەتی هاوچەرخ لە (١٩٧٩ز)، تەنانەت ئاینی وەك یەهودیش دەولەتی پێ لەعەلمانیەت چاكتردروست دەكرێ ئەوەتا دەولەتی ئیسرائیل ئاینیە ، ئێستاش تەقەلای بزووتنەوە رزگاریخوازەكانی وەك كشمیر، چیچان، خوارووی فلیپین، فەلەستین، بزووتنەوەی سەركردەی ئاینین دەیانەوێت دەوڵەتی مۆدێرن دروست بكەن، لە كوردستانیش هەروەك چۆن لایەنە عەلمانیەكان دەیانەوێت بە ئامرازی سۆشیالیستی و شیوعی لیبرالی دەوڵەتێك بۆ كوردستان دروست بكەن، ئاواش لایەنە ئیسلامییەكان دەیانەوێ بە ئامرازی ئایینیانە دەوڵەتێكی كوردستانی دروست بكەن.. ئیتر بۆچی ئایین رێگرە لە دروستكردنی دەوڵەتی هاوچەرخ، كوا نموونەیەكی پێچەوانە نییە! رەنگە لەرووی فیقهیەوە كێشە هەبێ وەك لە پێشوو باسمان كرد، هەرێم لە ئیسلامدا (دار الاسلام)ە و گەلیش (ئوممەتە).. لەوەوە خیلافەت دروست دەبێ، ئەوەش بەلایەنی كەمەوە جارێ بوونی نییە، بۆیە بەپێی

دیفاکتۆ هەریەکە وڵاتێك بۆخۆی دروست دەکا و وا دروستیش کراوە، ئیتر بۆ کوردیش نەك حەرامە یان حەڵاڵ، بەڵکو پێویستە دەوڵەتێکی تایبەتی بۆ خۆی دروست بکا بە هەموو پێوەرێکی یاسایی و شەرعی رێپێدراوە.

**+ هەر سەبارەت بەو وەڵامە بەشێك پێیانوایە حوکمی ئیسلامی لەماوەی چواردە سەدەدا شتێکی وای پێشکەش بە کۆمەڵگە نەکردووە، بەڵام دەولەتی مۆدیرن بەو ماوە کورتەی شتی زۆری پێشکەش کردووە؟هەر بۆیەش دەڵێن کێشەی کورد ئەگەر بەئایین چارەسەر بکرابایە هەر لەئەسلدا سەری هەڵنەدەدا؟**

مەسعودعەبدەلخاق: سەبارەت بە برگەی یەکەم وەڵامێکی دوورو درێژی دەویٚ بەڵام هەر بەو پرسیارە کۆتایی دێنین ئاخۆ کام لە بەندەکانی یاسای نێو دەولەتی ئیجابی ڕەگێکی ناچێتەوە سەر ئەزموونی ئەو ١٤ سەدەیە ،زیاتر لەوەش هەموو بنەما مافە مرۆیی وحقوقیەکان لە سەر بنچینەی ئاینی ئیسلام وا دەخەملٚن ،سەبارەت بە برگەی دوەمیش زۆر ڕوونە ئەوەی پرسیارەکە دەکاو ئەوەی ڕاشی وایە لەبنەچەی کێشەی نەتەوەیی نەگەیشتووە،ئەگینا زۆر ڕوونە تا خەلافەتی عوسمانی مابوو(ئەگەر بەناویش بێت)ئەو کێشەیە سەری هەڵنەدا واتە بەرهەمی ئەو نییە وەك لەپێشووتریش باسمان کرد زادەی سەردەمی عەلمانیەتە بۆیەش دەبیٚ دلٚنیا بین کە بە عەلمانیەت چارەسەر نابیٚ.

**+ پرسیارێکی تریش هەیە دەڵێن: ئاینی ئیسلام ڕۆلی نەبینیوە لەیەکخستنەوەی میللەتی کورد هەروەك ئیستاش ئەو ڕۆڵەی پیٚ نابینریٚ؟**

مەسعود عەبدولخالق :هیچ گومانی تیانییە ئەو پرسیارە پێچەوانەیە ،چ لە مێژوو چ لە ئێستا تەنها بە ئایین میللەت یەکدەخریٚ،ئەگینا بە عەلمانیەت هەر پەرتەوازەو شەڕی براکوژی و دەست ڕاکێشانی هێزی بێگانە بووە بۆ سەر وڵاتی خۆ،لە (شەرەفنامە) قسەیەکی زۆر گرنگ و سادە دەبینی دەلٚیٚ:کورد تەنها لە کەلیمەی شەهادە یەك دەبوون ،مانای چییە ئەوە؟مانای وایە ئەگەر بە بەهای عەشایەری و دەڤەری و کوردانەو هەرچی بایە هەر ئیختیلاف و برا کوژی بووە تەنها بەناوی ئایین یەکدەخران، کەم تر گرنگی بە قسەیەی شەرەفنامە دراوە هەق وابوو نامەیەکی دکتۆرای لیٚ بێتەوە،ئێستاش هەروایە، ئەوەی گورز لەو یاسایە

دەدا ئەوەیە كە دەبینین لایەنە ئیسلامییەكانی كوردستان یەك نین و زیاتر پاساو بەوگۆتانە دەدا.

**+ تاچەند كورد شتێكی هەبووە بەناوی (كێشەی نەتەوایەتی) لە مێژوودا؟ یاخود ئەو مەسەلەیە لەم دواییەدا سەریهەڵداوە ؟**

مەسعودعەبدولخالق: نەك كورد هیچ میللەتێك لەم جیهانە لەپێش سەدەی (١٨) كێشەیەكی بەناوی نەتەوەیی نەبووە، كێشەی چینایەتی و عەشایری و سیاسیی و كۆمەڵایەتی و ئایینی هەبووە، بەڵام كێشەی نەتەوەیی نەبووە، لەبەر هۆیەكی سادە، ئەویش ئەوەیە سەردەمی ئینتیمای نەتەوەیی نەبووە، یەكەم جار لە ئەوروپا سەریهەڵداو ئینجا لەكۆتایی سەدەی (١٩) بۆ سەرەتای بیستەمیش چەمكی نەتەوەو نەتەوایەتی وئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی هاتە جیهانی ئیسلامیی، بەهەمان شێوەش كورد كێشەی جیاجیای هەبووە، جاری وابوو زوڵمی لەسەر بووە و چەوساوەتەوە، جاری واشبووە ئەوخەڵكی چەوساندۆتەوە،یان خۆی چەوساندۆتەوە، بەڵام بەهیچ رووكارێك چەوساندنەوەی نەتەوەیی نەبووە، دەسەڵاتەكانی ئیمپراتۆر و سەڵتەنەت و میرنشین، هیچی بەناوی نەتەوەی سەردەست نەبوو تا چەوساندنەوەی نەتەوەیی و كێشەی نەتەوەیی لێ بێتە دی، ئەوە لەناو عەرەب و تورك و ئەوانیتریش نەبووە هەروەك پێشتر باسمانكرد، ئەوەی ئێستا هەندێ بۆچوون و سەرچاوە دەبینرێ گوایە رەگی (عروبە) دەگەڕێنرێتەوە بۆ زەمانی ئاشوری و بابلی، یاخود بۆ سەردەمی پێغەمبەر(دخ) یان زیاتر لە هەمووان بۆ سەردەمی ئومەوی دەگێڕنەوە، هەموو ئەو تەقەلایانە بەرهەمی دوای سەدەی بیستەو لە ئەنجامی (مراجعة كتابة التأريخ) نووسراونەوە، هەروەك ئەو موراجەعەی (ئیتیحادو تەرەقی) و تەیاری تۆرانی دەسەڵاتدار لەناو عوسمانی لەسەرەتای سەدەی بیست كردی، ئەگینا كوا لە مێژوودا لەپێش (جۆرج ئەنتۆنیۆس) كە كتێبی (یقضة الأمة العربیة –لە١٨٧٦)ی داناو زاراوەو وشەیەك بەناوی (الأمة العربیة، الوطن العربي، أمتي العربي والإسلامي) نەبووە، هەتا ئومەویش كە هەردوو زاراوەی (مەوالی و شعوبی) لە ناخیدا سەریهەڵدا، رەهەندی دەسەلات عەرەبی نەبوو بەڵكو وەك (ئیبن خەلدون) وردتر دەستنیشانی كردووەو

دەڵێ قورەیشیانی بووه، عەرەب ئەوكات بەو مانایه بووه نەك نەتەوە، هەر خودی عەرەب لەو سەردەمەدا مانای رەچەڵەك و نەتەوەی نەداوە زیاتر مانای عەشیرەتەكانی دەرەوەی شار وەك وەسفی خاوەن بەها، ئەوانەی له جەزیرە له دەرەوەی شار نیشتەجێ بوون یان گەڕۆك و بەدەوی و ئەعرابیان پێ وتراوە، جا هەر ئایین و نەتەوەیەك بووبن. بەڵام لەلای شاریەكان و دواییش له قورئان به نەفام وەسف كراون.

ئیتر هەموو لایەك وابوونە، دەوڵەت و دەسەڵاتەكانی ناوچە بەناوی نەتەوەیی نەبووە، نە له شێوەو نە له ناوەڕۆك، تەنانەت دەسەڵاتی ئیسلامیی جیا له ئیمپراتۆریەكانی تر (مەركەزیەتی عیرقی) نەبووە بۆیە دەبینین ئەو دەسەڵاتە دەستگۆڕی پێكراوە لەناو عەرەب بۆ ناو فارس بۆ ناو تورك بۆ ناو كورد بۆ لای تر.

سەرەتای كێشەی كورد دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی سەرهەڵدانی كوردایەتی كه بەپێی هەموو سەرچاوەكان بۆ (١٩٠٨ز) دەگەڕێتەوە، لەپاش ئینقلابی ئیتحادییەكان، (موحەممەد ئەمین زەكی بەگ) لەكتێبی (خولاصەیەكی تەئریخی كورد و كوردستان)و (ساطح الحصری) لەكتێبی (محاضرات فی نشوء القومية) دەڵێن: ئێمە هەستمان بەوە نەدەكرد ئینتیمای نەتەوەییمان چییە تا ئیتیحادییەكان لەدوای (١٩٠٨ز) وروژاندیان بەوەی كه خۆیان به ناسنامەی توركی گوزارش كرد و فەرهەنگ و نەریتی عوسمانییان گۆڕی، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە گۆڤاری (مەشروتیەت)ی شەریف پاشا دەبینین تا (ژ:٤١)ی ساڵی (١٩٠٢ز) باسی كوردی تێدانییە، لەدواییدا ئینجا كێشەی كورد و ناوی كورد و كوردستانی كەوتە نێو.

هەموو ئەوانەو زۆر زانیاری تریش لەگەڵ بەڵگەنامەكانی وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسی و بەریتانی، روسی و ئەرمەنی.، تەواو جووت دەبێ لەبارەی مێژووی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی كوردایەتی.. بەهەمانشێوەش لەدوای ئەو مێژووەش كێشە سەریهەڵدا بەناوی: كێشەی كورد، كێشەی عەرەب، كێشەی نەتەوەیی تر.. ئەگینا ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە سروشتی ئەو كێشمەكێشەی نێوان كورد و

عوسمانی، کورد و تەتەر و مەغۆل و کورد و فارس، هەروەها عەرەب و عوسمانلی، عەرەب و مەغۆل و فارس و عەرەب و مەملوك و.. تاد، سروشتەكە نەتەوەیی نەبووە، هەروەها راپەڕین و دروستکردنی کیان و میرنشین و دەوڵەتەکانیش لەو ئەنجامە نەبووە، بۆیە تا شۆڕشی شێخ سەعید (١٩٢٥ز) ناتوانرایٚ بە تەواوی بزووتنەوەو راپەڕینەکان لە تۆمارگای کوردایەتی پۆلێن بکەی،یان ئەگەر زۆردوور کەوینەوە لە واقیع وپشت بە بەڵگەنامەکانی بەریتانی ببەستین دەیگێڕنەوە بۆ ڕاپەڕین وداواکاریەکانی کە خۆی لە میرنشینی بۆتان بەرجەستە کرد لە دەوری سالآنی١٨٨٠ز،(بڕوانە:بەلگەنامەی ژ:٢٣– ڕۆژی ١٨٨١/١٠/١ – FO66/441 )، هەربۆیەش دەسەڵاتێکی کوردی لەو (٦٤) دەسەڵاتە ناوێکی کورد یان کوردستانی پێوە نەبووە، جیاوازی کێشەی کورد لەگەڵ کێشەی نەتەوەکانی تر ئەوە بوو، نەتەوەکانی تر لەگەڵ سەرهەڵدانی کێشەکە بە دەوڵەت گەیشتن، کەچی کورد لەگەڵ سەرهەڵدانی بە مەینەت گەیشتن، جا زۆرجار میللەتانی تر ئەو کێشەیەو پرۆژەی نەتەوایەتیان بە فەلسەفە قووڵ دەکەنەوە بۆبنی مێژوو، کەچی کورد بە نەزانی ئەو مەینەتیەی وا قووڵ دەکاتەوەو خزمەت بە پرۆژەی داگیرکەر دەکا، ئەو تەقەلایە چەوتە مێشك و ستاندەری بیرکردنەوەی کوردی تێکداوە، پێویستی بە چاككردن هەیە.

**+ بەبۆچونی تۆ دوور لە تێڕوانینێکی کلاسیکیانەو سەرپێیانە، بۆ تاوەکو ئێستا کورد نەبووەتە خاوەنی کیان و قەوارەی خۆی؟ لەکاتێکدا لەڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە زیاتر لە (٤٠) ملیۆن کەسە بە هەموو پارچەکانیەوە لە ژمارەی دانیشتوانی نەرویج و سوید و فنلەندا زیاترە؟**

مەسعود عەبدولخالق: هەر ئەو پرسیارە کتێبێکی سەربەخۆی دەویٚ، هەوڵدەدەین هەندێ پێشەکی و راستکردنەوەی بۆ بکەین.

١– بەپێی سایکۆلۆجیەت و فۆنەتیکی پرسیارەکە وا دەردەکەویٚ کە لەمێژووەوە تائێستا کورد نەبووەتە خاوەنی دەسەڵات و کیانی خۆی، بەڵام وانییە، تاوەکو ئێستا کورد بووەتە خاوەنی قەوارەو کیانی سەربەخۆی خۆی، سەرجەم (لەدوای ئیسلام) بەپێی مەردۆخی کورد (٦٤) میرنشین و دەوڵەتی

هەبووە، كەچی هەموو عەرەب بەپێی د.سیار الجمیل (بقایا الجذور التكوین العربي الحدیث) تەنها (٦٣) میرنشین و دەوڵەتیان هەبووە، لەو عێراقە هەر نەیانبووە جگە لە هەندێ دۆخی دەگمەن لە بەسرەو فوراتی ناوەڕاست، ئەو میرنشینانەی موسڵیش عەرەب نەبووە، ئەو پرسیارە زادەی دوای سەدەی بیستەمە كە لەوێڕا لە كاروان بەجێما.

٢- بەپێی یاسای نێودەوڵەتی هەرێم و گەل حسابی پانتایی و ژمارەی دانیشتوانی بۆ ناكرێ، لەكاتێكدا یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو و ئۆسترالیا ئەوەندە گەورەن و دەوڵەتی فاتیكانیش رووبەرەكەی ناگاتە كیلۆمەترێك و (١٠٠٠) كەس (هەمووش پیاون- لەكاتێكدا بەپێی (قانون الدولی الخاص) گەل بریتییە لە نێرو مێ.

بۆیە زۆری و كەمی بەو رادەیە كاریگەری یاسایی نییە بەڵام كاریگەری سیاسی و فشاری ویژدانی هەیە.

٣- لەراستیدا یاسای نێودەوڵەتیش دادگەر نییە، تائێستاش لائیحەیەك نییە وەك بەند و ماددە یاسای نێودەوڵەتی لێ نووسرابێتەوە، زیاتر ئەو بڕیارانە دەگرێتەوە كە وڵاتە زلهێزو سەركەوتوەكان لە كۆنگرەو رێكەوتننامەكان دایان رشتووە یاخود لە نەتەوە یەكگرتووەكان دەرچووە، بۆیە یاسای نێودەوڵەتی لە گەڵ یاسای دادگەرو شەریعەتی ئیسلامیی لێك جیان.

یاسای نێودەوڵەتی وەك( هۆبز و بروتوكولات حكماء صهیون) وەسفیان كردووە هێز دروستیان كردوون، لەپاش رووداوە ترش و تاڵەكان خەملێون، ئینجا زیاتر سزای لەسەر هەژار و بێهێز جێبەجێ دەكرێ و پاداشیش بۆ هێزدار، لەگەڵ زۆر بەراوردی تر- بۆ زیاتر لەو بەراوردانە بڕوانە: (مەوسوعەی جودی- ماددە: یاسا)

بۆیە یاسای نێودەوڵەتیش بانێك و سەد هەوایە، هەر بەپێی ئەو كۆلكە یاساییانە دەبووایە كورد دەوڵەتی هەبووایە، كەچی دەوڵەتی ئیسرائیل دروست بووە بەبێ ئەوەی مەرجێكی یاسایی لێ سازابێت لە هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسیی و تاد، تەنانەت دەقی دانپیاهێنانی (نەتەوە یەكگرتووەكانیش) بەپێی

بڕیاری ژماره (١٨١) له (١٩٤٩/٣/١١ز) گاڵتەجاڕییه دەڵێ: چونكه ئیسرائیل دەوڵەتێكی ئاشتی پەروەرە، بۆیه دانی پێ دەنێین. كەچی لەوەتەی دروست بووه له (١٩٤٨ز) هەر خەریكی شەڕە، خودی دەوڵەتی عێراقیش كه له (١٩٢١ز) دروستكرا بەپێی لائیحەی ئینتیداب كه له كۆمەڵەی نەتەوەكان له پەرەگرافی (٤)ی ماددەی (٢٢) دەرچوو، ئەگینا ئەویش هەرێمێكی دیاریكراوی نەبوو، گەلەكەشی نه مواسەفاتی یاسایی هەبوو نه دەسەڵاتی سیاسیشی هەبوو، لەسەرڕووی هەمووان (خاوەن سەروەری) خۆشی نەبوو، بەڵكو داگیركراو بوو زۆر بەوردی ئەو بنەما یاساییانەی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی له ریسالەی (الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة) بخوێنەوە.

لەراستیدا لەیاسای نێودەوڵەتی زیاتر (دیفاكتۆ ـ أمر الواقع) دەخوا، جا ئێستا دێینه سەر وەڵامی پرسیارەكەو هۆی نەبوونی دەوڵەتێكی كوردی و ئەو وەڵامانەی لەلایەن مێژوونووس و یاساناسان و سیاسەتمەدارانی كورد بەو شێوەیه كۆی دەكەینەوە، گوایه ئەوانه بووه:

١- داخراوی كوردستان.

٢- عەشائیری.

٣- نەبوونی شاری گەورە.

٤- رێكنەكەوتن لەگەڵ زلهێزەكانی سەردەم.

٥- كەوتنی لەنێوان فارس و عوسمانلی.

٦- نەسازانی مەرجه یاساییه سەردەمیەكان.

٧- هەبوونی سامانێكی زۆری ژێرزەوی و سەرزەوی.

٨- پارچەپارچه بوون و دابەشكردنی بەسەر وڵاتەكانی دەوروبەردا.

٩- درەنگی سەر هەڵدانی هەستی نەتەوەیی !!

لەگەڵ زۆر هۆكاری تر دیاریكراوە، بەڵام (بەڕایه سادەكەی خۆم) ئەو هۆیانه بەتەنهاو دواهۆ نین! رەنگه یاریدەدەر بووبن، بەڵام هۆی یەكلاكەرەوە نین، چونكه میللەتانی تر لەو شێوازە بوونەو بووشن به دەوڵەت، ئەگەر بەكورتی لەسەر هەر هۆیەك شتێك بووەستین:

١- بەشی زۆری لە مێژوناسی کورد و غەیرەکورد و مونەزیرەکان هۆی نەبوونی کورد بە دەوڵەت بۆ ئەو هۆکارانە دەگێڕنەوە دەڵێن کورد چواردەوری بە دوژمن دراوەو هیچ لایەك ناکەوێتە سەر دەریا، بۆ ئەوەی دەرگای کراوە بێت لێی .

**هەڵسەنگاندنی ئەو بۆچوونە**: لەپێش مەینەتییەکەی واتە لە سەرەتای سەدەی بیست چواردەوری دوژمن نەبوو، ئەگەر عوسمانی و فارسی بە دوژمن حساب بکەین خۆ عێراق و سوریا و ئوردن دروست نەببوون، ئینجا ئەوکاتی کە ئەو دەوڵەتانە دروست بوون و کورد لێی بێبەشکرا فارس و عوسمانی هەر دەسەڵاتیان نەمابوو، بەریتانیا و فەڕەنسا زیاتر لەناوچەکەبوون، ئەوە لەلایەك، لەلایەکی تریش چەندین وڵاتی تر هەیە ئاوا پێوە دراوە و بووە بەدەوڵەتیش لەوانە : مەنگوڵستان، ئازەربێجان، ئەڵمانیا، وڵاتانی ئەفریقا، زۆری تریش بەتایبەتی ئەرمینیا لەگەل کورد پێکەوە بڕیارپیان بۆ دەرچوولەسیفەر ،مادەی کورد ٦٢ و٦٣ و٦٤ بوو مادەی ئەرمینیاش لە مادەی ٨٨ تامادەی ٩٣،ئەویش وولأتێکی داخراویش بوو بە دەولەت ، کەواتە ئەو هۆیە بنچینەیی نییە .

٢- هەندێ بۆچوونی تر هەیە هۆی نەگەیشتنی کورد بۆ دەوڵەت دەگەڕێنێتەوە بۆ سروشتی کۆمەڵگەکەی گوایە زۆر خێڵەکی و دواکەوتە بوونەو هەردەم دژ بە یاساو شارستانی بوونە .

**هەڵسەنگاندن**: بوونی دەسەڵاتی کوردی بەو فراوانییەی لە میرنشین و دەوڵەت و لە دەسەڵاتی ئەیوبی و دوای دەسەڵاتی کوردی بەسەر شام و بەغدا و زۆر شوێنی تر دەسەلمێنێ کە کورد ئەزموونی دەسەڵاتی سیاسیی و پابەندی بە یاسا بە تایبەتی یاساکانی (شەریعەت) تا ئەو راددەیە پابەندی یاسای شەریعەت ببووە نەریت و رای گشتی، بەڵام راستە کۆمەڵگەیەکی خێڵەکیش بووە، دیسان ئەوانەی زۆر خێڵەکی (مەبەست لێرە ئەوانەی دەرەوەی شارە کوردییەکان) تارادەیەکی چاك توخمی مەدەنیان لێ بەدی دەکرێ بەهۆی ئایینەکەیان لە لێبوردەیی و بەهاناهاتن و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی گشتی و پاراستنی بەرژەوەندی گشتی و ژینگە و...هتد، دەتوانین بڵێین لەو سەردەمەی (تا ئێستای) کوردی باشور چاکتر بوونە، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە کەمینەکان دەبینین

جوو، گاور، دیان) له کوردستان نەك له شارەکان له گوندەکانیش ژیاون، موڵك و سامانیان پارێزراوە، بەپێی راپۆرتی (عصبه الامم) ساڵی ١٩٢٥ز–ی ویلایەتی موسڵ وا پیشان دەدا که لێبوردەیی و پێکەوەژیانی مەسیحی و کورد له کوردستان نموونەییەو دەگمەنە، بەپێچەوانەوە ئەگەر عێراق بەنموونە وەرگرین و بووە دەوڵەتیش بەپێی توێژینەوەی کۆمەڵایەتیەکانی (حەنا بەتاتۆ)، (د.علی وەردی)، (فۆرستەر)، دەبینین کۆمەڵگەکەی نەك هەر خێڵەکیە، بەڵکو بەدەویشە، (٣٥٪) بەدەوی، (٤١٪) دەشتەکی، (٢٤٪) شارستانی، شارستانییەکەش زۆربەی غەیرە عەرەب بوون. خەڵکی ناو شاری بەغدا (بە نموونە) بەشی زۆری عەرەب نەبوونە، سێ نوێنەریان له مەبعوسان بۆ هەڵبژێردرا له (١٩٠٠ز) تەنها یەکیان عەرەب بوو بەناوی (مەحمود ئالوسی)، دووەمیان کورد بوو بەناوی (ئیسماعیل حەقی بابان)، سێیەمیان یەهودی بوو بەناوی (ساسون حقیل)، رێژەی بازرگانان له (٩٥٪) یەهود بوون.

خەڵکی ناو بەغدا (بەپێی ئاماری ١٩٠٨ز) بریتی بوو له (١٥٠,٠٠٠) کەس، (٥٣,٠٠٠) یەهودی بوون، جگە له کورد و فەیلی و مەسیحی، بۆیە شەممە پشووی بازاڕ بوو لەجیاتی هەینی، ئینجا کۆمەڵگەیەك بوون زۆر دژی یاسا و دەسەڵات، کەچی بە بڕیاری بەریتانی بوون بە دەوڵەت، لەوانەش خراپتر ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە گرووپەکانی (ئینتیداب) پێکهاتبوو له (A، B، C)، گرووپی (A) هەرە چاکەکەی بوو که عێراقە.. ئەگینا که دەگەیشتە گرووپی (C) ئەو وڵات و میللەتانە بوون هەر هیچیان لەبارەی دەوڵەت و یاسا و شارستانی نەزانیوەو ئەزموونی پێشینەیان نەبووە، ئینجا دەوڵەتیان بۆ دروستکردوون، هەر خودی فەلسەفەی ئینتیداب مانای فێرکردنی دەوڵەت بەڕێوەبردن، خاڵێکی گرنگ هەیە تائێستا مێژوونووس و سیاسەتمەدارانی کورد بەکاریان نەهێناوەو دەیسەلمێنێ که کورد زیاتر له میللەتانی دەوروبەر (بەتایبەتی عەرەب) ئامادەی دەوڵەت بەڕێوەبردن بووە، ئەوەبوو له دەقی رێکەوتننامەی سێڤری (١٩٢٠ز) وردبینەوە که پێکهاتووە له (٣٣٢) ماددە، دەبینین کوردستان له ماددەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤) پێش میللەتانی تر هاتووە (جگە له ئەرمەن نەبێ)، کەچی عێراق له ماددەی

(٩٤،٩٥،٩٦) هاتووه، ئەوەی کوردستانیش بەبێ ئینتیداب واتە خۆیان ئامادەییان تێدابوو، لە هەمووی زەقتر ئەوکاتی دەسەڵاتی شێخ مەحمود لە ئاستی نێودەوڵەتی حسابی بۆ دەکرا، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی بەرەسمی ناسی و دانی پیاهێنا، پێویستی بە ئینتیداب نەبوو، لەو بارەیەوە (ئەسیری) شاعیر دەڵێت:

**باسی ئەحواڵی ولاتانی ئەمریکا بۆ دەکەی**

**باسی مازی و حاڵ و ئیستقبالی سۆرانی بڵێ**

**چەند حوکمدارت لە بەدلیس و بۆتان بووە**

**گەر بەوە عیلمت نییە پاشای بابان بڵێ.**

زۆر بەڵگەی تریش هەیە، کەواتە ئەو خاڵەش هۆی بنچینەیی نییە .

٤– بەشێکی تر پێیانوایە نەبوونی شارێکی گەورە وەك مەڵبەندێکی بازرگانی و رۆشنبیری و مەدەنی هۆیەکە لە نەبوونی دەوڵەت بۆ کورد.

**هەڵسەنگاندن**: راستە شارە کوردیەکان لە ئاستی ئەسفەهان و بەغدا و ئەستەمبۆل نەبووە، بەلام شاری بازرگانی و رەوشەنبیری و مەدەنیشی هەبووە، لەوانە دیاربەکر، سلێمانی لە کۆنەوەش کوردستان هێڵی بازرگانی بووە لەنێوان رۆژهەلات و رۆژئاوا، ئەگەر بەوردی (سینۆهە) بخوێنیتەوە دەبینین نەوتی ئەو ناوچەیە لەو سەردەمە گەیشتۆتە میسری فیرعەونەکان، ئینجا بازرگانی بەرەو بەغداو کەنداویش هەبوو لە دیاربەکرەوە تا بەسرە، کەچی لە ئوردەن، کوێت، قەتەر، ... کوا شاری وا گەورەی هەبووە کەچی بوون بە دەوڵەت.. کەواتە ئەو هۆکارەش بنچینەیی نەبووە.

٥– باسێکی زۆری تر پێشکەشکراوە گوایە سەرۆکە کوردەکان بەهۆی هەستی ئایینیەوە لەدژی دەوڵەتە زلهێزەکان وەستاون و هاریکاری ئەوانیان رەتکردۆتەوە، تا ئەو رادەیە دەڵێن تەوقەکردنیشیان بە گڵاو زانیوە، ،یاخود دەڵێن ئەو پیاوە ئاینیانەی کوردستان لەمپەر بووینە لە بەر دەم تەبشیریەت بۆیە لەو تۆڵەیە بۆیە کورد نەبوو بە دەوڵەت .

**هەڵسەنگاندن:** ئەو خاڵە زۆر دوورە لە توێژینەوەی ئەکادیمی، چونکە خودی سروشتی ئیسلام وانییە، هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ تا عوسمانییەکانیش پارێزگارییان لە هاریکاری و ئاسایشی نێودەوڵەتی کردووە بەهۆی پابەندی بە رێکەوتننامەکان، لەوانەش پێغەمبەر لەگەڵ یەهودی و نەسرانی، هارون ئەلرەشید لەگەڵ شارلەمانی فەرەنسی، عوسمانی لەگەڵ فەرەنسا.

دەگەڕێینەوە سەر سەرکردە کوردەکانیش کە زیاتر لەدوای شێخ عوبەیدوڵڵا دەست پێدەکا، خودی دیکۆمێنتەکانی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی، فەرەنسی، روسی، کە زۆربەیان لامانە یەکەیەکە بە شرۆڤەوە لە (ستاندەر) بڵاوی دەکەینەوە، پیشانی دەدا کە هەموو سەرکردە کوردەکان نامەیان نووسیوە بۆ ئەو زلهێزانەو ئامادەی هاریکاری بوونە، بەڵام سیاسەتی ئەوان وابووە کورد دەسەڵاتی نەبێ، تەنانەت لە وەزارەتەکەی شێخ مەحمود وەزیری مەسیحی هەبوو (کەریمی عەلەکە وەزیری دارایی بوو مەسیحی بوو)، ئینجا مێجەرنۆئێل و مێجەرسۆن هەر لە کوردستان لەلای شێخ مەحمود بوون بەو هیوایەی (لۆرانس) چی بۆ عەرەب کرد نوئێل ئاوا بۆ کورد بکا، کەچی نەیانکرد، تەنها لەلای من زیاتر لە (٥٠٠) بەڵگەنامەی جیاجیای بیانی باس لە تەقەلای پەیوەندی و نامەگۆڕینەوەو تەلەگراف بۆ بەرپرسانی بەریتانی و فەرەنسی و روسی و هەتا ئەمریکیش هەیە لەلایەن سەرکردە کوردەکانی وەك: شێخ عوبەیدوڵڵا، سەید رەزا، شەریف پاشا،.. تا دەگاتە مەلا مستەفا .

بەپێچەوانەوە زۆربەی جار ئەو هاریکارییە بووە سەرخواردنی دەسەڵاتی کوردی، ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە هەڵسووکەوتی موحەممەد پاشای گەورە، کە گوایە دەڵێن بە فتوای مەلای خەتێ دەوڵەتەکەی تێکشکاوە، راستیەکەی ئەوەیە لەنێوان فەرەنسا و بەریتانیادا شکستی هێنا، هێرشێکی بردە سەر فارس و دوایی فەرەنسا ئیقناعی کرد کە هاوکاری موحەممەد عەلی پاشای میسر بکا بۆ هێرشکردنە سەر عوسمانی و خەریکبوو بە هەردوولا ئەستەمبۆلیش بگرن، ئینجا بەریتانیا هاتە وەڵام و ئەوەی قەبووڵنەکرد میراتی عوسمانی کە بەرەو نەخۆشی

بوو ببێتە موڵکی فەڕەنسا، بۆیە ئەو پەلامارانەی پێ ڕاگرتن و موحەممەد عەلی گێڕایەوە میسر و موحەممەد پاشای گەورە بەتەنها بۆ عوسمانی ماوەو لەناویبرد.

ئەو ئەزموونە لەگەڵ شۆڕشی شێخ سەعید (١٩٢٥ز)و ئیحسان پاشای (١٩٢٧ز) کراو نەك بەریتانیا و فەڕەنسا، هەتا خودی روسیا و لینینیش کە چەپیە کوردەکان زۆر شانازی پێوە دەکەن، یارمەتی ئەتاتورکیدا لە دژی کورد، ئەزموونی کۆماری مهاباد (١٩٤٦ز)و شۆڕشی ئەیلوول (١٩٦١– ١٩٧٥ز) بەروونی و پێچەوانە دەردەکەوێ. کەواتە ئەو خاڵەش هۆی بنچینەیی نییە.

٦– کەوتنی کوردستان لەنێوان فارسی و عوسمانی.

**هەڵسەنگاندن:** مێژوونووسە کوردەکان پشتیان بە هەندێ ڕۆژهەڵاتناس بەست بۆ دیاریکردنی ئەو هۆیەو لە پرۆگرامی خوێندنی باڵاو ناوەڕاست وایان تۆمارکردووە گوایە شەڕی چالدێرانی (١٥١٤ز) یەکەم دابەشی کوردستان بووە، ڕاستیەکەی وانییە، ئەگەر کوردستان بەمانای سیاسیی هەبووبێ (پێشموانییە هەبووبێ تا کۆتایی سەدەی ١٩) ئەوا لەپێش ئەو مێژووەش دابەشبووە، ئینجا ئەو ڕووداوەی چالدێران خۆ هەر کوردی دابەشنەکردووە، بەڵکو تورك و عەرەب و فارس و زۆری تری دابەش کردووە، ئەو دابەشیە بە ڕێکەوتن نەبووە، بەڵکو بریتی بوو لە سنوری سەربازی کە لە کەنداوەوە دەستی پێکرد تا دەریای ڕەش، (تۆما بوا) لە کتێبی (تأريخ الاكراد) بەروونتر باسی ئەو روداوە دەکات و ئەو تیۆرە ڕەت دەکاتەوەو جەنگی چالدێران وەك سەرجەم جەنگەکانی سەردەمی خۆی لەنێوان دوو ئیمپراتۆریەت پۆلین دەکات و بەس، ئەگینا ڕاستیەکەی ئەوەیە لە ڕێکەوتننامەی سایکس–بیکۆ (١٩١٦ز) بۆ یەکەمجار کوردستان و ناوچەکە بەنهێنی دابەشکراو لە دەوروبەری ساڵی (١٩٢٠ز) ڕێکخراوە سیاسیی و سەرکردە کوردەکان پێیانزانی و نامەی ناڕەزایی ئەو دابەشییان بەرزکردەوە– بڕوانە: (دەقی نامەی کۆمیتەی ئیستقلالی کورد لە ساڵی ١٩٢٠ز لەلایەن سورەییا بەدرخان مۆرکراوە بۆ وڵاتانی هاوپەیمانانی نووسیوە)، خۆ ئەرمینیا و ئازەربیجان و عێراقیش کەوتبووە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەوەو بوونە دەوڵەتیش،

بەپێچەوانەوە گەلێ جار میرنشین و دەوڵەتە کوردییەکان سوودیان لەو جیۆپۆلیتیکە وەرگرتبوو، کەواتە ئەو هۆکارەش بنچینەیی نەبووە.

٧- هەندێك لە یاساناسانی کوردی نوێ زیاتر پشت بە هەندێ زانیاری چەوتی پارێزەری نێودەوڵەتی دەبەستن و گوایە لەسەروبەری سەرهەڵدانی دەوڵەتی هاوچەرخ کوردستان مەرجە یاساییەکانی لێنەهاتبووە دی، هەر زۆر بەکورتی وەڵامی دەدەینەوە، چونکە پێشتر شتێکمان لێ باسکردبوو، مەرجە یاساییەکان بریتی بوون لە هەرێمی دیاریکراوی خاوەن ناسنامەو گەلێکی رێکخراوو دەسەڵاتێکی سیاسیی، هەڵبەتە لەو رووەوە کوردستان ئامادەسازی یاسایی چاکتر هەبوو لە وڵاتانی دەوروبەر، ئەگەر لەوە دەست پێبکەین وەك بەڵگەنەویست، دەبینین بە سەدان دیکۆمێنت پێشانی ئەوە دەدەن کە سەرکردە کوردەکان، میللەتی کورد، هۆزەکان، لایەنە سیاسییەکان، سکاڵاو داواکارییان بۆ هاوپەیمانان، کۆنگرەکانی ئاشتی، رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان، کۆمەڵەی نەتەوەکان بەرزکردۆتەوە بۆ بوون بە دەوڵەت، بەڵام یەك سکاڵاو داوای وا لە عێراقی عەرەبی بەدیناکرێ ئاوا بەرزیان کردبێتەوە، چونکە میللەت و سەرکردەو هەرێمیان شایانی دەوڵەت نەبووەو ئیرادەی بوون بە دەوڵەتیان نەبووە، کەچی خەڵکی کورد ئیرادەی بوون بە دەوڵەتیان هەبووە، ئەوە وەڵامیشە بۆ بەشێکی تر کە هۆی نەبوونی دەوڵەتی کوردستانی بۆ نەبوونی ئەو ئیرادەیە دەگێڕنەوە.

هەرچی مەرجە یاساییەکانە باسمانکرد هەر بوونی سنورێکی دیاریکراو بۆ کوردستان هەروەك لە ماددەی (٦٣)ی سێڤر هاتووە بەرەسمی جگە لەوەی لە ئینسکلۆپیدیاکانیش هاتووە، ئەوە دەسەلمێنێ کە هەرێمی کوردستان بەو ناسنامەیەوە لە وڵاتانی دەوروبەری وەك سوریا و عێراق و تورکیا رەسەنترە (جگە لە ئێران)، هەر خودی خەملێنی وشەی کوردستان لە سەدەکانی (٩-١٠) لەسەر زاری سوڵتان سەنجەر و رەنگە لەپێش ئەویش هەبووبێ، لەساڵی (١٣٣٩ز) کەوتە سەر نەخشەی ئیبن مستەوفی هەر بۆیە بە سەرەتای ناوی جوگرافی و دوای ئیداری و ئینجا سیاسی بەڵگەیەکی سیاسیی و یاسایی ئەوەندە بەهێزە نموونەی زۆر کەمە لەجیهان، گەلەکەشمان باسکرد چۆن ئیرادەی بوون بە دەوڵەتیان

هەبووەو مێژووی سیاسیشیان پڕە لە نموونەی دەسەڵاتی سیاسیی سەربەخۆ، لەوکاتیش کە دەوڵەت دروست دەبوو لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٨ز)، ئەوا دەسەڵاتی سیاسیی کورد هەبوو شێخ مەحمود بوو، سمکۆ بوو، کەواتە مەرجەکانی لەو وڵاتانەی ناومان هێنان زیاتر سازاوتر بوو (ئەگەر تورکیا و عوسمانی یەکسان نەکەین کە یەکسان نین). جگە لەوانە حکومەتی شێخ مەحمود شەرعیەت و هێزی یاسایی هەبوو، چونکە دەوڵەتی عوسمانی بەپێی بروسکەی عەلی ئیحسان پاشا بەناوی عوسمانلی لە (٣٠ی تشرینی یەکەم ١٩١٨ز) دانی پیاهێنابوو، دوایی بەریتانیاش دانی پیاهێنا بەپلەی حوکمدار، بۆیە لەپێشتریش وتمان کە دەوڵەتی کوردستان پێویستی بە سیستمی ئینتیداب نەکردووەو لەسەرووی ئینتیداب بووە، مێژووی بەڵێندان بەکورد بۆ بوون بە دەوڵەت زۆر لەپێش ئەرمەنیش بووە، بەڵێنەکانی ئەرمەن لە کۆنگرەی بەرلین ماددەی(٨٠)ی ساڵی(١٨٧١ز) بوو، کەچی ئەو بەڵێنە بەپێی سەرچاوەی (د.علی محمد صلابي– الدولة العثمانية)، هەروەها چەندین بەڵگەنامەی تری فەرەنسی و بەریتانی دەسەلمێنێ، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی (١٩)، بۆیە ئەو هۆکارانەش نەك هەر بنچینەیی نەبووە، بەڵکو لە هەموویان دوورترە لەراستی.

٨– بەشێك لە مێژوونووس و ئابووریناس کە بە فیکری مارکسی کاریگەر بوون، پێیانوابوو ئەو سامانە زۆرەی سەرو ژێر زەوی وایکرد کورد دابەش و داگیر بکرێ و نەبێتە دەوڵەت.

**هەڵسەنگاندن:** راستە کوردستان سامانی زۆرەو هەموو لایەك چاویان لە خێروبێری بووە، بەڵام سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی هاوچەرخ لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی سیستمێکی جیهانی نوێ داڕێژراو سیستمی ئیمپریالیزمی راستەوخۆش گۆڕا بۆ رێکەوتننامەو ئینتیداب و مۆرکردنی گرێبەستی کۆمپانیا، بەڵام ئەو هۆکارە بۆ دوای دابەشیەکە کاریگەری هەیە، وەك دەبینین چۆن کەرکوك تەعریب کرا بۆ ئەو مەبەستە، وەختێك گرنگی نەوت هاتە گۆڕەپان کە سەردەمی سیستمی نوێی جیهانی هاتە کایەوە، لەلایەن ئەڵمانیا پێش سەدەی بیست گرنگی نەوت بەدی دەکرێ، هەر بۆ زانیاری یەکەمجار گرنگی نەوتی

كوردستان (خانەقین) لەلایەن (معجم البلدان)ی (یاقوتی حەمەوی) باسكراوە نەك وەك هەندێ مێژوونووس دەیدەنە پاڵ زانایانی ئەڵمان لە سەدەی (١٩)، بەڵام بەریتانیا كە نفوزی لە ویلایەتەكانی بەغدا و بەسرە بەهێز بوو ئەوكاتی ماكینەكانی بە خەڵوز ئیشی دەكرد دوایی لەسەرەتای سەدەی بیستەم بوو بە نەوت، لەكاتی دابەشیەكەی (سایكس-بیكۆ)ش ویلایەتی موسڵ كەوتە سەر بەشی فەڕەنسا، هەر بەو هۆیەوە بەریتانیا تەقەلای لەگەڵ (كلیامنسور)ی سەرۆك وەزیرانی فەڕەنسادا لە كۆنگرەی (سان ریمۆ ١٩٢٠ز) تا ویلایەتی موسڵ بگێڕێتەوە سەر بەشی بەریتانیا بە مەرجی خۆی رێكەوتن، ئیتر لەو سەودایە ئەو بۆچوونە بەهێز دەكا كە گوایە بەهۆی سامانەوە كوردستان پارچە پارچە كرا، هەر لە كۆنگرەی قاهیرەی (١٩٢١) كە عێراقی لێ دروستكرا پاساوی هەرە بنچینەیی هەریەكە لە: (مس بیل) و (برسی كۆكس) لە بەرامبەر پێشنیارە چاكەكانی (چەرچڵ) ئەوەبوو: ئەگەر داهاتی كوردستان لەو عێراقە نوێیە جیابكرێتەوە ئەوا عێراق مقەوماتی ئابووری خۆی نابێ، بەڵام هەموو ئەو تاوتوێیە ئەوە ناگەیەنێ كە كوردستان پارچەپارچەكراو نەگەیشتە دەوڵەت بەو هۆیە، خۆ هەمان سامان درا بەعێراق و بوو بە دەوڵەتیش، ئینجا وڵاتانی كەنداو هەمووی لەسەر بنچینەی نەوت بوونە دەوڵەتی سەربەخۆ، كەواتە هۆكارەكە پێچەوانەیە، دڵنیام ئەگەر كوردستان سامانی نەوتی نەبووایە مێژوونووسەكانی خۆمان بەلایەكی تردا دەچون و دەیانگوت: خوا كوردی لە سامان بێبەشكرد، بۆیە وڵاتێكی زلهێز نەهات تەماحیان تێ بكاو بمانكات بە دەوڵەت ئەوكاتی نەبوونی سامان دەبووە هۆیەكی مەعقولی نەبوونمان بە دەوڵەت، كەواتە ئەو خاڵەش نەك هۆكاری نەبوونی دەوڵەتە بەڵكو بە پێچەوانەوە خاڵی یارمەتیدەرە.

٩- بەشێكی تر پێیانوایە پارچەپارچەكردنی كوردستان و دابەشی بەسەر حكومەتەكانی دەوروبەر هۆی نەبوونی دەوڵەتێكی كوردییە.

وەڵام: دەبێ بەوردی زنجیرە رووداوەكانی مێژوو رێزبكەین، لەكاتی بێبەشكردنی كورد هێشتا دابەش نەكرابوو (دابەشیەكە مانای مەینەتی و نەگەیشتنی كورد بە دەوڵەت)، بۆیە دابەشیەكە پەیوەندی بە بەردەوامی

مەینەتیەکە هەیە نەك بەرپاکردنی مەینەتییەکە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر وڵات هەیە خراپتریش پارچەپارچە ببوو، لەوانە ئەڵمانیا لەپاش جەنگی سی ساڵەو رێکەوتنی ویستڤالیای (١٦٤٦ز) ببووە (١٣٠٠) میرنشینی جیاجیا کەچی (بسمارك) توانی لەساڵی (١٨٧١ز) کۆیان بکاتەوەو دەوڵەتی ئەڵمانیا دروست بکا.

١٠- بەشێکی تر دەڵێن نەبوونی کورد بە دەوڵەت لەلایەن رۆژئاواوە لە ڕقی صەلاحەددین بووە.

**هەڵسەنگاندن:** ئەی بۆ عەرەبیان لە تۆڵەی موحەمەد(د خ) و عەباسی و ئومەوی لەدەوڵەت بێبەش نەکردووە، با تورکیایان لە ڕقی عوسمانی دروست نەکردبایە، هەڵبەتە ئەوەش نییە.

١١-بەشێکی تر مەینەتی کورد بۆ درەنگی پێگەیشتنی هەستی نەتەوەیی دەگێڕنەوە.

**وەڵام:** ئەوەیان هەر پێچەوانەیە چونکە زۆربەی داڕێژەرانی عەلمانیەتی نەوەی یەکەمی عوسمانی کورد بووینە ئەوەتە لە کۆی چوار لە دروست کەرانی ئیتحادو لتەرەقی لە سالی ١٨٨٩کورد بووینە (د عەبدوڵڵا جەودەت وئیسحاق سکوتلی )،ئینجا بە پێی بەڵگەنامەی بەریتانی دەریدەخا لە ساڵانی پەنجاکان شێخ عوبەیدوڵڵا هەستی دەوڵەتێکی سەرانسەری کوردستانی هەبووە ،ئەو کاتە نە تورك و نە عەرەب ئەو هەستەیان هەر نەبووە.

بەشێکی تر دەڵێن لەبەر کوشتارەکەی ئەرمەنی ..ئەوەی بە ڕەسمی پێی هەستا (ئیتحادوئەلتەرەقی) بووکەچی تورکیای لێ دروستکرا بە پێی ڕێکەوتنامەکانی سێڤر و لۆزان.

کەواتە ئەوهۆیانە هۆی بنچینەیی و کۆتایی نییە، ئەی کەواتە ئێستا پرسیاری بنچینەیی لە زانستی کوردایەتی ئەوەیە: هۆی چی بوو ئێمە نەبووین بە دەوڵەت؟

ئەوەش بەکورتی وەڵامەکەیەتی (بەرای خۆم):

ئەوەی لەسەرەوە بۆمان دەرکەوت بەڕوونی دەری دەخات مێژوو بەرپرسیار نییە لە مەینەتی کورد و نەگەیشتنی بە مافی چارەی خۆنووسین و دەوڵەت، واتە ئەو مێژووەی ئێستا لە پرۆگرامی خوێندن دەیخوێنین ئەوە غەدر لە کورد دەکا،

نەك مێژوو غەدر لە كورد بكا، بەگشتی فاكتەری مێژوو ئەو رۆڵەی نە بە سلبی و نە بە ئیجابی بۆ كورد نەبینی، ئەگەر بە(گریمان) دان بەوەش بنێین كە كورد لە مێژوودا دەسەڵاتدار نەبووە هەروەك عەرەبی عێراقی هەر لە هەموو مێژوودا خاوەنی دەسەڵاتی سیاسیی نەبووە، خۆ ئاشكرایە عەباسیەكان عەرەب بوون، بەڵام عێراقی نەبوون، لەپاش ئەوانیش دەسەڵاتە جۆربەجۆرەكانی تەتەر و مەغۆل و سەلجوق و مەملوك و...تاد، نەك عێراقی بەڵكو عەرەبیش نەبوون، كەچی عەرەبی عێراق بوون بە دەوڵەت.

پێش ئەوەی راستەوخۆ بێینە سەر وەڵام پێویستە بە وردی لەسەر رێكەوتننامەی (سایكس-بیكۆ ١٩١٦ز) بووەستین لەگەڵ مەبەستەكانی:

ئەو رێكەوتنە بەرەنجامی كارو چالاكییەكی زۆری وڵاتانی زلهێزی وەك فەڕەنسا و بەریتانیا و روسیا بوو تا گەیشتنە ئەو رێكەوتنە كە لە (١٦/٥/١٩١٦ز) مۆركرا دوای دوو ساڵ لە جەنگی جیهانی، هەر ساڵێك دوای ئەوەش (بەڵێنی بەلفۆر) درا، ئەو رێكەوتنە پێكهاتبوو لە (١٢) ماددە میراتی عوسمانی دابەش دەكا بەشێوەیەك كە جارێكی تر ئوممەی ئیسلامیی یەكنەگرنەوەو خیلافەتیش زیندوو نەبێتەوە، چەند وڵاتێكی دەستكردی واش دروست بكەن كە جێی ئیسرائیلی داهاتوو بە سانایی ببێتەوە، ئەوانە ئامانجی سەرەكی بوو لەپێناو ئەو ئامانجانەو بەپێی هەردوو بەرژەوەندی رۆژئاواو ئیسرائیل ناوچەكە دابەشكراوە، لەسەر بنچینەی رەگەزی و ئایینی و جوگرافی و شارستانی و تایفی نەبووە، هیچ بنچینەیەكی سروشتی و بەشەری بەدیناكەی جگە لەو دوو تەرازووە، جا ئەو دوو تەرازووە چۆنی خواستبێ وای بۆ كراوە، كەواتە نهێنیەكانی دابەشی كوردستان لەنێو ئەو دوو نهێنیەدایە كە كەمتر توێژەرەوانی كورد بەلایدا چوونە، ئەگەر ئەو سەردەمەی كە مەینەتی كورد دروستبووە لە دابەشیەكەی و لكاندنی بەو وڵاتانەی دەوروبەر زۆر بە ئاسانی لایەنەكانی بەرپرس لەو كێشەمان بۆ دەردەكەوێ، ئاخۆ كام مەدرەسە بوو؟ عەلمانی بوو یان ئیسلامیی؟ وڵاتانی تەوەر یان هاوپەیمانان، عوسمانی بوو یان رۆژئاوایی؟ وڵاتانی تازە چییان لە ئەستۆدایە؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ستراتیژییانە لەپێشدا ئەو ماوە زەمەنییە دیاری دەکەین کە کوردستانی پێ دابەش کرا:

١- لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی جێبەجێ کرا کە دەکاتە دوای (١٩١٨ز).

٢- لەوکاتە بوو کە هاوپەیمانان بەسەر وڵاتانی تەوەر (کە عوسمانی بەشێك بوو لێی) زاڵبوون.

٣- لەو کاتە بوو بیری عەلمانی جێی بیری ئیسلامیی گرتەوە.

٤- لەوکاتە بوو کە بیری نەتەوەگەری بووە بنچینەی دروستکردنی دەوڵەتی هاوچەرخ لەجیاتی ئیمپراتۆریەتەکان.

٥- لەوکاتە بوو کە ئاشتی جیهانی و (وفاق الدولی) بەو نەخشەیە دروستکرا.

کەواتە بەڕوونی دەردەکەوێ مەینەتی کورد لەساڵی (١٩٠٨ز) دەست پێدەکاو لەساڵانی (١٩١٦ز) خەست دەبێتەوە تا لە ساڵانی (١٩٢٢-١٩٢٥ز) دروست دەبێ.

**لایەنە بەرپرسەکان لێی:**

ئێستا بەکورتی و ڕاشکاوانە دەردەکەوێ لەنێوان عوسمانلی و تورکیای نوێ، مەدرەسەی عەلمانی و ئایینی، وڵاتانی تەوەر و هاوپەیمانان، دیارە کێ لێی بەرپرسیارە.

**سێ تەوەرەی جیهانییە:**

١- وڵاتانی ڕۆژئاوا کە خۆی لە ڕێکەوتننامەکانی (سایکس-بیکۆ ١٩١٦ز) و هەرەدواییش لە لۆزانی (١٩٢٣ز) دەنوێنێت.

٢- عەلمانیەتی ئیقلیمی و ئەو وڵاتانەی کە دروست بوون لەسەر ئەو بنچینەیە لە پێشەوەیاندا بزووتنەوەکەی مستەفا کەمال ئەتاتورك و دروستبوونی تورکیا بەو دەستور و ڕەوتە، ئینجا عێراق و سوریا.

٣- عەلمانیەتی کوردیش بەشێك لەو بەرپرسیاریەتیە هەڵدەگرێ، چونکە بەبەڵێنەکانی ئەتاتورك هەڵخەڵەتاو پاڵپشتی پرۆژەی تورکیای نوێیان کرد لەدژی دەسەڵاتی سوڵتان، هەرچەندە بەشی زۆری ئەو عەلمانیە کوردپەروەرانەش دڵسۆز و ماندوونەناس بوونە.

لەگەڵ کۆمەڵێك هۆکاری تر کە لە پێشتر وەك (هۆکاری نابنچینەیی) باسکران، بەڵام کەمتر باسی رۆڵی ئەرمەنیش کراوە کە بووەتە هۆی ناشرینکردنی وێنەی کورد لە ئەوروپا، هەرچەندە لە دواساتەکانی لایەنە سیاسییەکانی ئەرمەن هاتنەوەو هاوپەیمانییان لەگەڵ کورد کرد، بزووتنەوەی (تاشناقی) ئەرمەنی و (خۆیبوون)ی کورد هاوپەیمانییان بەست، نوێنەری ئەرمەنی (بوغز پاشا) لەگەڵ شەریف پاشای کورد پێکەوە نوێنەرایەتی هەردوو کێشەیان کردووە.

بەڵام لەکاتێکدا بوو کە دەرفەتە زێڕینەکان لەدەست چووبوو، هەریەکە لەو تەوەرانە چیرۆکی خۆی هەیەو درێژەکەی لە دەرفەتێکی تایبەتی بە دیکۆمێنتەوە باسیان دەکەین.

مەدرەسەی قاهیرەی موخابەراتی بەریتانیاش بە پێچەوانەی مەدرەسەی هیندی و حکومەتی مەرکەزی بەریتانی لایەنگیری ئەو (٣) مونەزیرە بەریتانیەی دەکرد بۆ ئەوەی عێراق بەو قەبارەو سنوورە دروست بکرێ، لە کۆنگرەی قاهیرەی (١٩٢١ز) هەموو ئەوانە زۆر بە خەستی داکۆکیان لە بۆچوونەکانیان کرد و پێشنیارەکەی چەرچڵیان ساردکردەوە کە داوای کردبوو جارێ کوردستان بەند بێت بە ماددەکانی (٦٢، ٦٣، ٦٤)ی سێڤر.

ئێستا دەکرێ لیستێکی پیاو چاك و پیاو خراپ بەرامبەر کورد دیاری بکەین، بۆ ئەوەی خەلکی کوردستان بزانن کێ دۆستیان بووەو کێ دوژمن.

**لە باشەکان:** مێجەر نوئیل، مێجەر روس، چەرچل، ئەدموند لبندی، ئەرسەر فرنج، (مەدرسەی ئەهلی قاهیرەی بەریتانی، کالسورن، سیولی، ریشارد ویب، هادی پاشا، سولتان محمد واحدالدین، فرید پاشا، آ شیرازی، توینبی ـ مێژوونوس).

**لە خراپەکان:** (ویلسون، برسی کوکس، مس بیل، مارك سایکس، جورج بیکۆ، مەدرسەی بەغدای بەریتانی، ئیتیحادو تەرەقی، ئەتاتورك، لینین، ستالین، مەلیك فەیسەڵ، حزبی فەتاتی عەرەبی، ماکماهون، کلایتون، مێجەرسون، لچمان، لونکرینك، مێجەر ئارهی، مێجەر راندل، نوێنەرەکانی بەریتانیا لە ئێران، جۆن رابك، توماس جوهلەر، لۆرد کیرزۆن)، لەگەڵ زۆر پیاو خراپی تر لەوانەش نەوەی

یه‌كه‌می عه‌لمانیه‌تی كوردی وه‌ك (برنجی زاده‌، حه‌سه‌ن خه‌یری، زولفی به‌گزاده‌،ئه‌لب كۆك..) ئه‌وانه‌ له‌ دروستكردنی مه‌ینه‌تی كورد به‌ر پرسیارن.

## ئه‌گه‌ره پێچه‌وانه‌كان:

به‌كورتی كۆمه‌ڵێك ئه‌گه‌ری ده‌گمه‌ن و بێ نه‌خشه كۆبوونه‌وه‌و مه‌ینه‌تی كوردیان دروستكرد، به‌رای من ئه‌و سه‌ره‌نجامه‌ به‌ نه‌خشه‌و پلان نه‌بوو، زیاتر ڕه‌وتی ڕووداوه‌كان وای سوڕاند، هه‌رچه‌نده‌ دیكۆمێنته‌كانی به‌ریتانی و فه‌رنسی به‌ ڕوونی ده‌یسه‌لمێنن كه‌هه‌ر له‌ سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی (١٩) له‌ دژی سه‌رهه‌ڵدانی كورد وه‌ستاون بۆیه‌ ئه‌گه‌ر ئه‌و (ئه‌گه‌رانه‌ی) خواره‌وه‌ به‌جۆرێكی تر بووایه‌ زنجیره‌ی ڕووداوه‌كان ئه‌و ڕه‌وته‌ی نه‌ده‌گرت كه‌ مه‌ینه‌تی كوردیان دروستكرد ڕه‌نگه‌ كوردیش به‌مافی خۆی ده‌گه‌یشت، وا هه‌ندێك له‌و ئه‌گه‌ره‌ پێچه‌وانانه‌ تۆمار ده‌كه‌ین:

١- ئه‌گه‌ر جه‌نگی یه‌كه‌می جیهانی هه‌ڵنه‌گیرسابایه‌، ئه‌گه‌ر هه‌ڵگیرسا ئه‌ڵمانیا و وڵاتانی ته‌وه‌ر سه‌ركه‌وتوو بوونایه‌ له‌وانه‌ش عوسمانی ئه‌وا كورد وای به‌سه‌ر نه‌ده‌هات.

٢-ئه‌گه‌ر به‌ریتانیا نه‌هاتبایه‌ عێراق و ئه‌گه‌ریش هات له‌لای فاو نه‌هاتبایه‌ له‌لای كوردستان به‌ره‌و عێراق بچووبایه‌، جۆره‌ سه‌ره‌نجامێكی تری ده‌بوو.

٣- به‌ریتانیا ته‌نها به‌سره‌ی بگرتبایه‌و به‌گوێی حكومه‌تی هیندی بكردبایه‌و بووه‌ستایه‌، یاخود به‌رگرییه‌ هاوبه‌شه‌كه‌ی شێخ مه‌حموود و شیعه‌و عوسمانلی له‌ شوعێبه‌ سه‌ركه‌وتوبووایه‌.

٤- ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر ده‌قی رێكه‌وتننامه‌ی (سایكس-بیكۆ)یه‌ش جێبه‌جێ بكرابایه‌ هه‌رچه‌نده‌ زۆر خراپیش بوو، به‌ڵام له‌و دۆخه‌ی دوایی كه‌ له‌ (سان ریمۆ) و كۆنگره‌ی قاهیره‌ هاته‌دی باشتر ده‌بوو.

٥- شۆڕشه‌كانی بیست له‌ خوارووی سه‌ركه‌وتوو بووایه‌.

٦- حكومه‌تی ئه‌نقه‌ره‌ به‌سه‌ر حكومه‌تی ئه‌سته‌مبۆل زاڵ نه‌بووایه‌، له‌ خوارووش حكومه‌تی به‌غدا به‌سه‌ر حكومه‌تی كه‌ربه‌لا زاڵ نه‌بووایه‌.

٧- كۆنگره‌ی سان ریمۆ نه‌كراباو سێڤر نه‌گۆڕابا به‌ لۆزان.

٨– ئەتاتورك بەسەرسوڵتان زاڵ نەبووایەو کوردە عەلمانیەکان و عەشائیرەکان پشتگیری ئەتاتورکیان نەکردبایە.

٩– شۆڕشی ئۆکتۆبەری (١٩١٧ز) نەکرابایە.

١٠– فیکری عەلمانی و دەوڵەتی هاوچەرخ بیری نەتەوەگەری نەهاتبایە ئەو ناوچەیە.

لەگەڵ زۆر ئەگەری تر ئەوا کورد ئەو مەینەتیەی بۆ دروست نەدەبوو، بەڵام ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەگەرە پێچەوانەکان دەبینی سەرجەم زاڵبوونی عەلمانی بەسەر ئاییندی وایکردووە ئەو مەینەتیە دروست بێ، کەچی ئەوساو ئێستاش بەشی زۆری کورد بەو هەنگاوانە خۆشحاڵن.

**+ لە وەڵامی ئەو پرسیارە چەند پرسیارێکی تر دروست بووە ،چەندە راستەدەڵێن مەلای خەتێ و ئەلمانیا هاریکاری سوڵتان مەحمودیان کرد بۆ ڕووخانی میرنشینی سۆران و پاشای کۆرە؟سەلاحەددین لە خزمەتی عەرەبدا بووە، شیخ ئیدریس لەخزمەتی سوڵتان سەلیم بووەو ئەو نەیهێشتووە کورد سەربەخۆ بێت؟**

مەسعود عەبدولخالق: ئەوانەی ئەوجۆرە گوتارەیان هەیە پسپۆر نین ،هەرگیز نابینی توێژینەوەیەکی ئەکادیمی بالا ئەو ڕایەی هەبێت،ئەو ڕایە زیاتر بازاڕییە و لە ناخێکی شکست خواردوو هەڵدەقوڵێ نازانی هۆیەکەی چییە،ئەگینا کەی ئەلمانیا لەو شکستەی میری سۆران بەشدار بووە ،وەك لە سەرو باسمان کرد کەوتە نێو مونافەسەی فەرەنسی و بەریتانی و بە دیکۆمێنتی بەریتانی لای من هەیە،ئیتجا ئەو ڕۆڵەی کە بۆ مەلای خەتێ بە تۆمەت دانراوە دەرکەوتووە ناوی (دیفید ود)ە و بەریتانیە زۆر دوورە لە مەلای خەتێ ، بڕوانە ئەو بابەتەی پ ی سەلام ناوخۆش لە ستاندەر بەناوی: سێکوچکەی ستەم).

**+ گەر وایە و ژمارەی دانیشتوان رەچاو ناکرێت، دەبینین رووبەری کوردستان (٥٠٠,٠٠٠)کم٢ زیاترە کە لە روبەری هەریەکە لە وڵاتەکانی بەریتانیا، هۆڵەندا، بەلجیکا، سویسرا، دانیمارك، زیاترە، بۆچی ئەم روبەرە فراوانە دەوری نەبینیوە لە بونیادی کیانێکی سیاسیی بۆ کورد؟**

مەسعود عەبدولخالق: لەرووی یاساییەوە لەپێشتریش باسمانکرد فراوانی وتەسکی رووبەری هەرێم توخمێکی یەکلاکەرەوە نییە، ئەو ولاّتانە کیانی سیاسی سەربەخۆن و رووبەریشیان چەندە بچووکە وەك: دەوڵەتی فاتیکان باسمان کرد، ولاّتی بەکترن رووبەرەکەی تەنها (٥ کم$^2$)، کۆماری (نرۆ) رووبەرەکەی (٢٢کم$^2$)، دەوڵەتی میدیا رووبەرەکەی (٥ کم$^2$)، (لیخنشتاین) و (میرنشینی مۆناکۆ) زۆر نموونەی تر.. تەنانەت دەوڵەتی ئیسرائیل لەساڵی (١٩٤٨ز) کە دروست بوو رووبەری هەرێمی بە ناسنامەیەکی ئیسرائیلی زۆر کەم بوو، زۆربەیان بە هەرێمی عێراقیشەوە مەرجە یاساییەکانی نەدەهاتە دی، کە بریتییە لە:

١- ئەو هەرێمە موڵکی خۆیان بێ.

٢- گەلێکی دامرکاوی(نیشتەجێ) لەسەر بێ نەك رەوانە.

٣-سنورێکی روون و ئاشکرای هەبێ.

هەموو ئەوانەش لە هەرێمی کوردستان سازابوو، کەچی بۆی دەرنەچوو، بەلاّم رووبەری وا فراوانی وەك کوردستان کە زیاترلە (٥٠٠,٠٠٠کم$^2$) دەبوو بۆ ئەوەی ئەو فشارە جوگرافی و سیاسییە هەمیشەییە دروست نەکاو کورد نەبێتە دەوڵەت لە رێکەوتنی (سایکس-بیکۆ ١٩١٦ز)و کۆنگرەی قاهیرە (١٩٢١ز)و لۆزانی (١٩٢٣ز) دابەشیان کرد و تائێستاش بەردەوامە.

بەلاّم ئەو پانتاییە فراوانە لە مێژوودا رۆڵی خۆی بینیوە لە بەرپاکردنی دەسەلاّتی سیاسیی جیاجیا و فراوان، دەشبێ بزانین تا سەردەمی دوایین خیلافەتی عوسمانیش ئەو رووبەرە فراوانە مابوو، هەروەك لە دوا نەخشەی عوسمانی ساڵی (١٨٩٣ز) هەروا بەفراوانی مابوو، لەدوای ئەوان و هاتنی ولاّتانی هاوچەرخ و عەلمانی نەتەوەگەری ئینجا کوردستان هەم بەش بەش کرا هەم وا بچووك دەبێتەوە، بۆیە ئیستا ئەو رووبەرە فراوانە راستەوخۆ ئەو قووڵاییە ستراتیژیە پێکناهێنێ، هەربۆیەش هەر کۆکردنەوەیەکی ئەو ولاّتانە، یان داگیرکردنی یەکیان لەلای ئەویتر ببێتە کۆکردنەوەی دوو پارچەی کوردستان لە خزمەتی ستراتیژی بزووتنەوەی کوردایەتی، ئەو تیۆرە ستراتیژیە لە جەنگی عێراق

و ئێران وا وه‌رنه‌گیرا.ئه‌وه‌ی سه‌روو وه‌لاًمیشه بۆ هه‌ر یه‌كێك كه‌ده‌ڵێ صه‌لاحه‌ددین خزمه‌تی عه‌ره‌بی كردووه .

**+ زۆرێك له ناسیونالیسته‌كورده‌كان پێیانوایه به‌حوكمی ئه‌وه‌ی مێژووی ئیسلام له كوردستان ریشه‌یه‌كی قووڵی هه‌یه‌و حزوری سیاسیی به‌رده‌وام بووه رۆحیه‌تی ئایینه‌كه فاكته‌ری نه‌هێشتن و كوشتنی هه‌ستی نه‌ته‌وایه‌تی و فیكری بووه؟**

مه‌سعود عه‌بدولخالق: له‌راستیدا ناسیۆنالیسته كورده‌كانی ئێستا جاران زیاتر چه‌پڕه‌و بوون و دژی ناسیۆنالیستی بوون، وا له‌بیرمه له (ژ:٢)ی گۆڤاری (كوردایه‌تی) ساڵی (١٩٨٣ز) كه له‌شاخ له‌لایه‌ن (ی.ن.ك) ده‌رده‌چوو وتارێك وه‌ڵام بۆ من نووسرا تیایدا بیروبۆچونی منی به‌دواكه‌وته پۆلێنكردبوو له‌به‌رئه‌وه‌ی گوایه بیروبۆچوونی من له‌ژێر كاریگه‌ری فه‌لسه‌فه‌ی ناسیۆنالیزمیه، ئیتر پێوه‌ره‌كانی ئه‌وكاتی زیاتر چینایه‌تی و ئایدیۆلۆژیای ماركسی و سۆشیالیستی بوو، هه‌تا سروودی (ئه‌ی ره‌قیب)یش گۆڕا بۆ سروودی (ئینته‌رناسیۆنال)، ماوه‌یه‌كی چاكیش رادیۆی (ده‌نگی گه‌لی كوردستان) بوو، (ده‌نگی شۆڕشی عێراق)و عێراقچی و ئێرانچی..زاڵتر بوو، هه‌موو حیزبه كوردستانیه‌كانی سه‌رتاسه‌ری كوردستان عه‌لمانییه‌كی ماركسی توند بوون، ئه‌وه‌ی هه‌ره نه‌رمه‌كه حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران بوو، ئه‌ویش دروشمی رووخانی ئیمپریالیزم به‌تایبه‌تی ئیمپریالیزمی ئه‌مریكی بوو، ته‌نانه‌ت له دواساته‌كانی پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراقیش له كۆنگره‌ی (٩) له مادده‌كانی(٥) و (٦)ی په‌یڕه‌ووپرۆگرام هاته سه‌ر ڕاڕه‌وی ماركسی، پاساوی هه‌موو ئه‌و هه‌نگاوانه ئه‌وه‌بوو كه سه‌رده‌می بیری ناسیۆنالیستی و ده‌مارگیری نه‌ته‌وه‌یی نه‌ماوه. له‌سه‌ر دیواره‌كان ده‌نووسرا (كوردایه‌تی شه‌رمه‌زارییه)، له‌گه‌ڵ زۆر ڕاستی تر، كه‌چی ئه‌مڕۆ دیسان له‌و مه‌دره‌سه‌یه شكستیان هێناوه چوونه‌ته‌وه ئه‌وسه‌ر و ته‌رازووه‌كه‌ی كوردایه‌تیان پاوه‌نكردووه‌و به‌و ته‌رازووه مزایه‌ده‌یه‌كی وه‌ك پێشتر ده‌كه‌ن و له‌گه‌نده‌ڵیش نقوم بوونه، بۆیه ئه‌و ڕووانگانه ژه‌نگاوین و خودی ئه‌و پرسیارانه‌ی لای ئه‌وان دروست ده‌بێ و ئاڕاسته ده‌كرێ له پرسیاری (شه‌ڕی پارتیزانی) ده‌چێ، لێره پرسیارێك

دەکا پێچەوانەی دوێنێیەتی، پێچەوانەی بەشێکی تری خۆیەتی، لەلایەك دەڵێن میللەتانی تر سوودیان لە ئایینی ئیسلام وەرگرتووە بۆخۆیان کەچی لەولایە دەڵێن ئایین لەخۆ دوورخەنەوە، چونکە گیانی نەتەوەیی دەکوژێ، هەر لەلایەن مونەزیرە ناسیۆنالیستەکان دان بەوە دەنێن کەمەرجی نەتەوایەتی بریتییە لە: مێژوو، نیشتمان، ئایین، بەرژەوەندی هاوبەش، زمان، .. کەواتە ئایین فاکتەری وشیاری و یەکخستنە، هەر ئایین بووە یەکەم شارستانی و یەکەم دەوڵەتی دروستکردووە، ئینجا ڕەگی ئەو جۆرە پرسیارانە لە کەللەو مێشکێك هەڵدەقوڵێ کە زانیارییەکانی دروست نین، ئەوانە وا تێگەیشتوون کە ئومەوی و عەباسی بەمیرات ئەو (٢٢) دەوڵەتە عەرەبیەیان بۆ عەرەب بەجێهێشتووە، عوسمانیش تورکیای بەمیرات بەجێهێشتووە، کوردیش بێ میراتە، بۆیە لەناکاو هێرشێك دەکەنە سەر سەلاحەددینی ئەیوبی و شێخ سەعید و شێخ عەبدولسەلام بارزانی و شێخ مەحموود وشیخ عەبدولقادر و قازی موحەممەد و مەلا مستەفا. !

کەچی ئەو زانیارییانە هەمووی هەڵەیەو حوکمەکەش لەسەر ئەو سەرکردانە زوڵم و نەفامیە، ئومەوی و عەباسی بەناوی عەرەب حوکمیان نەکردووە، هەروەك ئەیوبی بەناوی کورد نەبووەو عوسمانی بەناوی تورك نەبووە، رۆم بەناوی غەجەر نەبووە، دەوڵەتی رۆستەمی مەغریبیش بەناوی فارس نەبووە، تاریقیش بەناوی بەربەر نەبووە، ئەوانە پەیوەندی بە قۆناغی خۆی هەیە کوا لەو سەردەمە بیری نەتەوەیی و دەسەڵاتی نەتەوەیی، نەك بۆ کورد بۆ هیچ میللەتێك، ئایینەکان مرۆڤایەتین جیاوازی لەسەر بنچینەی ئینتیمایە ستوونییەکانی وەك بنەماڵەو عەشیرەت و نەتەوە ناکەن، هیچ فەلسەفەو مەدرەسەیەکیش بوێری ئەوە ناکا سەروەری بەو ئینتیمایانە بکەن جگە لە بزووتنەوەکانی فاشی و نازی و بەعسیەت کە هەموویان بەهیلاك چوون، لەهەمانکاتدا بەو تەرازووە مرۆڤایەتیە ئایین رۆڵی بنچینەیی هەبووە لە دروستبوونی هەرچی دەسەڵاتێکی کوردییە. کام میرنشین و

ده‌وڵه‌تی كوردی هه‌بووه له‌سه‌ر شه‌ریعه‌تی ئیسلامیی نه‌ڕۆیشتبێ له: ئالاكه‌یان، سكه‌كه‌یان، دوعای رۆژی هه‌ینی، ده‌ستوریان [1].

خۆ تا (ژ.ك ١٩٤٢ز)، دواییش (حدكا ١٩٤٦ز) و دوا سه‌ركرده‌ی ئایینی مه‌لا مسته‌فا (١٩٧٥ز) هه‌موو شۆڕش و ڕاپه‌ڕین و كیانه‌كان زانای ئایینی بوون.

له‌پاش هه‌موو ئه‌وانه‌ش ئه‌وجا ده‌گه‌ڕێمه‌وه سه‌ر پرسیاره‌كه‌و ده‌ڵێم كێ وڵاتانی عه‌ره‌بی و توركیای دروستكردووه؟ زۆر به ڕاشكاوانه وڵاتانی عه‌ره‌بی له‌لایه‌ن داگیركه‌رانی به‌ریتانی و فه‌ڕه‌نسی و به‌پێی ڕێكه‌وتننامه‌كان بۆیان دروستكرا، (جگه له جه‌زائیر)، وڵاتانی عه‌ره‌بی ئاسیا باسمانكرد له (سایكس–بیكۆ)..تاد، ئه‌وه‌ش به پێچه‌وانه‌ی تێگه‌یشتنی ناسیۆنالیستی كورد چاكه نه‌بووه له‌گه‌ڵ عه‌ره‌ب، به‌ڵكو پارچه پارچه كراون و ناشرین كراون، بۆیه زانایانی ئایینی و پێشه‌وایانی عه‌ره‌ب شۆڕشیان له‌دژی ئه‌و هه‌نگاوه كرد هه‌ر له مه‌غریب تا عێراق، كه بریتی بوو له شۆڕشه‌كانی عه‌بدولكه‌ریم خه‌تابی له مه‌غریب، عه‌بدولقادر جه‌زائیری و ئیبن بادیس له جه‌زائیر، عومه‌رولموختار له لیبیا، بزووتنه‌وه‌ی مه‌هدی له سودان، تاده‌گاته شۆڕشی (١٩٢٠ز) له عێراق، به‌ڵام رۆژئاوا به‌سه‌ر ئه‌و شۆڕشانه‌دا زاڵبوو، ئینجا ئه‌و پلانه وێرانكه‌ره‌ی به‌سه‌ر عه‌ره‌ب سه‌پاند، ئه‌وه سزابوو نه‌ك پاداشت، كوا ئه‌وه چ په‌یوه‌ندی به عه‌باسی و ئومه‌وی هه‌یه، كوا ده‌سه‌ڵاتی عه‌ره‌ب له عێراق له‌مێژوودا بڕۆ بۆ هه‌شت سه‌ده، به‌هه‌مان شێوه‌ش توركیای نوێ چ په‌یوه‌ندیه‌كی به عوسمانی هه‌یه، مه‌گه‌ر پێچه‌وانه‌ی یه‌كتریش نه‌بن، توركیای نوێ میراتگری عوسمانی نییه، هیچ به‌ڵگه‌یه‌كی یاسایی به‌ده‌سته‌وه نییه، به‌ڵكو به پێچه‌وانه‌وه توركیای نوێ له‌سه‌ر بنچینه‌ی مادده‌ی (١٢)ی بنه‌ماكانی ویلسۆنی سالی (١٩١٨ز)و به‌پێی مه‌رجه‌كانی‌سیفه‌ری ١٩٢٠و لۆزانی (١٩٢٣ز) دروستبووه له‌دژی عوسمانی، بۆیه‌ش ڕه‌گو ڕیشه‌ی یاسایی و سیاسیی و جوگرافی توركیای نوێ ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ده‌سه‌ڵاتی ئه‌نقه‌ره نه‌ك

[1] بۆیه‌ش لێره به ده‌وڵه‌تیان ناو ده‌مه‌ن (نه‌ك میرنشین)، چونكه خاوه‌نی ئه‌و كۆمه‌ڵگه یاسایی و سیاسیی و ئابوورییانه بوونه كه ده‌وڵه‌تی هاوچه‌رخی له‌سه‌ر دروست بووه، سه‌ره‌ڕای هه‌رێمێكی فراوان زۆرجاریش گه‌یشتۆته به‌غدا.

ئەستەمبول، كێشەو شەڕی نێوانیشیان زۆر دوورودرێژە، لێرە مەودای ئەو باسە نییە، ئەگینا بەڕوونی ئەو ڕاستیانەی سەرەوە دەردەكەوێت.

لە پاش هەموو ئەو ڕاستیانەش بۆ گەڕانەوە بۆ كرۆكی پرسیارەكە، خۆ ئێستاكوا بزووتنەوەی رزگاریخوازی بە پێشڕەوایەتی عەلمانی نەماوە، تەكنۆلۆجیای سەربازی داگیركەر وا گەشەیكردووە مەگەر بە ئیسلامییەكان نەبێ ئەو بەرگرییە ناكرێ، هەرچەندە ناسیۆنالیستە عەلمانیەكانیش رۆڵی خۆیان بینیوە.

بە كورتی قۆناغەكانی بەرگری نیشتمانی لە رۆژهەلات بەچوار قۆناغ ڕەتبووە:

١- لە سەرەتا (كۆتایی سەدەی ١٩) بیری ناسیۆنالیزمی لەرێی لیبرالەكانەوە دروست بوون كە لەگەڵ رۆژئاوا نزیكبوون بە هەرجۆرێك بێت و هەندێ دەوڵەتی نەتەوەییان دروستكرد.

٢- لەدوای ئەوان ناسیۆنالیستەكان بەرگری داگیركەریان كرد و كۆمەڵێك نەتەوە لەسەر دەستیان ڕزگار بوو تا پەنجاكانی سەدەی بیست.

٣- لەگەڵ گەشەی تەكنۆلۆجی سەربازی داگیركەران لەتوانای تەیاری ناسیۆنالیزمی نەما بەرگری بكا پێوستی بە تەیارێكی بەهێزترە لە ئایدیۆلۆژی، ئەویش ماركسی بوون، ئەوەش كۆمەڵێك دەستكەوتی هەبوو لە رزگاركردنی ڤێتنام و كەمبۆدیا و ئانگۆلا و نیكەراگواو زۆر وڵاتی ئەفریقی تر.

٤- لەگەڵ گەشەی زیاتر تەكنەلۆجیای داگیركەر لەسەدەی نوێدا ئێستا ئەو بەرگرییە بە فیكری ماركسیش ناكرێ، بە ئایدیۆلۆژیایەكی بەهێزتری وەك ئایینی دەكرێ، بۆیە ئێستا بەدەگمەن (بزووتنەوەیەكی وەك پەكەكە)، ئەگینا بزووتنەوەی رزگاریخوازی نوێ هەمووی ئایینین، بڕوانە چیچان، فەلەستین، مۆرۆ، كشمیر، خوارووی لوبنانو ...تاد. تەواو بە پێچەوانەوە ئێستا تەیاری عەلمانی و ناسیۆنالیستی لە جیهانی ئیسلامیی دیمەنی زۆر ناشیرین بووە، بەشی زۆریان خەریكی سەوداو گەندەڵی و دیكتاتۆر بازین، بۆیە لە كوردستان و وڵاتانی تریش دەبینین فاكتەری ئایینی مایەی بەهێزكردنی ئینتیمای نیشتمانییە نەك عەلمانی و ناسیۆنالیستەكان، كوا ئەو رۆڵەی ناسیۆنالیستەكان بۆ پتەوكردنی ئینتیمای

کوردایەتی، جگە لەوەش ئەو ناسیۆنالیستیە عەلمانیانەی عەرەب و تورك دوژمنی هەرە سەرسەختی چارەنووسی کوردستانن، بەپێچەوانەوە لایەنە ئیسلامییەکانی وڵاتانی داگیرکەر زۆر لەوان باشترن، هەرچەندە پێویست بوو زۆر باشتریش بن و ئەوانیش ڕەخنەیان لەسەرە ئەگەر پرسیارەکە ڕوو لەوانیش بێت.

**+ گەروایە ئیسلام رێگربووە لەبەردەم لاوازکردنی ئەو هەستە خۆڕسکەدا بۆچی لەپاش رووخانی دەوڵەتی (ماد) و بەر لە هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ کوردستان کورد نەیتوانیوە لەو ماوە زەمەنیەدا قەوارەیەکی هاوشێوەی ئەو دەوڵەتە دروست بکات؟**

مەسعود عەبدولخالق: باوەڕناکەم کەسێکی ئەکادیمی بە مەسئولیەت بدوێ بڵی ئیسلام رێگر بووە جگە لە قسەی بازاڕی، ئینجا دەبێ لەسەر سایکۆلۆجیەتی ئەو پرسیارە بووەستین هەستی نەتەوەیی خۆڕسك نییەو ئەزەلی نییە، زیاتر کاردانەوەو وروژاندنە، نەك هەستی نەتەوایەتی، بەڵکو ئینتیمایەکی نووستوو بە وروژاندن و خیت خیتە دەبزوێ، تەنانەت ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك دابەش بکەی بۆ دوو گروپ (أ) و (ب) و لایەکیان وا بوروژێنێ چ بە شانازی و مەدح چ بەزەم، جۆرێك لە دەمارگیری و هەست بۆ گرووپەکەی دەبێ، هەستی نەتەوایەتی ئەوەندە قووڵ نییە لە مێژووی ئەوروپا لە سەدەی (١٨–١٩) دەست پێدەکا لە کتێبەکانی (گۆپینۆ و هیگل و مازینی و...)، لە بزووتنەوەکانی ناپلیۆن و هەنگاوی یەکخستنەوەی ئەڵمانیا لە ١٨٧١ز لەسەر دەستی (بسمارك) بووە هۆی سەرهەڵدانی هەستی نەتەوایەتی و دواییش بیری نەتەوەیی، دوایی هەر لەرێی ئەوروپییەکان هاتە نێو عوسمانی و ئینجا (ئیتیحادو تەرەقی) لە (١٨٨٩ز) لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بوو، لەنێو عەرەبیش هەریەکە لە (نەجیب عازوری و ناسیف یازجی و بنەماڵەی بستانی و جۆرج ئەنتۆنیۆس و ساتع الحصری و میشیل عەفلەق و هەندێکی تر) ئەو رۆڵەیان بینیوە، یەکەم کۆمەڵەش بە ناوی (الجمعیة السوریة) بوو لە ساڵی (١٨٥٧ز) لەسەر دەستی (بوترس بوستانی و ناسیف یازجی) دروست کرا، خۆ کوردیش لەوانە لەپێشتر کەوتە ئەو کارە، ئەوەتا (د. عەبدوڵڵا جەودەت) و (د. ئیسحاق سکوتلی) هەردوولایان کورد بوون و ئەوان (ئیتیحاد تەرەقی)یان

دروستکرد لە (١٨٨٩ز)، زیاتر لەوەش کوردەکان پێشڕەوی تورك بوون بۆ زیندوکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی تورك لە دژی عوسمانی، یەکەم کەس ئەوەی پیتی لاتینی هێنا ناو عوسمانیش هەر کورد بوو (د. عەبدوڵڵا جەودەت) بوو، زۆر بە دەگمەن تورکێك دەبینیەوە خاوەنی ئەو بەرنامە (دامەزرێنەرەی) بیرو هەستی تورکایەتی و تۆرانی بووبێ. ئەگەر بڕوانینە ئەو ناوانە: (ئەنوەر پاشا، تەڵعەت پاشا، جەمال پاشا، ئەلب کۆك، مەحموود پاشا، نامیق پاشا، تادەگا مستەفا ئەتاتورك) تورك نین، خودی ئەتاتورکیش لە بنەماڵەی (ریس)ی یۆنانییە، زۆربەی مونەزیری تۆرانی بە رەچەڵەك یەهودین، مونەزیری عروبەش زۆربەی مەسیحی شامن، ئەوانەش بەرنامەو نەخشەی تایبەتی هەیە ئەگەر بە وردی بنواڕینە رێکەوتنەکانی جیهانی هەر لە (کارلوفیجە ١٦٩٩ز)، تا دەگاتە کۆنگرەی (پاریس ١٩٠٢، ١٩١٣ز و سایکس بیکۆ و...تاد)، ئینجا بەوردی سەرنج بدەینە (پرۆتۆکۆلات حکماو صهیون).. بەشێوەیەکی ئەکادیمی دەردەکەوێ، ئەوەی لەپشت وروژاندنی هەستی نەتەوایەتی تورك و عەرەب بوو رۆژئاواو یەهودی بووە نەك خۆیان، هەر ئەوانیش عەرەب و تورکیان گەیاندە ئەو جۆرە دەوڵەتانە، کەواتە ئەو نەخشە سیاسییەی ئێستا دوورە لە ئیسلام و بەرهەمی ئەو نییە، ئەوە لەلایەك و لەلایەکی تر لەپێش ئەو مێژووە واتە پێش سەدەی (٢٠) وڵات و کیان و میرنشین لەسەر بنچینەی هەستی نەتەوەیی دروست نەبووە تا کوردیش دروستی بکات، دەوڵەتی (ماد)یش چ پەیوەندی بە هەستی نەتەوایەتی کورد نەبووە، کوا دەوڵەتێك یان ئیمپراتۆریەتێك لەو سەردەمی تا نزیك سەدەی بیست لەسەر بنچینەی هەستی نەتەوایەتی دروست بووە، بۆیە هیچ لەو ئیمپراتۆریەتانەی پێش ئیسلام، (لە ماد، ئاشوری، سۆمەری، .. تا دەگاتە ئومەوی و عەباسی و فاتیمی و ئەیوبی و عوسمانی) موڵکی میللەتێك نین، لەو سەردەمی پەیوەندی سیاسیی و یاسایی نێوان هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسیی نەخەملێبوو، ئەو پەیوەندییە دەگەڕێتەوە بۆ (تەواوەنساڵی ١٩٢٩ز)،[2] ئەوکاتی دەتوانرا سەرکردەیەك بێت

[2] بڕوانە: ١– الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الجولة العراقية..

٢– القانون الدولي في الإسلام..

لەسەر خاکی میللەتێکی تر دەوڵەت دروست بکا، هەروەك عوسمانی لە تۆران ڕاهاتن لە ئەنادۆڵ و ڕۆملی دەوڵەتیان دروستکرد، ئەیوبی لە کوردستان ڕا چوون دەوڵەتیان لە شام و میسر و جەزیرە دروستکرد، (ئەسکەندەری مەقدۆنی لە بابل، موحەممەدی کوڕی ڕۆستەمی فارس چوو لە مەغریب دەوڵەتی دروستکرد..)، ئا بەو شێوەیە بوو، بۆیە ناسنامەی ئەو دەوڵەتانە روون نییە بەپێی ناسنامەی ئەو سەردەمە، هەربۆیەش ناکۆکی زانستی هەیە لەسەر ساغکردنەوەی ناسنامەیان، لەکاتێکدا (د. ئەحمەد سوسە) ئاشوری و کلد و سۆمەری بە بناغەی عەرەب لە عێراق دەژمێرێت، (عەبدوڵڵا ئۆجەلان)یش بە کورد، کەچی نەوەیان ماوە نە عەرەبن و نە کورد، هەر ئێستاش نەوەی ماد کیانێکی بچووکن لە خوارووی چین، تەنانەت گەلێ دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتەکان مەرج نەبووە لەو میللەتە بێت، (ئەردەشێر و کەریم خانی زەند) کورد بوونە ئیمپراتۆریەتی فارسیان دامەزراندوە، قاجاریەکان تورك بوونە.. بەو شێوەیە، بە دەگمەن نەبی ئەو جۆرە مێژووی کاریگەری لەسەر نەخشەی جیهانی سیاسیی نوێ نییەو فاکتەری نەبوونی دەوڵەتی کوردی کەمتر پەیوەندی بەو جۆرە چالاکیە سیاسییە مێژووییە هەیە، سایکۆلۆجیەتی ئەو پرسیارە وای لێدەخوێندرێتەوە کە گوایە هاتنی ئیسلام بووبێتە هۆی ئەوەی کورد نەبووەتە خاوەنی کیانی سیاسیی و دەوڵەت، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە لە پێش ئیسلام کورد دابەشکرابوو لەنێوان رۆم و فارس هەر جارەی لایەك دەهاتن و داگیریان دەکرد، بەتایبەتی فارس کوردستانی کردبووە مەیدانی بەدڕەوشتی و جۆرە ڕاڕەوێکی بەدڕەوشتی مانی و مەزدەکی وای لێ بڵاوکردبۆوە کەس خاوەنی خاووخێزانی خۆی نەبوو، سیستمی شەوی یەکەمی بووکێنی دەبووایە بەلای کێخواکانی سەر بە کیسرا ڕەت بێت، بەو شێوەیە کوردستان داگیرکرابوو لە بارێکی سەختی ئابووری و سیاسیی و کۆمەڵایەتی بوو پەرێشانی رزگارکەرێك بوو، بۆیە وا هاریکاری سوپای ئیسلامیان کرد، ئەو سوپایەی کە پێکهاتبوو لە سوپای (الحمرا)ی سەر بە (دێلم)ی کورد کە لە قادسیە بەدواوە سەرکردایەتیی وەرگرت لە خوارووی بەغدا تا (ئیقلیمی الجبال - کوردستانی ئێستا)، کورد لەدوای ئەو مێژووەو بووە خاوەنی کیان و دەوڵەتی

خۆی و بووە خاوەنی زاناو شارستانی و فەرهەنگ، ئەگینا بەشی هەرە زۆری کورد و عەرەب و تورك میللەتی بەدەوی و رەوەند بوونەو خاوەن شارستانییەت نین، هەرچی نەریت و کولتوور و فەرهەنگی چاکە بۆ ئایینەکە دەگەڕێتەوەو فەرهەنگی پەلامارو ڕێگری و زۆرداری بۆ بەهای رەسەنی ئەو میللەتانە دەگەڕێتەوە.

بێجگە لە هەندێ ماوەی مێژوویی کەم نەبێ کوردستان داگیرنەکراوە تا سەرەتای سەدەی (١٩) کە سیستمی لامەرکەزی هەڵگیرا لە سەردەمی عوسمانی لەلایەن نامیق پاشاو مەدحەت پاشاو هەندێ کەسانی تری غەرب پەروەر، ئەگینا رێکەوتننامەکەی شێخ ئیدریسی بەدلیسی و سوڵتان سەلیم کە لەساڵی (١٥١٤ز) بەسترابوو– لەگەڵ هەندێ پێشێلکاری لە هەردوولا – بەکاربوو تا ئەوساتی،کەواتە سەلماندنی ناوێ ئیسلام رێگربێت بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی و پەیوەندییەکی بەو فەترە مێژووییەی نێوان هاتنی ئیسلام و دەوڵەتی ماد نییە، تەواو بە پێچەوانەوە لەگەڵ کزبوونی ئیسلامیی سیاسیی لەسەدەی (١٩) دوای لەناوبردنی بەیەکجاری لە (١٩٠٨ز) تاکو (١٩٢٤/٣/٣ز) لەو فەترەیەش مەینەتی کورد دروست بوو.

**+ مێژووی دورودرێژی کورد وابووە سەرکردەو دەسەڵاتدارەکانی میرنشین و شۆڕش و ڕاپەڕینەکان کەسانی ئایینی بوون، ئایا بۆچی ئەمانە نەیانتوانیوە تەنانەت لەژێر کاریگەری ئایینیشدا بێت، بیر لە پرۆژەیەکی لەو شێوەیە بکەنەوە کە میللەتەکەیان لە قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك رزگار بکەن؟**

مەسعود عەبدولخالق: دووبارە دەبێ لەسەر باری دەروونی زەمینەی ئەو پرسیارەی لێ هەڵقوولاوە بووەستین، کە دەڵێن دابەشی و بێبەشکردنی کورد لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئاوا ستاندەری عەقڵی سیاسیی کوردی لەرزۆك کردووەو زۆر بە زەحمەت لێقل دەبێ، مەبەستمان ئەوەیە بە پێچەوانەی ئەو پرسیارە کورد لەمێژووی سیاسیی خۆی کەمتەرخەم نەبووە، تا سەدەی (٢٠) وەك میللەتانی تر بووە، با نموونە بە عەرەبی عێراق بهێنینەوە کە بوونە دەوڵەت، کوا لەپێش ساڵی (١٩٢١) دەوڵەتی عێراقی– جگە لە نموونەی میرنشینی بچووك لە بەسرەو (فوراتی ناوەڕاست) دروست بووە بە لاوازی، ئەگینا کوا کیان و بوونی

سیاسیی عەرەب، هەر ژێردەستەی فارس و تورك و كورد و مەملوك بوونە، تەنانەت داود پاشا كه لەدایكبووی تەفلیسه له جۆرجیا و بە فرۆشراوی هێنرایه بەغدا وەك بەندەیەك بۆ كڕین و فرۆشتن، له بەغداش چەند جار كڕاو فرۆشرا، ئینجا ئەوە له بەغدا بەسەر عەرەب بووە حوكمدار، كوا له كوردستان نموونەی وا هەیە، خەڵكی تر نەیانتوانیوە بێن له كوردستاندا حوكم بكەن، زانایان و سەركردەی كوردی ئایینی ئەركی خۆیان بێ كەموكوڕی لەو ڕووەوە بینیوە، چ له میرنشین دروستكردن چ له دەوڵەت له ئیمپراتۆریەتی وەك ئەیوبیش، كوردستانیان پاراستووەو بە دەسەڵاتی خۆیان، تا نیوەی سەدەی (١٩)ش دوا میرنشین (بۆتان) بوو لەژێر فەرمانداری بنەماڵەی بەدرخان، ئیتر كاتێ ڕۆڵی ئایین و خیلافەتی ئیسلامیی و زانای ئایینی كەم بووەوەو نۆرەی عەلمانییەت و بیری نەتەوەیی و هێزەكانی هاوپەیمانان هات ئینجا كورد كەوتە مەینەتی.

لەو پرسیارە وادەردەكەوێ كه خەڵكی تر لەسەر ئایینەكانی عەرەب و تورك و چەركەس و ئەوان ئەو ئیشەیان بۆ میللەتی خۆیان كردبێ، كوا یەك نموونەی وا نییە، باسی وڵاتانی عەرەبمان كرد چۆن دروست بووە لەسەردەستی ئیمپریالیزم، تەنانەت توركیاش لەسەر دەستی كەسە ئایینی و سوڵتانەكانی عوسمانی دروست نەبووە، توركیا بەرهەمی ماددەی (١٢)ی بنەماكانی ویلسۆن (١٩١٨ز)و مەرجەكانی سیفەرو لۆزانی (١٩٢٣ز)و سیناریۆیەكی ئاڵۆزی نێوان ئەتاتۆرك و هاوپەیمانان بووە، نەك بەرهەم و درێژكراوەی عوسمانی بێت، له عێراقیشدا شۆڕشی بیست بە سەركردایەتیی زانایانی ئایینی وەك (أ.محمد شیرازی، محمد شەهرستانی) و سەركردەكانی تر، ئەوانە بوون، ئەویش وەك شۆڕشە ئایینیەكانی ئەم دواییەی كوردستان سەركەوتوو نەبوو تا بڵێین عێراقی نوێ له بەرهەمی ئەوانەیە، نەخێر زۆربەی شۆڕشەكانی ئایینی لەسەرەتای سەدەی بیستەم لەجیهانی ئیسلامیی شكستی هێنا، ئینجا ئەو نەخشە سیاسییە لەسەر كەلاوەی ئەوان دروست بووە نەك لەسەر بینای ئەوان، واتە ئەو خاڵە پەیوەندی بە مەینەتی كوردەوە نییە.

كەواتە:

١– ئەو مێژووەی ئێستا بۆ کورد دەنووسرێتەوەو بلاو دەکرێتەوە، نەك هەر دوره لەڕاستی، بەڵکو گەلێ زیان بەخشیشه بۆ دۆزی کورد.

٢– هەندێ ڕاستی تێدایه بەلام وای لێ هەڵبژێردراوه که دیوه ڕووناکەکانی فەرامۆشکراوه.

٣– بەکورتی و ڕاشکاوی لەگەڵ هاتنی عەلمانیەت و هەڵمەتەکانی ئیمپریالیزمی و نەخشەی مەزنی دەوڵەتی ئیسرائیل ئەو کێشەیه دروست بوو.

٤– سەرەتای مەینەتیەکەی دەگەڕێتەوه بۆ فەترەی ١٩٠٨– ١٩١٦– ١٩٢٤ز.

٥– دەروازەکانی سەرکەوتن و رزگاربوونی کورد ئەو هەنگاوه پێچەوانانەیه که لەو فەترەیه ڕوویاندا.

هەر لەوانەش بنەمای ئاسایشی نەتەوەیی کوردی لێ دەتاشرێ.

**+ ڕاسته لەگەل سەرهەڵدانی دەسەلاتی عوسمانی کورد توشی نوشستی بووه ؟**

مەسعود عەبدولخاق :دەبێ بزانین کە ئێمە باسی چاکەی عوسمانی و خەلافەتەکانی تر دەکەین بە نسبیەت ئیستاوه باشه ئەگینا ئەوانیش بەشی زۆریان دەسەلات خواز بوون، برای یەکتریان کوشتووه لەپێناو دەسەلات،چۆن تەماحیان لە کوردستانیش نەبووه، بەلام ئەو تەماح و داگیرکاریانە شێوازی نەتەوەگەری نەبووه،کاتێ سیستمی مەرکەزی لەلایەن لائیکیەکانی وەك نامیق پاشا و مەدحەت پاشا لەکۆتایی سەدەی ١٩بە سەر عوسمانیدا چەسپا، ئەوا کیانە سیاسیەکانی کورد وعەرەب وچەرکەس وهەتا ئیمارەتی تورکمانی لە ئەنادۆلیش تێك چوو، کوردیش لەکاتی دەسەلاتا وابووه ،سەرەڕای هەمووئەوانەش بەگشتی سەردەمی خەلافەت وسەردەمی عەلمانیەت بەراورد ناکرێ،وەك لەو خشتەکە بەراوردەی خوارەوه دەردەکەوێ،دەریش دەکەوێ کەهاتنی عوسمانی نوشستی نەبووه ،بەڵکو هاتنی عەلمانیەت و ئایدۆلۆژیای نەتەوەیی بووه نوشستی بۆ کورد.

خشتەی بەراورد بۆ کێشەی کورد هەڵوێستی خەلافەت و عەلمانی تۆرانی

| دەسەڵاتی ئەنقەرەی عەلمانی(ئەتاتورك)(لەکۆتایی سەدەی ١٩ تا ٢٠٠٥ز) | دەسەڵاتی خەلافەت لە ئەستەمبۆل(سەدەی ١٣ تا ١٩٠٨) |
|---|---|
| ١-بیرێکی عەلمانی نەتەوەگەری تۆرانی.<br>٢-بنەماکانیان دژ بە ئیسلام و کورد بوو<br>٣-رێککەوتنی سیڤەر و مادەکانی ٦٢ و٦٣ و ٦٤ بە مەرگی تورکیای نوێ ژمێرکردوە<br><br>٤-هیچ رێکەوتنێکی مۆرکراوی نەبوو لەگەڵ کورد، هەر بەڵێنی زارەکی بوو.<br>٥-بواری هیچ چالاکیەکی سیاسیی و رەوشەنبیری کوردی نەدەدا.<br>٦-لۆزانی هێنایەدی.<br><br>٧-دوای هەموو کوردی قڕکرد.<br>٨-سەرەنجام ئەنقەرە سەرکەوت و میللەتی کورد کەوتە ئەو مەینەتیە تا ئێستا.<br><br>٩-ناو وزمانی کوردو کوردستانی قەدەغە کرا<br>١٠-بە تیکڕایی تا خەلافەت مابوو سەرجەم کورد خاوەنی ٦٤دەوڵەت و | ١-بیرێکی ئیسلامیی عوسمانی بە لاوازی.<br>٢- دژایەتی کوردی تیا نەبوو.<br>٣-سێڤری مۆرکرد<br>٤-رێککەوتنی دووبەدووی نێودەوڵەتیشی مۆرکردبوو بۆ سەربەخۆیی کوردستان<br>٥-چالاکی سیاسی و ڕۆشنبیری حزبی هەموو لە ئەستامبۆل بوو<br>٦-بەشداری لۆزان نەبوو تەنها لەسێڤر بەشداری کرد<br>٧-لەگەڵ کەوتنی ئەستەمبۆڵ هەموو حزب و ڕۆژنامە و ناوەندە کوردیەکانی لێ داخرا<br>٨-هەتا خەلافەت مابوو کورد سەربەخۆ بوو، ئەگەر خەلافەت سەرکەوتبایا ئێستا کوردستان لەریزی میللەتان بوو.<br>٩-نەك ویلایەت هەتا ئیالەتیش بە ناوی کوردستان بووە[3].<br>١٠-لە سەردەمی عەلمانی نەك هەر |

[3] بڕوانە نەخشەی عوسمانی سالی ١٨٩٣- ویلایەتەکانی بەشی ئاسیا .

| | |
|---|---|
| میرنشین وكیانی سیاسیی بوو.<br>١١–سنوری كوردستان وه‌ك خۆی گه‌وره‌ بوو | كیانی سیاسی،به‌لكوبه‌ هاوولاًتی پله‌ ٢و٣ وكیمیایی وئه‌نفال ده‌كرێ.<br>١١–سنوری ئیستای كوردستان نیوه‌ بووه‌ . |

**+ هه‌ندێك ده‌لێن چۆن شیخ ئیدریس له‌ سه‌ده‌ی ١٦و مه‌لای خه‌تی له‌ سه‌ده‌ی ١٩وئاواش شیخ عبدالقادر له‌سه‌ده‌ی ٢٠بوه‌ هۆی شكستی كورد به‌ هاریكاری له‌گه‌ڵ كمال ئتاتورك؟**

مه‌سعود عه‌بدواخالق: ئه‌وه‌ جۆره‌ گوتارێكه‌ زاده‌ی هاوسه‌ریه‌تیه‌كی بێ ماره‌یی نێوان فیكری ماركسی و فكری ته‌غریبیه‌ بۆ كورد دروست بووه‌،كۆن و سكرابیش بووه‌ ،سه‌رده‌مێك بوو ده‌بوایه‌ هه‌رچی هه‌یه‌ له‌ مل ئاینی بپێچی،له‌سه‌ر ئه‌و بنچینه‌یه‌ ڕه‌خنه‌ی بێ بناغه‌ له‌ ته‌واوی مێژووی كوردو سه‌ركرده‌ ئاینیه‌كانی وه‌ك عوبه‌یدوڵلاً و شیخ سه‌لام وشیخ سه‌عید و شیخ مه‌حمودو قازی و بارزانی گیراوه‌ .

له‌وه‌و پێش باسی شیخ ئیدریس ومه‌لای خه‌تێمان كرد،ئه‌وه‌ی زۆر زوڵمه‌ له‌ شیخ عبدالقادره‌ چونكه‌ ته‌واو به‌ پێچه‌وانه‌ ئه‌و له‌ دژی ئه‌تاتورك بوو،خۆشی سه‌رۆكی ئه‌نجومه‌نی ده‌وڵه‌تی عوسمانی له‌ ئه‌سته‌مبوڵ بۆ زیاتر ڕوون كردنه‌وه‌ پێویسته‌ هه‌ڵوه‌سته‌یه‌كی خێرا له‌ ناكۆكی سوڵتان و ئه‌تاتورك و هه‌ڵویستی كوردی بكه‌ین :

له‌ساڵه‌كانی ١٩٢٠به‌دواوه‌ دوو حكومه‌تی دژ به‌یه‌ك له‌نێو عوسمانی دروست بوو،یه‌كیان عه‌لمانی له‌ ئه‌نقه‌ره‌ به‌ سه‌رۆكایه‌تی ئه‌تاتورك ،ئه‌وی تریش له‌ ئه‌سته‌مبول به‌سه‌ركردایه‌تی سوڵتان موحه‌مه‌د واحدالدین ،هه‌ڵویستی سوڵتان ئه‌وه‌یه‌ كه‌له‌ خشته‌ به‌راورده‌كه‌ی سه‌روو ڕوونمان كردۆته‌وه‌ ،هه‌روه‌ها هه‌ڵوێستی ئه‌تاتورك و ئه‌نقه‌ره‌ش له‌ هه‌مان خشته‌دایه‌،...له‌ نێو كورد دابه‌شیه‌كیش په‌یدا بوو،عه‌لمانیه‌ كورده‌كانی وه‌ك (حسن خه‌یری و برنجی زاده‌ و زولفی به‌گزاده‌ و ئه‌لب كۆك و ره‌فیق حیلمی و...) لایه‌نگیریه‌كی به‌توندی ئه‌تاتوركیان كرد،هه‌رچی شیخ عبدالقادرو شیخ سعید وسعید نه‌وره‌سی ..)پێیان وابوو ئه‌تاتورك فێڵه‌ له‌كوردی ده‌كاو ئه‌و ده‌سكه‌وتانه‌ی له‌ ئه‌سته‌مبۆل وسوڵتان هاتبووه‌ دی

لەباردەبا،تەنانەت شیخ عەبدولقادر بە عەلمانیە كوردەكان دەڵێ : ئەوە سولْتان خەریكە سەربەخۆیی دەدا مەچنە بەرەی ئەتاتورك ئەگەر بەریتانیا ڕاست دەكا بەئەندازەی سولْتان ئەو مافەمان پێ دەدا لەگەلی ڕێك دەكەوین،بۆ زیاتر سەیری ئەو بەلگەنامانەی بەریتانی بكە:

## دکتۆر حەکیم ئەحمەد، مامۆستا لە زانکۆی صەلاحەددین



**بە درێژایی قۆناغە مێژووییەکان سەلمێنراوە ڕۆحیەتی ئاینی ئیسلام، هەمیشە فاکتەرێکی هاندەر بووە بۆ بزواندنی فیکر نەك چەقاندنی، بە مەرجێك ئەم فیکرە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بووبێت.**

- له سالّی ١٩٦٦ لەدایکبووه.

- قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی وئامادەیی له کۆیه تەواوکردووه.

- ١٩٩٦ بڕوانامەی ماستەری له زانکۆی صەلاددین، بەشی مێژووەرگرتووه

- ٢٠٠٣ بڕوانامەی دکتۆرای له مێژووی کورد له سەردەمی ئیسلامدا له زانکۆی صەلاحەددین وەرگرتووه

- سەرپەرشتی و تاووتوێی چەندان نامەی ماستەری زانکۆکانی صەلاّحەدین و سلێمانی و دهۆکی کردووه.

- ئێستاش مامۆستایه له بەشی مێژوو له کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین .

- ئەندامی کۆمەڵەی مێژوونووسانی کوردستان بووه که له ١٩٩٢ز له هەولێر دامەزرابوو.

- دەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستانه .

- ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (مێژوو)ه له هەولێر.

سـەرەتا دەبێـت ئـەوە بـزانین کـە خوێندنـەوەی مێـژوو و حوکمـدان لەسـەر ئاراستەو ڕووداوەکانی و لێکدانـەوەیان بـە ئاراسـتەیەکی دیـاریکراو بـە شـێوەیەك کە خزمەت بە بیرو بۆچوونی یاخود تێڕوانینی تایبەتی کەسێك یان لایەنێك بکـات لە ڕووی تیۆرییەوەو زارەکیانە کارێکی ئەوەندە ئەستەم نییە کە نـەکرێت، بـەڵکو ئاسانیشە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بـۆ ئـەم بـڕو ژمـارە زۆرەی گێڕانـەوە (ریوایەتـە) مێژووییەکان کە لەناو سەرچـاوە جـۆراو جۆرەکانـدا هـاتوون و زۆر جـاری وا هەیـە پێچەوانەی یەکترن و دژ بەیەکن.

مەبەست ئەوەیە کاتێك کەسێکی (نەتەوەیی) یان (ماددی) یان، دەیەوێت ئاراستەی لێکدانەوەی ڕووداوە مێژووییەکان بە وردو دروستییەوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ڕووانگەی ئایدیای تایبەتی خۆیەوە لێکبداتەوە کە ناودەبرێت بە (تێڕوانینی پێشوەختە بۆ مێژوو) کە حوکم و بڕیاری پێشوەختەو ئامادەکراو (جاهز)ی لەسەر بنیاد دەکرێت، ئەوا بە ڕاستی مێژوو بە هۆی دەوڵەمەندی و بەرفراوانیەکەی بە بەریەوە هەیەو بۆ کەسی (مەبەستدار) دەلوێت ئەم کارە بکات.

بەڵام نابێت ئەو ڕاستیەمان لەبیر بچێت کە هەر کەسێك، ڕۆشنبیرێك، نووسەرێك، مێژووناسێك، ئاوا بیربکاتەوەو هەوڵبدات بۆچوونێکی (هزری)ی پێشوەخت (سۆزدرانە) بسەپێنێت بەسەر ڕووداوە مێژووییەکان لە هەر سەردەم و قۆناغێکدا ڕوویاندابێت، بەتاڵکردنەوەی مێژوو لە جەوهەرو ڕاستیەکەی و ئەوکات توێژینەوەی مێژوویی لەسەر بنچینەو بنەما زانستیەکان هیچ نرخ و بەهایەکی نامێنێت، بەڵکو مێژوو دەبێتە ماددەیەکی ئایدیۆلۆژی، سیاسیی یان ڕاگەیاندکاری و بۆ چەندین مەبەستی دوور لە ڕاستی بەکاردەهێنرێت کە لە حەقیقەتدا ئامانج لە مێژووناسی ئەوە نییە !

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە قسەکردن لەسەر مێژوو بە شێوەیەکی ڕەها هەڵەیەکی تری گەورەیە کە زۆر کەس تێیدەکەون بە مەبەست بێت یان بێ مەبەست، نا بەڵکو کارەساتە کاتێك کەمترین بوار بۆ (ڕێژەیی)مێژوو بهێڵێتەوە،

کە لە پەراوێزێکی بەرتەنگدا خۆی بنوێنێت، کەچی لە ڕاستیدا پەراوێزی ڕەهایی لە مێژوو و لێکدانەوەی مێژووییدا زۆر بەتەنگترە نەك بە پێچەوانەوە.

دیارە (ڕەهاییانە) ڕوانینە مێژوو دەمارگیری لێدەکەوێتەوە کە ڕێگرو بەربەستە لەبەردەم تێگەیشتنی ڕووداوە مێژووییەکان و هەرسکردنیان و لێکدانەوەیان بە شێوازێکی زانستیانەو تەندروستانە، هەروەها بەربەستە لەبەردەم گەیشتن بە ڕاستیە مێژووییەکان، یاخود هەوڵدان بۆ نزیکبوونەوە لێیان.

بە واتایەکی تر ئەم دەمارگیرییەی کە زادەی تێڕوانینی پێشوەختەی ڕووداوەکان و ڕەهاییانە ڕووانینە لە مێژوو، دەبێتە هۆی دروستکردنی تارماییەکی گران و باڵدەکێشێت بەسەر هەر ئاسۆیەکی ڕوونی دەرکەوتنی ڕاستییەکان.

دەرەنجامیش ئەم جۆرە تێڕوانین و بیرکردنەوانە هیچ خزمەتێك نە بەرەوتی زانستی و نە بەرژەوەندی نەتەوەیی و تەنانەت مرۆڤایەتیش ناکات، جگە لە تێرکردنی کۆمەڵێك حەزو ویست و نەزەواتی دەروونی سۆزداری کورتبینانە، کە نەك بۆ ئەمڕۆ، بەڵکو بۆ ئایندەی میللەت و کۆمەڵگەش زێدە مەترسیدارە. یەکێك لە خاڵە هەرە نێگەتیڤەکانی ناو کەسایەتی کوردی ئەوەیە کە شکست و نسکۆکانی دەخاتە ئەستۆی کەس و لایەنی تر و زۆر بە ئاسانی پاساویان بۆ دەدۆزێتەوە. بێگومان زەحمەت نییە هۆکاری گشت نەخۆشی و کەموکورتیەکانت بگەڕێنییەوە بۆ (وەهم)ی هۆکاری دەرەکی و بۆ خۆشت بۆی دەرچیت.

بەڕاستی نەهامەتی و نوشوستیەکانی کورد هەر لە دێرزەمانەوە تاکو ئەمڕۆ زۆرن، زۆرجاریش جەخت دەکرێتەوە لەسەر فاکتەری جوگرافی، سیاسیی، دەوروبەر...هتد، کەچی فاکتەری خودی (ذاتی) فەرامۆش دەکرێت یان بچووك دەکرێتەوە.

ڕاستە هەریەك لەم فاکتەرانە کەم یان زۆر ڕۆڵی خۆی بینیوە، بەڵام فاکتەری هەرە گرنگ خودیەکەیە کە پەیوەستە بە پێکهاتەو بونیادی دەروونی–

کۆمەڵایەتی– ئابووری تاکی کورد وەتاکو ئەمڕۆش ئەم فاکتەرە ئامادەگی تەواوی هەیە و ڕۆڵی کاریگەر دەبینێت.

**+ زۆرێك لە ناسیۆنالیستە کوردەکان پێیانوایە ئیسلام بە حوکمی ئەوەی مێژووی ئامادەگی بوونی لە کوردستاندا ڕیشەیەکی قووڵی هەیە و حزوری سیاسیی بەردەوام بووە ڕۆحیەتی ئایینەکە فاکتەری نەهێشتن و کوشتنی هەستی نەتەوایەتی و فیکریی بووە بەبەردەوامی لە بەردەم تاکی کورددا کە هەرگیز لە بیری دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەییدا نەبێت، بەڵگەی مێژوویمان لەم بارەیەوە هەیە؟ گەروایە، ئایا ئیسلام ڕێگر بووە لە بەردەم لاوازکردنی ئەو هەستە خۆڕسکەدا کە کورد نەتەوەیەکی موسڵمان بووە ؟**

دکتۆر حەکیم: دیارە ئایینی ئیسلام وەکو ئاینێکی ئاسمانی و دوایین پەیامی خودایی، ئامانجی تەواوکاری ئایینی و پەیامەکانی پێش خۆی بووەو تەنها بریتی نییە لە چەند بەندوبارو تقوسێکی موجەررەد کە هیچ پەیوەندی بە لایەنی ژیان و ژیارەوە نەبێت، بەڵکو کاتێك سەیری تێکستە ئایینیەکانی ئیسلام دەکەین چ ئەوانەی لە قورئان هاتووە و چ ئەوانەش لەسەر زمانی پێغەمبەر گێڕدراونەتەوە بە فەرموودەی ڕاست (صحیح) ناودەبرێن، دەبینین گوزارشت لە سەرجەم حاڵەتە ماددی و مەعنەویەکانی تاك و کۆمەڵگا دەکەن و بوارە جیاجیاکانی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابووری و...هتد دەگرێتەوە، تەنانەت ئەرك و فەریزە ئایینییەکانیش لە نوێژو ڕۆژو و زەکات و حەج... بۆ ئەوە دانراون کە ڕەنگبدەنەوە لەسەر واقیعی تاك و کۆمەڵگە واتا بەیەك بەستنەوەی هەردوو ژیانی دونیاو دواڕۆژ، هەرکاتێك ئەمە ڕووینەدا، ئەوا فەلسەفەی ئیسلام نەهاتۆتەدی و بە ئاقارێکی تردا بردراوە، لە لایەکی تریشەوە ئیسلام وەك ئایدیۆلۆژیایەکی گشتگیرو کۆگیر چەندین نەتەوەو زمان و ڕەگەزی لەخۆوە گرتووە کە بە پێی تێکستی قورئانی پێغەمبەرەکان وابەستەی (برایەتی ئایینی) کۆیان دەکاتەوەو دەبنە پاڵپشتی یەکترو باری یەکتری سووکدەکەن و لە خۆشی و ناخۆشیدا بەیەکەوەن، کەواتە سنوورە جیاکەرەوەکانی نێوان کۆمەڵێك و کۆمەڵێکی تری کە بە هۆی جیاوازی زمان یاخود جوگرافیا یان هەر شتێکی تر

حزووریان دەبێت، لە ڕێگەی ئەم ئایینەوە دەپووکێتەوە و سووک دەبن، بەڵام نەك بەو مانایە کە (نەتەوە)و (میللەت)و (ڕەگەز)و (زمان) ڕەتبکرێتەوەو بە فەرمانێکی ئایینی (ئاسمانی) هیچ حیسابێکیان بۆ نەکرێت، چونکە ئەم ئاخاوتنە تەواو پێچەوانەی تێکستەکانە وەك ئەو ئایەتە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾، **هەروەها ئایەتی** ﴿إن في اختلاف السنتكم وألوانكم لآيات..)، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بوونی چەندین میللەت و هۆز و کۆمەڵی جیاواز ویستێکی خوداییەو و ڕەتکردنەوەی پێچەوانەی ئەم ویستەیە، هەروەها ئەمە دەگەیەنێت کە پەروەردگار بوونی چەندین نەتەوەو زمان و ڕەنگ و ڕەگەز بە یەکێك لە بەڵگەو نیشانەو ئایەتەکانی گەورەیی و بە توانایی زاتی خۆی دادەنێت، جا سڕینەوەیان و پەراوێزخستنیان لەژێر هەر پەردەیەك بە هەر پاساوێك بێت قەدەغەو حەرامە.

هەروەها لە فەرموودەیەکدا هاتووە: (خيركم المدافع عن عشيرته مالم يأثم) واتا: باشترینتان ئەوانەن کە بەرگری لە قەوم و کەسوکارو ئەو کۆمەڵەیە دەکات کە ئینتیمای بۆی هەیە (نەك ئینتیمای ئایینی) بەڵکو (ڕەگەزی و ڕەچەڵەکی) بە مەرجێك لەسەر حەق بێت نەك ناحەق.

کەواتە دەکرێت بەپێی یاساکانی ئیسلام کە لە ڕووی واقیعی مێژووییشەوە سەلمێنراوە، نەتەوەو کۆمەڵەو ڕەگەزە جیاجیاکان بەیەکەوە بژین و تایبەتمەندی خۆیان بپارێزن لەڕووی داب و نەریتو شێوازی ژیانیان، بەڵام هەموویان لەژێر یەك چەتر کە ئایینی ئیسلامە کۆببنەوە و لە ڕووی بیروباوەڕی ئایینیەوە هەموو ئەندامانی ئەم کۆمەڵ و نەتەوانەوە، بە پەیوەندی برایەتی ئیمانیەوە گرێ دەدرێن و تەواوکەری یەکترن و هاوکاری یەکترن لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەمەش بە حوکمی ئەوەی ئایینی ئیسلام ئاینێکی جیهانی گشتگیرو (ئومەمیە)، بەڵام لە هەمانکاتیشدا داندەنێت بە تایبەتمەندیەکان بە مەرجێك پێچەوانەی بنەما چەسپاوو نەگۆڕەکانی ئیسلام نەبن کە دیاریکراون.

لە لایەکی تریشەوە ڕۆحیەتی ئایینی ئیسلام کە بە درێژایی قۆناغە مێژووییەکانی سەلمێنراوە، هەمیشە فاکتەرێکی هاندەر بووە بۆ بزاوندنی فیکر

نەك چەقاندنی، بە مەرجێك ئەم فیکرە لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بووبێت، نەك بردنی بە ئاقارێکی نادیارو ئەفسوناوی و گوماناوی، هەر بۆیەش موسڵمانەکان هەر لە سەرەتای ئیسلامەوە بە تایبەتی لە ماوەی حوکمڕانی عەباسیەکان بە شێوەیەکی کراوە مامەڵەیان لەگەڵ پاشماوەی بەرهەمە ژیاریەکانی نەتەوەکانی پێش ئیسلامدا کردووە لە کولتوری فارسەکان و هیندیەکان و سریانەکان و گریکەکەکان و ڕۆمەکان و زۆر لە بەرهەمەکانیان وەرگێڕا سەر زمانی عەرەبی و لە فەوتان پاراستیان، کە دواتر جارێکی تر لە سەردەمی ڕێنیسانس، ئەوروپیەکان گەڕانەوە سەریان و کردیان بە سەرچاوەی بووژانەوەیان لە هەموو ڕوویەکەوە.

پێویستە ئەوەشمان لەبیرنەچێت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە ئیسلامیی تێدا دەرکەوت، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا سەردەمی ململانێی ئاینی بوو، هەردوو جەمسەر لە ژێر چەتری هەردوو ئاینی مەسیحی و ئیسلامدا لە ڕکابەریدا بوون، دیارە هەڵمەت و پەلامارەکانی خاچدروشمەکان کە چەندەها میللەت و ڕەگەزی ئەوروپی بەشداریان تێداکردو هێرشیان هێنایە سەر جیهانی ئیسلامیی (ڕۆژهەڵات) لەژێر دروشمی (خاچ) بوو، موسڵمانانیش بە کوردو تورك و عەرەبەوە کە ڕووبەڕووی ئەم پەلامارانە بوونەوە کە ماوەی نزیکەی دوو سەد ساڵی خایاند لەژێر دروشمی (لا إله الا الله محمد رسول الله) بوو، لەبەر ئەوە چاخەکانی ناوەڕاست بە (چاخەکانی باوەڕ) ناودەبرێت هەروەکو مێژوونووسی بەناوبانگی میسری سەعید عەبدولفەتاح عاشور لە کتێبی (الحركة الصليبية) باسی دەکات.

جا بە ڕاستی ئێمە تاوەکو لە ئایدیاو بیروباوەڕو لایەنی هزریی کۆمەڵێك و سەردەمێك بەگشتی تێنەگەین ناتوانین ڕووداوە مێژووییەکان لێکبدەینەوە، چونکە هەر ئەم هزرەیە کە ڕووداوەکە بە ئاراستەیەکی دیاریکراو دەبات، بۆیە هەندێك دەڵێن: (مێژوو، سەراپای مێژووی هزرە)، چونکە هەر هزرو شێوازی بیرکردنەوەیەکە ڕووداوە مێژووییەکان دروست دەکات.

که‌واته هه‌روه‌ك پێشتر باسمانکرد ئیسلام به هیچ شێوه‌یه‌ك ڕێگر نه‌بووه له‌به‌رده‌م لاوازکردنی ئه‌و هه‌سته (فطري)یه (خواڕسکه)، به‌ڵکو داوای پاراستنی کردووه، به‌مه‌رجێك سنوور نه‌به‌زێنێت و هه‌ستی تاکه‌کانی نه‌ته‌وه‌یه‌کی تر بڕوشێنێت یان په‌راوێزیان بکات.

ده‌وڵه‌تی (ماد)یش خۆ ده‌وڵه‌تێك نه‌بووه له‌سه‌ر بنچینه‌ی (نه‌ته‌وه‌یی) دامه‌زرابێت، به‌ڵکو ئیمپراتۆریه‌تێکی به‌رفراوان بووه که چه‌ندین نه‌ته‌وه‌و میلله‌ت و کۆمه‌ڵی به‌خۆوه گرتبوو، ئیتر له دوای ڕووخانی ئه‌م ده‌وڵه‌ته‌و تاوه‌کو گه‌یشتنی ئایینی ئیسلام بۆ کوردستان، حاڵه‌تێکی نه‌هاوشێوه‌و نه زۆر بچووکتریش دووباره نه‌بۆوه به‌ڵکو مێژووی کورد له‌و ماوه‌یه زۆر لێڵاوییه و ئه‌گه‌ر نه‌ڵێین هه‌ر به ته‌واوی نادیاره.

ناسیۆنالیزم به مانا تازه‌که‌ی و له ڕێڕه‌وی مێژووی مرۆڤایه‌تی، به ئه‌وروپاوه په‌یوه‌سته، چونکه گوزارشتێکی سیاسیه بۆ گه‌ڵاڵه‌بوونی نه‌ته‌وه ئه‌وروپیه‌کان و هه‌روه‌ها بۆ دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ته‌کانیان. وه هزری ناسیۆنالیستی له ئه‌وروپا بێنه‌و به‌رده‌یه‌کی گه‌وره‌ی له نێوه‌نده‌کانی هزرمه‌نده ڕۆژئاواییه‌کان نایه‌وه، بۆ چه‌ند به‌شێك پۆلێنکرا وه‌ك: ناسیۆنالیزمی خێر و ناسیۆنالیزمی شه‌ڕ...هتد، له‌لایه‌کی تریشه‌وه به چه‌ند ئاراسته‌یه‌کدا گه‌شه‌یسه‌ند، ئه‌وه‌بوو جارێك به دیموکراسیه‌وه گرێدراوه، جارێکی تریش به نیشتمانییه‌وه، هه‌روه‌ها به بیرۆکه‌ی (نه‌ته‌وه)شه‌وه. ته‌نانه‌ت کۆمه‌ڵناسی ناودار (جان جاك ڕۆسۆ) له ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی هه‌ژده‌هه‌م، به هه‌مان دید ده‌یڕوانییه ناسیۆنالیزم و نه‌ته‌وه‌گه‌ری بێ جیاوازی، ئه‌مه پێش ئه‌وه‌ی زاراوه‌ی ناسیۆنالیزم وه‌ك به‌کارهێنانێکی توندوتۆڵ بێته ئاراوه.

(ڕۆسۆ) به شێوه‌یه‌ك ڕه‌وتی نیشتمانێتی ناسیوه که گونجاندویه‌تی له‌گه‌ڵ ئاکاری ڕه‌وشتی، مه‌به‌ست له چالاکی سیاسیی و یاساکه‌ی له تیۆره‌که‌یدا به گه‌وره‌زانینی ده‌وڵه‌ت نه‌بووه، به‌ڵکو میلله‌ت بووه به‌م شێوه‌یه‌ی که ویستی گشتی دیاری ده‌کات.

ناسیۆنالیزمی سەردەمی ڕۆشنگەرایی بە گشتی عەقلانی بوو زیاتر لەوەی سۆزداری و هەڵچوونی پێوەدیار بووبێت. سەرەڕای بەرزی دەنگی (نیشتمانی) ڕۆسۆ.

بەڵام جۆرێکی تر لە ناسیۆنالیزم لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم سەریهەڵدا، کە لەسەر بناغەیەك لە کولتورو داب و نەریتەکان دامەزرا و لە هەمانکاتدا هزرو بۆچوونی ڕۆسۆشی چووە ناوەوە، ئەوەبوو ڕۆسۆ توانی گەشەبدات بە هاودژی لە نێوان سەرەتایی (بەرایی) و دروستکراو (البدائي والمصطنع) کەچی پێشینەی زیاتری بە یەکەمیاندا. ئەم بیرۆکەیەش هەڵقوڵرایەوەو لەسەر دەستی ناسیۆنالیستە ڕۆمانتیکیە ئەڵمانە بەراییەکانی وەك: هیردر و فیختە، بەسەر نەتەوەدا جێبەجێکرا، ئەوانە پێیانوابوو کە نەتەوە (سروشت) دروستی کردووە، هەر بۆیەش شتێکی پیرۆزە. (بڕوانە: هوراس دافیز، القومیة نحو نظریة علمیة معاصرة، ترجمة: سمیر کرم، بیروت، ١٩٨٠، ص٤٤–٤٥).

کەواتە ئەوروپا لە سەدەی هەژدەهەم بیرۆکەی ناسیۆنالیزمی ناسیوە، چونکە ناسیۆنالیزمەکانی ڕۆسۆ و هیردەر و فیختە بڵاوبۆتەوە. بەڵام دیارە بیرۆکەی ناسیۆنالیزم لە ئەوروپا کتوپڕ سەریهەڵنەداوە، بەڵکو ڕەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سێ سەدە لە سەردەمی ڕۆژئاوایی نوێ لە نێوان سالانی (١٥٠٠–١٨٠٠ز)، و لە ماوەی شۆڕشی فەڕەنسیدا پتەوو توندوتۆڵ بوو.

بیری ناسیۆنالیزم دووچاری ڕەخنەیەکی توند بوویەوە لەلایەن چەندین سیاسەتمەداری هزرمەند، وتراوە کە ئەم بیرە پێچەوانەو دژە لەگەڵ ڕەوشت، چونکە هەروەك وەسف کراوە (ئامانجێکی نێو نەتەوەیی نییە یان ڕەگەزپەرستییە یان نامرۆڤایەتییە یان ناجیهانییە)، هەروەك (مۆریی کرانستۆن) دەڵێت: ناسیۆنالیزم ناتوانێت شێوازێکی جیهانی وەربگرێت، چونکە ڕەهەندی ڕەوشتی تیانییە کە وادەخوازێت هەموو ئایدۆلۆژیەکان هەیانبێت.

هەروەها (باربرا وارد) دەڵێت: ناسیۆنالیزم وەڵامێکی تێروتەسەلی نییە بۆ کێشەو گرفتەکانی هاریکاری مرۆڤایەتی، چونکە سروشتە جەوهەرییەکەی وا

دەخوازێت كه خەڵكانی تر له دەرەوەی خۆی جێ بهێڵێت. (بڕوانه: هەمان سەرچاوە، ل٦٢).

هەندێكی تریش وادەبینن كه ناسیۆنالیزم پاساوێك بووه بۆ فراوانخوازی، چونكه كاتێك فەڕەنسیەكان له كۆتایی سەدەی هەژدەهەم پرەنسیپی ناسیۆنالیستیان خسته ناو سیاسەته ئەوروپیەكان، دەستیانكرد به خەباتگێڕی له پێناو ئەم پرەنسیپە، جەنگەكانی ناپلیۆنیش گشتیان جەنگانێك بوون له پێناو پرەنسیپێك.(هەمان سەرچاوە، ل٦٢).

(برنتون) ئەم بۆچوونه پشت ڕاستدەكاتەوه و دەڵێت: (خۆرئاوا له لێكدانەوەی ئەم بیرۆكەیه زیادەڕۆییەكی بەخۆیەوه بینی كه لەم چەند سەردەمه ناسیۆنالیسته خۆی دەنوێنێت، كەوا كۆمەڵەیەكی ناسیۆنالیستی بۆ سەروەری بەرزدەكاتەوەو كۆمەڵەكانی تریش بۆ ئاستی كۆیلایەتی دادەبەزێنێت، یان ئەم بیرۆكەیه دەیەوێت سەراپای زەمینی نیشتەجێ بكرێت بەیەك كۆمەڵەی هەڵبژاردە و لەناوبردنی كۆمەڵەكانی تر، دیاره حاڵەتی ئەڵمانی كه له بیروباوەڕی نازیەت گەیشته ئەوپەڕی دیارترین و بەناوبانگترین شێوەی جێبەجێكردنی ئەم بیرۆكه ناسیۆنالیستەیه.(كلیرنس برنتون، أفكار ورجال: قصة الفكر الغربي، ترجمة: محمود محمود، القاهرة، ١٩٦٥، ص٥٢٤).

مێژوونوسی ئینگلیزیش ئارنۆلد تۆینبی پشتگیری لەم ڕایه دەكات و وا وەسفی ناسیۆنالیزم دەكات كه بریتییه: (لەو كرمۆڵه تۆقێنەرەی ڕەوشی سیاسیی كۆمەڵگەی خۆرئاوایی مۆدێرنمان ژەهراوی دەكات، ئەوه ئاینێكی قەڵپ و نەخۆشه..). (هوراس دافیز، المرجع السابق، ص٦٢).

بەڕاستی هەڵمەتی ڕەخنەی ئاراستەكراو بۆ هزری ناسیۆنالیستی نه له ناوەوەی خۆرئاواو نه له دەرەوەی كپ نەبۆوە، ئەم هەڵمەتەش لەوه سەرچاوەی گرتبوو كه پەیدابوونی دەوڵەته ناسیۆنالیستەكان هۆكاری بنەڕەتی هەڵگیرسانی هەردوو جەنگی جیهانی بوو. چونكه پەیوەندییه نێودەوڵەتییەكان له نێوان دەوڵەته ناسیۆنالیسته جیاجیاكاندا هەروەكو (نانزمور گنتاو) جەختی لەسەر دەكاتەوه له ڕاستیدا ململانێیه له پێناو هێزو دەسەڵات له ڕێگەی

بەکارهێنانی هێزو لە پێناو هێزی زیاتر.(بڕوانە: كليم صديقي، الحركة الاسلامية قضايا وأهداف، ترجمة ظفر الاسلام خان، لندن، ١٩٨١، ص٤٧).

سەرەڕای ئەوەش هەرچەندە (هوراس دافین) لە میانەی بەرگریکردنی لە بیرۆکەی ناسیۆنالیستی بۆچوونی مارکسیەکان وفوزەوییەکان (الفوضويون) و ڕاستڕەوەکان و ئەوانیتری ڕەتدەکردەوە و لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە نەبوو کە دەڵێت: (دەوڵەتە ناسیۆنالیستەکان هۆکاری شەڕ هەڵگیرسان بوون)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرەنجام دان بەوە دادەنێت کە (ناسیۆنالیزم زیاتر دیاردەیەکی هاوشانی جەنگەکانە، نەك هۆکارێك بێت بۆ بەرپابوونیان). (المرجع السابق، ص٦٠).

کەواتە بیرۆکەی ناسیۆنالیزم- بە گوێرەی ئەم بۆچوونەی پێشوو- هەرچەندە تەنها هاوشان و هاوکاتی جەنگەکانە، نەك هۆکاری سەرەکی بەرپابوونیان، بەڵام بنچینەی دروستبوونی نەتەوەو پەیدابوونی دەوڵەتە ناسیۆنالیزمەکەیەتی کە بە لای جیابوونەوەو تایبەتمەندی و ململانێ لەگەڵ نەتەوەکانی تردا دەچێت بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە ناسیۆنالیستییەکانی.

ئەمە پێش وێنەی هزری ناسیۆنالیزمە کە سەرچاوەکەی ئەوروپیە، بەڵام ئایا لە کەیەوە هزری ناسیۆنالیزم لای میللەتانی ئیسلام سەریهەڵدا و سەرچاوەکانی هزری ناسیۆنالیزمی تورکی چین؟

بێگومان وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە تا ڕادەیەکی زۆر چۆنیەتی سەرهەڵدانی ناسۆنالیزمی کوردیمان بۆ بە دیاردەخات.

سەرەتا بابزانین ئایا تورکە عوسمانیەکان خۆیان لە نەتەوەکانی تری ژێر چەتری دەوڵەتی عوسمانی جیادەکردەوە؟ لەڕاستیدا واقیعە مێژووییەکان ڕوونی دەکەنەوە کە تورکە عوسمانیەکان پێش نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم هیچ ڕەوت و مەیلێکی نەتەوەیی یان ڕەگەزییان نەبووە. بۆ ماوەی نۆ سەدەی یەك بەدوای یەك لەژێر سایەی ئیسلام دەژیان و ئینتیمایان بۆ بیروباوەڕی ئایینی پێش هەموو شتێکی تر بوو، تەنانەت دانیان بەتورکبوونی خۆشیاندا نەدەنا، واتا شانازییان پێوەنەدەکردو خۆیان پێی هەڵندەکێشا. زمانی تورکی لە سەردەمی

سەلجوقیەكان لە دیوان و فەرمانگەكان بەكارنەدەهێنرا، هەروەها زمانی ئەدەب و زانست نەبوو، بەڵكو زمانی عەرەبی و فارسی بوو.(بڕوانە : قیس جواد العزاوی، الدولة العثمانیة، بیروت، ٢٠٠٣، ص١٢٥).

لە دەیەی دووەمی سەدەی بیستەم مێژوونووسی ئەمریكی لوثروب ستودارد وەسفی سالانی پێش سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیزمی توركی دەكات و دەڵێت: (سێ تا چوار دەیە بەر لە ئێستا هیچ شتێك لە ئارادانەبوو كە ئەم بزاڤە ناسیۆنالیزمەی پێوەدیاربێت، وئارمینوس ڤامبری پێی ڕاگەیاندم كاتێك بۆ یەكەم جار لە ساڵی ١٨٥٦ز سەردانی قوستەنتینیەی كرد، وشەی تروكلەك (تورك) هاو واتای وشك و ڕەقی و دواكەوتوویی نەزانیبوو، هەرواش دەژمێردراو لای خەڵكی باوبوو. وەكاتێك هەڵدەستام بە تێگەیاندنی خەڵك سەبارەت بەم مەترسیە گەورەیەی پێویستە لەبەرچاو بگیرێت لەهەمبەر بنەچەی ڕەگەزەی تورك (كە لە ئەدەرنەوە تاكو باسفیك بڵاوبوونەوە، وا بەرسڤیان دەدامەوە: توخوا وازمان لێبێنەو نەمانخە ڕیزی قرغیزو تەتەرەكان...).(بڕوانە: ستودارد، حاضر العالم الاسلامي، ترجمة: عجاج نویهض، بیروت، ١٩٧٣، مج٤، ص١١١).

جا ئەگەر ئەمە وێنەی گشتی هزری ناسیۆنالیزمی توركی بێت، ئەدی لای عەوامی خەڵك دەبێ حاڵی دەسەلاتی سیاسیی چۆن بووبێت؟ ئایا هەستكردن بە ئینتیما بۆ نەتەوەی تورك هەبوو؟ تیۆرداڕێژی هزری ناسیۆنالیزمی عەرەبی (ساطع الحصري) لەم بارەیەوە دەڵێت: توركبوون لە نەریتی پیاوانی دەوڵەت و نووسەرانی هاومانای سادەیی و عەوام بوو، تەنها بە مانای خەڵكی بازاڕو كەسانی سادەو كرچ و كاڵ بەكاردەهات، تەنانەت هەندێك مێژوونووس كاتێك ناچار دەبوون وشەی (توركەكان) بەكاربێنن هاوماناكەیان دەنووسی بەتەنیشتیەوە كە دەستەواژەی (بێ ئیدراك) بوو واتا كەسانی نەفام و ناحاڵی و دووره عەقڵ) (ساطع الحصري، محاضرات في نشوء الفكرة القومیة، بیروت، ١٩٨٥، ص٩٢).

هەروەها دەڵێت: (عوسمانییەكان زۆر دووربوون لە هەستكردن بە ناسیۆنالیزمی توركی)(هەمان سەرچاوە، ل٩٣).

هەروەها ئینسکلۆپیدیای ئیسلامیش جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە (تاوەکو سەدەی نۆزدەهەم تورکەکان هیچ ڕەوت و مەیلێکی ناسیۆنالیستیان نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە (تورك) لە لایان مانای کەسێکی دێنشینی زبرو توندوو دارگران (ئێسك قورس) بوو).

), p. ١٩٣Encyclopedia of Islam, Tome IV, (paris, ١
.(٠٩٢٧

لەم گەواهیدانانەی (ستودارد و الحصری و ئینسکلۆپیدیای ئیسلام بەبێ هیچ گومانێك ئەمە دەردەخات کە تورکەکان چەند دووربوون لە هەر مەیل و ڕەوتێکی نەتەوەیی یاخود ڕەگەزیی یا هەر ئینتیمایەکی تری نائیسلامیی. بەڵام حاڵ بەم شێوەیە بەردەوام نەبوو، ئەوەبوو ئەم بایەخپێدانە کتووپڕەی کە لەم ماوەیەدا لە ئەوروپا سەریهەڵداو فرەیی ئەم نووسین و لێکۆڵینەوانەی کە گرنگیان بە ڕەگەزی تورك دەدا لە ڕووی مێژوویی و جوگرافیەوە، دواتر لەم ناوەندانەی بە پەرۆشەوە هزری خۆرئاوایان بە گشتی بە پەرۆشەوە قۆزتەوە، جێگەی خۆی گرت و بەریگرت.

هەر لەبەر ئەوەش هەروەکو ستیوارد دەڵێت: سەیر نییە کە سەرهەڵدانی ڕەوتە ناسیۆنالیزمەکان و تەماعکارییە نیشتمانییەکان لە ناو میللەتانی موسڵمان، لە سەرەتادا لە ماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لێڵی و تەماوی پێوەدیارەو ڕوون نیە. بۆیە بیروباوەڕی دەمارگیری ڕەگەزیی تاوەکو نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بە ئاشکرا دیارنەکەوت، هەروەها گیانی ئەم دەمارگیرییە ڕەگەزیە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕیفۆرمخوازە تورکەکانیش دەرکەوت بە هۆی فرچککگرتنیان بە بنەماو بۆچوونە خۆرئاواییەکان و بەهەند هەڵگرتنی و وەرگرتنی زۆرێك لە هزرو بیروڕا ئەوروپاییەکان دەربارەی ڕەگەزایەتی، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی دەمارگیری ڕەگەزی لایان بەر لە میللەتانی تری موسڵمان(ستوارد،سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٩)

دیارە بە دواداچوونی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیزمی تورکی، زەرورەتێکە بۆ تێگەیشتنی هۆکارو چۆنیەتی سەرهەڵدانی هزری ناسیۆنالیستی

كوردی له ڕەنگدانەوەو كاردانەوەی ناسیۆنالیزمی توركه كه لەناو منداڵدانی دەوڵەتی عوسمانی و به هۆكاری دەرەكی (ئەوروپی) له ڕووی تیۆری و پراكتیكیەوەو بەشێوەیەكی بەرنامەڕێژكراو سەریهەڵدا.

له ڕاستیدا لێكۆڵینەوە زانستیەكان ئەوە دەسەلمێنن كه هزری ناسیۆنالیزمی توركی بەرهەمی دەستی ڕەگەزناسانی خۆرئاواو جوولەكەكانە. ئەوەبوو له نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم ڕەگەزناسە خۆرئاواییەكان دەستیاندایه بایەخدان به توركەكان. هاوكات –یان له چەند كاتێكی لێك نزیك– چەندین لێكۆڵینەوە له چەندەها وڵاتی ئەوروپی: فەڕەنسا، ئەڵمانیا، نەمسا، ڕوسیا، ئینگلتەرا، دەركەوتن كه سەرنجیان بۆ گرنگی ڕەگەزی توركی ڕادەكێشا. له ساڵی (١٧٥٦ز) مێژوونووسی فەڕەنسی (گ. دێغین)، كتێبێكی دانا لەسەر مێژووی گشتی هون و تورك و مەغۆل و تەتەرە خۆرئاواییەكان. دواتر ئەم كتێبە بووە یەكێك له گرنگترین سەرچاوەكانی هزری ناسیۆنالیستی توركی و بوو به ئیلهام بەخش بۆ نەوەی یەكەم له ناسیۆنالیستە توركەكان، كه ڕێنماییكردن بۆ یەكیەتی ڕەگەزی له نێوان هون و تورك و مەغۆل و تەتەرەكانی نیشتەجێی ڕووبەرێكی بەرفراوانی ئاسیاو ئەوروپا. هەروەها گرنگی ئەم كتێبە لەوەدایه كه ئەم بنچینە مێژووییانەی ئاشكرا كرد كه دەكرێت پرۆژەی ناسیۆنالیستی توركی لەسەر دابمەزرێت. دوای ئەوە به تێپەڕبوونی كات نیشانەكانی پرۆژەی ناسیۆنالیستی توركی زیاتر ڕوون دەبۆوە، به تایبەتی كاتێك جوولەكەیەكی ئینگلیز به ناوی (دێڤید لوملی) كتێبێكی دانا به ناوی ڕێزمانی توركی كه تیایدا بنەماو ڕێساكانی ئەم زمانەی دارشت ئەو زمانەی كه له دیدی نووسەران و مێژوونووسانی شارەزا زمانی ئەدەب یان شیعر نەبوو، ئێستا لەسەر دەستی (لوملی) بوو به خاوەن ڕێساو ڕێزمانی چەسپاو.

دوای دانانی ئەم كتێبە ئاشكرابوو كه بوونی مێژوو و زمان بۆ تورك پێویستیان به ئینتیما بۆ نەتەوەیەك و نیشتمانێك هەیه تاوەكو ببنە بناغەو ئامانج –له هەمان كات– بۆ یەكبوونی میللەتانی هون و مەغۆل و تەتەرو تورك، هەرواش دەرچوو، ئەوەبوو له ئەدەبیاتی خۆرئاوایی ناوەكانی (نەتەوەی تۆران)و

(ناسیۆنالیستی تۆرانی) سەریانهەڵدا. هەندێك دەڵێن بۆ یەکەم جار (تۆران)و (تۆرانیزم) لە نەمسا لە ساڵی (١٨٣٩ز) دەرکەوت کە مانای وەسفی نیشتمانێکی نموونەیی کە هەموو تۆرانیەکان بگرێتەخۆ دەگەیاند.

بەڵام وەك بەکارهێنانێکی جوگرافی، فیردەوسی کە لە سەدەی دەیەمی زاینی ژیاوە، لە شاکاری (شاهنامە)، تۆماریکردووە کە دەڵێت: (تۆرانیەکان نەتەوە بەربەریەکانی باکور پێکدەهێنن (مەبەستی تورك و چینیەکانە کە هەر لە کۆنەوە بارێکی قورس بوونە لەسەر هەرێمی ئێرانی خاوەن شارستانی). دواتر چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی تر لە ئەوروپا دەرکەوتن کە جەختیان لەسەر هەمان مەبەست دەکردەوەو لەسەر زمان و مێژوو و ئەدەبی تورانی و تورکیان دەنووسی.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە ڕۆڵی جوولەکەی نەمساوی (ئەرمینیوس ڤامبەری) بکەین کە مامۆستایەکی زانکۆی بودابست بووە، بە تەواوی نازانرێت –هەروەك (هرتزل) لە یادداشتنامەکانی دەڵێت– کە ئایا زیاتر تورك بووە یان ئینگلیز. بە زمانی ئەڵمانی چەندین کتێبی داناوە، زۆر بە باشی دوانزە زمانی زانیوە، باوەڕی بە پێنج ئاین هێناوە، کاهین بووە لە دوانیان، پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم هەبووە، هەر ئەویش سوڵتانی ڕازیکردووە کە پێویستە چاوی بە هرتزل بکەوێت وەك سەرۆکی جوولەکەکان، ئەمەش لە ئایاری (١٩٠١ز) ئەنجامدرا. (صبری جرجس، تاریخ الصهیونیە، بیروت، ١٩٨١، ج١، ص١٦٥).

جا ئەم پیاوە بە جلی دەروێشێکی تورکی هەموو لایەکی ئاسیای ناوەڕاست گەڕا و ئەنجامی گەشتەکەشی کتێبێك بوو بە ناوی (گەشتی دەروێشێکی لاو لە ئاسیای ناوەڕاست). کە لە میانەی ئەم کتێبەو دواتریش تیۆرە تایبەتیەکەی خۆی دارِشت کە داوای پێویستی دروستبوونی یەکێتیەکی نەتەوەیی تورکی دەکرد و ناوی نا (پان تورکیزم) کە هەر لە دەریای ئیجەوە درێژبێتەوە تاوەکو سنووری چین. لە ڕاستیدا ئەم یەکێتیەش گوزارشتی لە بەرژەوەندیە زیندووەکانی بەریتانیا دەکرد، هەر بۆیە زوو پشتگیری لێکرد بەم پێیەی دژ بە

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و قەڵەمڕەوی ڕوسیا بوو. بەڵام دواتر هەڵوێستی ئینگلتەرا گۆڕانی بەسەرداهات بە هۆی گۆڕانی بەرژەوەندیەکانی.

(ڤامبری) بەردەوام بوو لە بانگهێشتەکانی وێڕای ئاراستەکردنی چەندەها ڕەخنەو توانجی توند بۆ ئیسلام و ئەژمارکردنی وەك کۆسپی بنەڕەتی لە پێش دروستبوونی یەکێتی تورکەکان، و دەیگوت ئیسلام پێچەوانەی نیشتمانپەروەرییە و (نیشتمانی نییە، بۆیە زەحمەتە نیشتمانەکان بە گوێرەی ئیسلام بنیات بنرێن). لەبەر ئەوە ئامۆژگاری ناسیۆنالیستە تورکەکانی دەکرد کە پێویستە واز لە ئیسلام بهێنن، چونکە کەسایەتی نەتەوەییان لێ دادەڕنێت. هەر ئەم بۆچوونەش بوو دواتر لە نێوەندەکانی هەڵبژاردەی عەلمانی تورکی دەنگیدایەوەو پشتگیری لێکرا بە تایبەتیش لەلایەن ناودارانی هزری ناسیۆنالیستی تورکی وەکو: (چیا و کوك ئالب و یوسف ئاکشور و ئەحمەد غایف و خالیدە خانم و زۆری تر).

ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە بۆچوونەکانی ناسیۆنالیستە تورکەکاندا دەرکەوت و لە قۆناغی دواتر لە ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانیان کە دژ بە دەسەڵات لە دەرەوەی وڵات دەریان دەکرد گوزارشتیان لێدەکرد، ئەمە پێش سەردەمی مەشروتیەش ساڵی (١٩٠٨ز) کە گەیاندنی ساڵانی دواتر بوو بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵەت، و بونیادی کۆمەڵایەتی و دامەزراوەیی دەوڵەتی لاوازکرد و نەتەوەکانی لێکترازاند، تەنانەت دواتر بووە هۆی وێرانی ئیمپراتۆریەت و کۆتاپێهاتنی.

ڕۆژهەڵاتناسی گەورە (برنارد لویس) دەڵێت: (بەر لە گەیشتنی هزری خۆرئاوایی بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانی بیرۆکەی ناسیۆنالیزم هیچ بوونێکی نەبوو، تەنانەت تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم، تورکەکان و عەرەبەکان هەستیان بەوە نەکردووە کە بۆ یەك نامۆبن، عەرەبەکان ئەوەیان قبوڵ بوو کە بەشێك بن لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە هۆی ئایینی هاوبەش کەچی تورکەکان شانازیان بە عەرەبەکانەوە دەکرد و کولتور و زمانی عەرەبیان بە یەکێك لە نیشانەکانی گەشەکرن و پێشکەوتنی دەزانی).

له لایەکی تریشەوه به هۆی نەبوونی جیاوازی نەتەوەیی لە ناو دەوڵەتی عوسمانی، سوڵتانه عوسمانیەکان و میللەتانی ژێر چەتری دەوڵەتی عوسمانی زۆر به لایانەوه ئاسایی بوو که له چەندین ماوەو قۆناغی جیاجیای مێژووی عوسمانی کورد ڕابەرایەتی ڕوحی دەوڵەتی عوسمانیان پێ سپێردرابێت که له پایەی (شیخ الاسلام)ی دەست ڕۆیشتوو بەرجەستە دەبوو، که له ماوەی پچڕ پچڕدا بەدەست خانەوادەی بەدلیسی و ئامێدی و حەیدەرییەوه بوو، هەروەها ڕابەرایەتی تەریقەتە سوفیەکان (قادری و نەقشبەندی). (د.عثمان علي، دراسات في الحركة الكردية المعاصرة).

لەڕاستیدا بڵاوبوونەوەی هزری ناسیۆنالیستی تورکی به خێراییەکی بەرچاو دەگەڕێتەوه بۆ چەند هۆکارێکی ناوخۆیی و دەرەکی لە سەرووی هەموویانەوه ئەو شکستیانەی عوسمانییەکان لە ئەوروپا ڕووبەڕووی بوونەوه، ئەمه لەلایەك و لەلایەکی تریشەوه، ئەم سەرکەوتنانەی بزاڤە ناسیۆنالیستە ئەوروپیەکان بەدەستیان هێنا. سەرەڕای ئەو دەستکەوتانەی سیستمە ناسیۆنالیستە ئەوروپیەکان هێنایانەدی له دیاریکردنی دەسەڵاتەکان و چەسپاندنی دەستورەکان که مافی زۆری بۆ میللەت دەستەبەرکرد، ئەمه لەکاتێکدابوو که عوسمانییەکان بەدەست ستەم و دکتاتۆریەت و چەوساندنەوه دەیانناڵاند. پێش ئەمانەش گشتی ئەم فشارە ئەوروپیە زۆرەی خرابووە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەست تێوەردانی بەردەوامی بۆ نێو کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگەی دامەزراوە مۆدێرنەکان هەر لە ساڵی (١٨٣٩ز)ەوە، هەروەها لە ڕێگای فەرمانگەکانی پۆستەو گەیاندن که دەوڵەتە ئەوروپیەکان له ناو ئیمپراتۆریەتیش کۆنترۆڵیان کردبوو، بۆ دابەشکردنی بەربڵاوی ڕۆژنامە ناسیۆنالیستەکانی دژ به دەوڵەت بەکاریان دەهێنا، هەروەها بۆ هەموو چاپکراوەکانی میسرو ئەوروپا.

له لایەکی تریشەوه (ساطع الحصري) ئاماژه به دەرکەوتنی ڕەوتێکی ترسناك دەکات لای ناسیۆنالیستە تورکەکان له ئەنجامی کاریگەری نووسینە خۆرئاواییەکان بەسەریانەوه، ئەویش ئەوەبوو که نووسراو و دانراوە

ناسیۆنالیستە خۆرئاواییەکان هەمیشە جەختیان لەسەر مێژووی تورك بەر لە ئیسلام دەکرد، جا چەند نووسەرێك چەندین تەوەرەیان لەم کتێبە ئەوروپیانە دەرهێنا کە ئەوە دەسەلمێنن تورکەکان پێش ئیسلام لە ڕووی شارستانیەوە زۆر پێشکەوتووبوون و هەرچی پەیوەست بوو بە مێژووی تورك بەر لە ئیسلام و بەدەر لە ئیسلام لەم کتێبانەیان دەردەهێنا.

ڕەگەزناسە خۆرئاواییەکان لە پرۆسەی پەیوەستکردنی هزری ناسیۆنالیستی تورکی هەر لە سەرەتاوە بە قۆناغی پێش ئیسلام، سەرکەوتن، هەر ئەوەش مەبەست بوو تاکو ڕۆژگاری ئەمرۆش کاتێك نووسینە ئەوروپیەکان بۆ نموونە باس لە پێکهاتەکانی کولتوری تورك بکات، ئەوا یەکسەر بەر لە هەموو شتێك پەنا دەبەنە بەر مێژووی تورك بەر لە ئیسلام، واتە قۆناغی پێش گەیشتنیان بە ئەنادۆڵ.

شایەنی باسە زۆربەی سەرانی هزری تورانیزم تورك نەبوون، بۆ نموونە: (ئەحمەد ڕەزا)ی سەرۆکی بزاڤی (الاتحاد والترقی) نیوەی چەرکەس بوو و نیوەکەی تری نەمساوی (مەجەری)، (ئەنوەر پاشا) کە یەکێك بوو لە دیارترین سەرکردەکانی ئیتحادو تەرەقی پیاوێکی پۆڵۆنی بوو بۆ ماوەیەك ئیسلام بوو بوو، دواتر هەڵگەڕایەوە. (جاوید پاشا) و (عەمانویل قەرەسو) کە دوو بوون لە سەرکردە باڵاکانی ئیتیحادو تەرەقی و پۆستی گرنگیان پێ سپێردرابوو وەك وەزارەتی دارایی، لە بنەچەدا دەگەڕانەوە سەر جوولەکەکانی (دۆنمە). (تەلعەت پاشا) کە وەزیری ناوخۆو وەزیری جەنگ بوو لە دەوڵەتی عوسمانی و یەکێك بوو لە بناغەکانی سێ کوچکەی ستەم و داپلۆسین لە دەوڵەتی عوسمانی، بولگاریەکی بە بنەچە قەرەج بوو.

هەروەها (ضیاء کوك ئەلب) کوردی دیاربەکری، خۆی کردبوو بە تورك و کەوتبووە ژێر کاریگەری هزری سۆسیال دیموکراسی و فەلسەفەی دورکهایم، بەرنامەدارێژی هزری ناسیۆنالیستی نادینی تورکی بوو و (عصمت أینونوی) دەستەڕاستی مستەفا کەمال کە پێشەوای بزاڤی ناسیۆنالیستی بوو لای تورکەکان و سەرسەخترین دوژمنی ئیسلام بوو، کوردێك بوو خۆیکرد بە تورك.

له ڕاستیدا به جووڵەخستنی ڕەوتی ناسیونالیزم لای تورکەکان، ڕق وقینەیەکی زۆری لە بەرامبەر کوردو عەرەبەکان دروستکرد.

سەرەنجام سیاسەتی "پەرتکەو زاڵ بە" سەریگرت و ئەو ئامانجەیان هاتەدی که لەناوبردنی خەلافەی عوسمانی و نانەوەی ڕق وقین و دوژمنایەتی له نێوان میللەتانی موسڵمان بوو. بەڵام ئەم قسەیەمان ئەوە ناگەیەنێت کە دەسەڵاتی عوسمانی هەمیشە نوێنەرایەتی ڕاستەقینەی ئاینی ئیسلام و شەریعەتی کردووە و لێی لانەداوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە لادانێکی زۆری پێوە دیاربوو لە ئیسلام و جێبەجێکردنی ڕاوێژو دادپەروەری و هەروەها هەرسکردنی ماڤی تاکی موسڵمان و بەهەدەردانی سەروەت و سامانی (ئوممەت) له پێناوی بەرەژەوەندی و تێرکردنی هەوەس و ئارەزووەکانی سوڵتانەکان، لە سیفەتە دیارەکانی ئەم دەوڵەتە بوو، بەڵام سەرەڕای هەموو نەخۆشیەکان و خاڵە نێگەتیڤەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەبەرئەوەی نوێنەرایەتی گەلانی موسڵمانی دەکرد کە خاوەنی هێزو وزەیەکی زۆری لەبن نەهاتوون لە هەموو ڕوویەکەوە، خۆرئاوا سووربوو لەسەر لەناوبردنی لە ڕێگەی ترازاندنی بنەماکانی بوونی بە چاندنی هزری نادینی و ناسیۆنالیزمی تورکی کە دواتر ئەم تۆوە سەرجەم میللەتانی ناو دەوڵەتی عوسمانی گرتەوە بە تایبەتیش عەرەب و کورد.

هەروەك مێژوونووسی کورد موحەممەد ئەمین زەکی بەگ باس دەکات: تاوەکو تورك داوای تورکایەتی نەکردو عەرەب داوای عەرەبایەتی نەکرد، مەسەلەی نەتەوایەتی لای کورد بوونێکی نەبوو. واتە بوونی کورد لەناو ئەو واقیعەی خەریکە مۆدێلێکی هزری مۆدێرن بەخۆیەوە دەبینێت، پاڵی بە کوردەکانیشەوە نا کە لاسایی ئەم مۆدێلە بکەنەوە و بیر لە بنەچەو ڕەگ و ڕیشەی مێژوویی خۆیان بکەنەوە، هەروەها زیندووکردنەوەی کولتوری کۆنی خۆیان و بوونی قەوارەیەکی نەتەوەیی کە سەرجەم کوردەکان بگرێتەخۆ کە چوارچێوەی جۆگرافی مێژوویی هەبێت، بە زەرور بزانن. دیسان لێرەشدا نووسینە خۆرئاواییەکان ڕۆڵی ئەکتیڤی خۆیان بینی لە ڕەواجدان بەم باسە.

كەواتە مەسەلەی ناسیۆنالیزم و كێشەی نەتەوایەتی لە ڕۆژڵاهەت لەمێژ نییە سەریهەڵداوە، بەتایبەتی بە نیسبەت كوردەوە تا سەرەتاكانی سەدەی بیستەم نەهاتۆتەكایەوە، سەرهەڵدانیش هەروەك باسكرا پەیوەست بووە بەو هەلومەرجەی خۆرئاواییەكان لە ڕۆژهەڵات (لە سنوری دەوڵەتی عوسمانی) هێنایانە ئاراوە، سەرەتا ئەم هزرە ناسیۆنالیزمە لای توركەوە دەستی پێكرد دواتر عەرەبی گرتەوە لە ماوەی جەنگی یەكەمی جیهانی و ئینجا كوردەكانیش كاتێك بینیان گەمارۆدراون بە دەوروبەرێكی ناسیۆنالیستی و هەرنەتەوەیەك بانگهێشت بۆ خۆی دەكات و داوای سەربەخۆیی دەكات لە چوارچێوەیەكی (نەتەوەیی)، كوردیش ناچاربوو هەمان ڕێباز بگرێتەبەر..و ئیتر كێشەی نەتەوایەتی سەرهەڵبدات، و هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەكی بۆ بدرێت و چیتر كورد لەلایەن نەتەوەكانی دەوروبەر نەچەوسێنرێتەوە، مافە بنەڕەتیەكانی وەك نەتەوەیەكی سەربەخۆ و خاوەن تایبەتمەندی جوگرافی و مێژوویی و كولتوری، ڕێگەی ژیانی خۆی هەڵبژێرێت.

**+ لە پاش دەركەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە كوردستان، كورد توانی چەندین ئەمارەتی سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆ پێك بهێنیّ و هەوڵی زۆریدا لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامدا دەوڵەتی میدیا بە شێوازێكی دی زیندوو بكاتەوە، بەڵام پیلانی دوژمنان و دووبەرەكی و شەڕە ئیمارات وایانكرد یەك لە دوای یەك ئەو ئیمارەتانە لە ناو بچن، دەتوانیت چۆن بە شێوازێكی زانستییانە ئەمەمان بۆ شرۆڤە بكەیت؟**

دكتۆر حەكیم: دەركەوتنی ئیسلام و گەیشتنی بۆ كوردستان هەر لە سەردەمی پێغمەبەر ﷺ و خیلافەتی ڕاشیدی، لاپەڕەیەكی نوێی لە مێژووی جیهان و ناوچەكە هەڵدایەوە، ئەوەبوو زۆر لە پێوەرو هاوكێشە نێودەوڵەتیەكانی سەردەم گۆڕان و ئاوەژووبوونەوە. لەم سەردەمە هێدی هێدی ناوی كوردو ناوچەو شارە كوردییەكان پانتاییەكی باشیان لە سەرچاوەو ژێدەرە مێژوویی و ئایینیەكان پێبڕا، لە سەرەتادا ڕۆڵی كورد بە ڕۆڵی سەربازی دەستپێكرد بە بەشداریكردنیان لە پرۆسەكانی فتوحات و بزاڤەكانی دژ بە دەوڵەت كە لە

سەرچاوە مێژووییەکاندا بە (دانیشتوانی هەرێمی جەزیرەو هەرێمی چیاکان) ناوبراون، ئینجا ڕۆڵی کاریگەری لەناو دامودەزگاکانی دەوڵەتی عەبباسی کە لە سەرچاوەکاندا ناوی چەندین کەسایەتی کورد هاتووە کە بەرپرسیارێتی ئیداری گەورەیان پێ سپێردراوە بێ ئەوەی ئینتیما کوردیەکەیان ڕێگر بووبێت. (بڕوانە : زرار صديق توفيق: الكورد في العصر العباسي، رسالة ماجستير غير منشورة).

دواتر ڕۆڵی سیاسیان زیاتر دەرکەوت ئینجا ڕۆڵی زانستی و بەشداریکردن لە گەشەسەندنی شارستانی ئیسلامیی و بەدیارکەوتنی ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتی زانستی بەتایبەتی زانستە ئایینی و زمانەوانی و کۆمەڵایەتیەکان کە لە سەرچاوەکانی تایبەت بە ژیاننامەی ناوداران ناویان هاتووە.

هاوکات و هاوشێوەی میللەتانی تری ناو بازنەی خیلافەتی ئیسلامیدا کوردەکانیش هەر لە سەدەی چوارەمی کۆچییەوە بگرە زووتریش لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانی گەورە بە بەشەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو باکورو باشوریەوە چەندین میرنشینی نیمچە سەربەخۆیان دامەزراند کە لە ڕووی ئیداریەوە سەربەخۆییەکی تەواویان پێوە دیاربوو، بەڵام بە شێوەیەکی ڕەسمی و ڕەمزی سەر بە مەڵبەندی خیلافەت بوون هاوشێوەی میرنشینە ناکوردییەکان نموونەی ئەم میرنشینە کوردیانەش: میرنشینەکانی عەیشانی و هەزبانی و ڕەوادی و شاژنجانی و مەروانی.

بەڵام دەرکەوتنی ئەم میرنشینانە لە ڕاستیدا گوزارشتێك بوو لە سیستمی سیاسیی و ئیداری سەردەمی ئیسلام کە نامەرکەزی بوو، و دانپیانانی ناوەندی دەسەڵات بوو بە شەرعیەتی دروستبوونی قەوارەی ئیداری سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆ کە بە ناوی خیلافەتەوە مافی حوکمکردنیان پێدرابوو، پابەندبوونێکی ئایینی و دارایی بە مەڵبەندی خیلافەتەوە هەبوو، لە هەمانکاتیشدا گوزارشتێك بوو لە پیادەکردنی تایبەتمەندی ناوچەو هەرێمەکان لە ڕووی پێکهاتە ڕەگەزی و زمان و ئابووری و بارودۆخی کۆمەڵایەتی...هتد، کەواتە ئەم جۆرە حوکمڕانیانە شەرعیەتی تیۆری و پراکتیکیان پێدرابوو، بە هیچ شێوەیەك دژ بە بنەما شەرعییەکان نەبوون.

دەرکەوتنی ئەم میرنشینانە پەیوەندی بە دەوڵەتی میدیاوە نییە. لەو بڕوایەشدا نیم کە سەرکردەو ڕابەرانی ئەم قەوارە سیاسییە- ئیدارییانە ئەم هۆشیارییە نەتەوەییەیان هەبووبێت، بیریان لەوە کردبێتەوە ئەوانیش درێژبوونەوەی بەردەوامبوونی دەوڵەتی میدیەکان بن، تەنانەت زۆر زەحمەتە زانیبێتیشیان کە سەدان ساڵ پێش ئەوان دەوڵەتێکی بەم شێوەیە هەبووە. لەڕاستیدا فەرمانڕەوایەتی ئەم میرنشینانە بە پێی حوکم و واقیعی سەردەم کەسانی عەشائیری بوون و ئینتیمایان زیاتر بۆ عەشیرەتەکەیان و ئەم سنوورە جوگرافیە بەرتەنگە بووە کە تێیدا نیشتەجێ بووە نەك ئەو سنوورە جوگرافییە-مێژووییەی کە ئێمە ئەمڕۆ بە سنووری کوردستانی گەورەی دەزانین.

کاتێك هەستیان کردووە دەرفەتی دروستکردنی قەوارەی خۆجێیی هەیە، وەك میللەتانی تر ئەم هەلەیان قۆستۆتەوە، ئەم میرنشینانەیان دامەزراندووە.

هەروەها لە سەردەمی عوسمانیەکانیش چەندین میرنشینی کوردی دەرکەوتن و تاڕاددەیەکی باش تایبەتمەندی و سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو، هەرچەندە بەشێوەیەکی فەرمی سەر بە مەڵبەندی ئاستانە بوون، پابەندبوونی دارایی و سەربازی خۆیان هەبوو بەرامبەر بە پایتەخت.

میرەکانی ئەم میرنشینانەش کەسانی عەشایەر بوون و لە بری ئەم قۆناغە مێژووییەی کە تێیدا دەژیان کە (ولاء) بۆ ئایین و بۆ عەشیرەت بوو بەر لە هەموو شتێك.

دواتر بە هۆی چەند هۆکارێکی خودی و بابەتی و هەلومەرجی ناوخۆیی و هەرێمی و نێودەوڵەتیەکان ئەم میرنشینانە یەك لە دوای یەك لەناوچوون (کە لێرەدا بواری باسکردنیان نییە)، بەڵام زاڵبوونی گیانی خێڵەکی و ڕکابەری و ململانێ لە نێوان سەرانی کوردو تەنانەت داوای یارمەتی پشتیوانی لە هێزە ئیقلیمی و دەرەکییەکان لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی و مانەوەی دەسەلاتیان، لە سەرووی هۆکارەکانەوە بوون.

**+ مێژووی دوورو درێژی کورد وابووە سەرکردەو دەسەلاتدارەکانی میرنشین و شۆڕش و ڕاپەڕینەکان کەساتی ئایینی بوون، ئایا بۆچی ئەمانە نەیانتوانییوە**

**تەنانەت لە ژێر کاریگەری ئایینیشدا بێت بیر لە پرۆژەیەکی لەو شێوەیە بکەنەوە کە میللەتەکەیان لە قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك ڕزگار بکەن؟**

دکتۆر حەکیم: دیارە ئایینی ئیسلام بە پێچەوانەی مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا کە فاکتەرێکی نێگەتیڤ بوو بەسەر واقیع و کۆمەڵگەی ئەو کات و هۆکاری دواکەوتوویی و چەقبەستوویی و داخران و خۆبەدەستەوەدان و حسێب نەکردن بوو بۆ مرۆڤایەتی مرۆڤ و عەقلانی بوونی، فاکتەرێکی پۆزەتیڤی کۆمەڵگەو واقیعەکەیەتی کە داوای کرانەوەو زانست و پێشکەوتن و گۆڕانکاری و بەکارخستنی عەقڵ و بیرکرنەوەو ڕەتکردنەوەی ستەم و ڕاپەڕین بە ڕووی زۆرداران و سنووربەزێنان دەکات لە پێناو چەسپاندنی مرۆڤایەتی مرۆڤ و قبووڵنەکردنی کۆیلایەتی مرۆڤ بۆ مرۆڤ یان کۆمەڵێك بۆ کۆمەڵێك یان میللەتێك بۆ میللەتێکی تر لەژێر هەر پاساوێکدابێت، مادام پێشێلکردنی مافەکانی تێدایە.

هەر لە کۆنەوە ئایین ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لەسەر ڕەوشی مرۆڤ و کۆمەڵگە و هەرکاتێك ئەم ئایینە ئاسمانی بووبێت و لە ڕێڕەوی خۆی نەترازابێت و نەکرابێتە ئامرازێك بۆ بە کۆیلەکردنی مرۆڤ و دابینکردنی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی پیاوانی ئایینی (کە خۆیان بە نوێنەرانی ئایینی داناوە) ئەوا ئەم ئایینە ڕۆلێکی کاراو پۆزەتیڤی لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵگەو عەوام و دەسەڵاتدارانە بینیوە. بەڵام بە پێچەوانەوە هەرکاتێك ئەم ئایینە بە ئاقارێکی تردا برابێت و کەسانێك خۆیان لێکردبێتە خاوەن و وەك تاکە سەرچاوەی بڕیارەکان خۆیان حسێب کردبێت، هەروەها بیروباوەڕو بنەماکانی شێوێندرابێ کە تەنها لە بەرژەوەندی پیاوانی ئایینی ڕاڤەکرابن، ئەوا ئەم ئایینە (شێواو و دەستکردە) ڕۆلێکی نێگەتیڤی لەسەر هەموو ئاستەکان بینیوە.

ئایینی ئیسلامیش کە گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی و بنەڕەتی بەسەر کۆمەڵگای عەرەبی بەتایبەتی و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی دا هێنا، کە بووە هۆی گۆڕینی یاخود دووبارە کێشانەوەی نەخشەی هزری و ئایینی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و شارستانی جیهان کە تاکو ئەمڕۆش شوێنەوارو کاریگەری و کارلێکردنەکانی بەرچاوو دیارە، ئەم ئایینە هەرکاتێك بە دروستی و

تێگەیشتنی ڕاستەقینەوە بەرجەستەكرابێت ئەوا فاكتەری هێزو گۆڕانكاری ئیجابی بووە. میللەتی كورد هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە بە تێگەیشتنێكی (فطري)و سادەییەوە بە ماوەیەكی زۆر كورت هاتە ژێر سایەی ئەم پەیامەو زۆرینەی ڕۆڵەكانی ئەم ئایینەیان قەبوڵكرد، لەم پێناوەشدا مێژووی شارستانێتی ئیسلامیان دەوڵەمەندكردووە. دیارە ڕەنگدانەوەی ئەم ئایینە كەم یا زۆر بەسەر ڕۆڵەكانی ئەم میللەتە لە هەر ئاست و پلەوپێگەیەك بن دیارە، لەوانەش كەسایەتییە سەركردەكان و ڕابەرانی میرنشین و شۆڕش و ڕاپەڕینە كوردییەكان.

جێی باسە ئەم سەركردەو ڕابەرانە جمووجۆڵەكانیان لە سنورێكی جوگرافی بەرتەنگ بووە، ئەوەش بە حوكمی سەختی و دژواری ناوچە شاخاوییەكان و بوونی بەربەستی سروشتی زۆر كە ڕێگربێت لەبەردەم فراوانی ئاسۆی بیركردنەوەو ئاگاداری دەوروبەرو تەسككردنەوەی ئاستی بیركردنەوە كە لە سنوری خێڵەكی دەرنەچێت.

لە لایەكی تریشەوە تێگەیشتنیان بۆ ئایین بە شێوەیەكی قووڵ و زانستیانە نەبووە، بەڵكو زیاتر (فطري)و (عاطفی) بووەو تێكەڵاوی داب‌و نەریت و ویستە خێڵەكییەكان كراوە، یاخود لایەنە خێڵەكییەكە، بەرژەوەندیە تایبەتیەكانی سەرەك خێڵەكە یا سەركردە كە بەسەر پابەندبوونە ئایینیەكەدا زاڵبووە، چونكە ئەوان زانای ئایینی نەبوون كە بە تەواوی شارەزای بنەما شەرعیەكان بن، جا زۆرجاران ئەم تێگەیشتنە (سادەو سەرەتاییە) لە ئیسلام لە بری ئەوەی هۆكاری (هێز) بێت و لە بەرژەوەندی كورد بەكارهێنرابێت، بە پێچەوانەوە دوژمنانی كورد لە بەرژەوەندی خۆیان بەكاریان هێناوە، لە ڕێگەی بانگەشەكردنی چەواشەكارانە بۆ ئایین و پارێزگاری لە شەرع و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنان و (كافران) لە پێناو تەیاركردنی زۆرترین ژمارە بۆ شەڕكردن و بەدیهێنانی بەرژەوەندی نەتەوە (سەردەستەكان) لە عەرەب و تورك. ڕووداوە مێژووییەكانی سەردەمی عوسمانی و سیاسەتی مستەفا كەمالیش ئەوە دەردەخەن كە چۆن كورد بۆ ئەم مەبەستە بەكارهێنراوە و تا چەند زەرەرمەندبووە.

لەلایەكی تریشەوە لە سەرچاوە و بەڵگەنامە بەریتانییەكان لە ماوەی شۆڕشی شێخ مەحمووددا هاتووە كە پابەندبوونی كورد بە ئایینەوە تا ڕاددەیەكی زۆر سادەو سۆزدارانە بووە و ئینگلیزەكان باوەڕیان وابوو كە (تاكە كوردێك نییە پەنجەی خۆی بجوولێنێ بۆ بەرگری كردن لە بەها ئایینیەكان و مەسەلە نەتەوەییەكان)و هەروەها باوەڕیان وابوو كە تاكی كورد خواناس نییە، بەڵام سروشتە ساكارو خورافیەكەی وای لێدەكات كە پۆزەتیڤانە یا نێگەتیڤانە بكەوێتە ژێر كاریگەری شێخەكان). (د.عثمان علي، المرجع السابق، ص٢٨٦).

كەواتە عەقڵیەتی خێڵەكی و ناوچەیی لای سەرانی كورد لە سەرووی بیروباوەڕی ئایینی و هەستی نەتەوایەتییەوە بووە، بۆیە نەیانتوانیوە ئەم سنوورە ببەزێنن و ڕەهەندی ئایینی ئەكتیڤانەو پۆزەتیڤانەو شەرعیانە بۆ بەرژەوەندی نەتەوەیی بەكاربهێنن، كاتێك كە نەتەوەكانی دەوروبەر دروشمی نەتەوەیەتییان بەرزكردەوەو بە ئامانجی دروستكردنی قەوارەی نەتەوەیی بە پشتیوانی خۆرئاوا كەوتنەخۆ.

**+ بۆچوونێك هەیە دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەی ڕاشدیندا گەلی كورد بە زمانی نەتەوایەتی خۆی نامۆكراوە، باشترین وزەی فیكری و كولتوری بۆ خزمەتی فیكرو كولتوری عەرەبی ئیسلام تەرخانكردووە، بۆچوونی زانستییانەی جەنابتان لەم بارەیەوە چییە؟**

دكتۆر حەكیم: ئەم بۆچوونەی دەڵێت لە سەردەمی خیلافەی ڕاشیدیندا گەلی كورد بە زمانی نەتەوایەتی خۆی نامۆكراوە و وزەی فیكری و كولتوری بۆ خزمەتی كولتوری عەرەبی ئیسلام تەرخانكردووە دوورە لە بنەما زانستیەكان و لۆژیكی سەردەم، چونكە هەروەك لە سەرەتای پرسیارەكان ئاماژەم پێدا بەپێی دەق و بنەما شەرعییەكان قەدەغەو حەرامە كە هەوڵبدرێت كەسێك یان میللەتێك زمانی دایكی خۆی كە بنەڕەتترین ڕەگەزی بوونی هەر میللەتێكە، پێی نامۆبكرێت و هەوڵ بدرێت زمانێكی تری بەسەردا بسەپێنرێت، ئەمە بە تەواوی پێچەوانەی ویستی پەروەردگاری داهێنەری ژیان و ئینسانە و لە سەردەمە جیاجیاكانی مێژووی ئیسلامیش بە هیچ شێوەیەكی بەرنامەڕێژكراو زمانی

عەرەبی نەسەپێنراوە بەسەر میللەتانی تری ژێر چەتری ئیسلام، عەوامی میللەتانیش خاوەن زمانی ڕەسەنی خۆیان بوون و بەكاریان هێناوە. بەڵام هەوڵدانی كەسانێكی زانستخوازو فێرخواز بۆ فێربوونی زمانی عەرەبی كە قورئانی پیرۆزی پێ دابەزیوەو بەدرێژایی مێژووی ئیسلام بەهۆی فراوانی سنووری خیلافەی ئیسلام و لە نێوەندە جیاجیاكاندا و لە نێوان میللەتان زمانی شارستانی بووە بە هەموو ماناكانیەوەو بە پێوەرەكانی سەردەم، سەرەڕای ئەوەی كە زمانی ڕەسمی دەوڵەت بوو، زمانی هاوبەش بوو لە نێوان نەتەوەكانی تر و ڕۆشنبیران و زانایانی لێك نزیك كردۆتەوەو بەیەكی ناساندووە لە ڕێگەی بەرهەمەكانیان كە بە عەرەبی نووسراون. هەروەك چۆن ئەمڕۆ زمانی ئینگلیزی زمانێكی جیهانییەو زمانی زانستی مەعریفەكانەو نەشارەزابوون لێی بۆشاییەكی كولتوری و مەعریفی گەورە لای تاكی ئەمڕۆی ڕۆشنبیر دروستدەكات. جا ئایا دروستە ئەگەر بەربڵاوی زمانی ئینگلیزی و كۆنترۆڵكردنی واقیعی زانستی و تەكنەلۆژی ئەمڕۆ و پەلهاوێشتنی بۆ هەموو گۆشەیەكی گۆی زەمین بە (بەزۆر بە ئینگلیزكردن) ئەژمار بكەین، وەك ئەوەی ئامانجی قەڵاچۆكردنی زمانەكانی تربێت؟ بێگومان نەخێر!، چونكە زیندوویی زمانەكەو واقیعی حاڵ وای خواستووە.

دیارە هەركاتێك هەر نەتەوەیەك لە ڕووی ژیارییەوە لە ڕیزی پێشەوە بێت و خاوەنی زۆربەی داهێنان و بەرهەمە شارستانییەكان بێت، زمانەكەشی دەبێتە زمانی سەردەم و زمانی شارستانی ئەو سەردەمە.

جا لەم پێودانگەوە بۆ ماوەی چەندین سەدە شارستانی ئیسلامیی و زمانی عەرەبی ڕابەرایەتی شارستانێتی مرۆڤایەتییان كردووە، ئەوەشمان لەبیر نەچێت كە هزرو شارستانی ئیسلامیی بەهرەمەند بووە لە توخمە شارستانییەكان پێش خۆی و كەڵكی زۆری لێوەرگرتوون، هەرچەندە خاوەنەكانیان بێگانە بوون و بیروباوەڕەكانیان جیاواز بووە لە ئایینی ئیسلام، بەڵام مادام مایەی سوودمەندی بێت، دەكرێت بكرێنە سەرچاوە بە چاوپۆشین لە ڕەگەزو ئایین و زمان، دیارە بە گوێرەی بنەماو ڕاسپاردەكانی ئیسلام گەڕانی بەردەوام دانایی و زانست وەرگرتن

پیشەی مرۆڤیی باوەڕداره له هەر كوێیەك سەرچاوەی گرتبێت. (الحكمة ضالة المؤمن أنى وجدها فهو أولى بها).

جا بەڕاستی ئەگەر بڵێین وزەی فیكری و كولتوری كورد بۆ خزمەتی فیكرو كولتوری عەرەبی تەرخانكراوە، ئەمە وەهمێكەو بەس، بەڵكو بە پێچەوانەوە ئەگەر كورد وزەیەكی هەبووبێت ئەوا له ڕێگەی ئیسلامەوە ئەم ووزەیەی هەبووەو زیندووبۆتەوەو بەرگی ژیانی كراوەتەوە بەرلە دوای چەندین سەدە لە سڕبوون و متبوون كە هیچ شوێنەوارێكی لە سەرچاوەكاندا نییە.

بە دڵنیاییشەوە تاقە دەقێكی مێژوویی ڕەسەن بەرچاو ناكەوێت كە ئەمەی لێبخوێنرێتەوە، زمانی عەرەبی لەلایەن دەسەڵاتدارێكەوە لە سەردەمی ئیسلامیی، بەسەر كۆمەڵێك یان میللەتێك سەپێنرابێت، یاخود میللەتێك وازیان لە زمانی دایكی خۆیان هێنابێت و لە بری ئەو بە زمانی عەرەبی ئاخاوتبن.

ئەوەتا ناوی ئەو هەموو كەسایەتییە كوردانە كە ڕۆڵی سەربازی و سیاسیی و ئیداری و زانستی و شارستانیان بە گشتی گێڕاوە بە درێژایی مێژووی ئیسلام وە لە سەرچاوەكاندا باسیانكراوە چۆن لێكدەدرێتەوە. بەدڵنیاییەوە دەڵێم كە ئەگەر ئیسلام نەگەیشتبا كوردستان و كوردستانیش لە چنگ داگیركارانی فارس و ڕۆمان ڕزگاری نەبووایە، ئەوا مێژووی كورد لە شاردراوی و نادیاری ڕزگاری نەدەبوو و تاكی كوردو كۆمەڵگەی كوردیش بە شێوەیەكی بەرچاو لە مێژوودا دەرنەدەكەوت.

هەروەها گەیشتنی ئیسلام بۆ كوردستان جووڵەی بە بزاڤی شارستانی كورد داو، هانی تاكەكانیدا كە تەنها لە ناوچەكانی جێنشینی خۆیان نەمێننەوە بە شێوەیەكی داخراوو دوور لە دەوروبەرو ڕەوشی شارستانی گشتی ناوچەكە، بەڵكو بەرەو هەرێم و شارو ناوچەكانی تری ژێر حوكمی خیلافەت هەنگاو بنێ بە مەبەستی جیاجیا لە سەرووی هەموویانەوە بۆ جیهادكردن یا بۆ وەدەستهێنانی زانست لە بنكەو مەڵبەندە زانستیەكانی شارە گەورەكانی دەوڵەتی ئیسلامیی بە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایەوە. هەر بۆیە زۆربەی خوێندگا و مزگەوتەكانی ئەم شارە (شارستانیانە) شوێنەواری ئەم كەسایەتیانەیان پێوە دیارە، ئەمە جگە لە

بەرپرسیارێتی سیاسیی بە تایبەتی لە سەردەمی ئەیوبی و مەمالیکەکان لە وڵاتی میسرو شام و..تاد.

زۆرێك لەم کەسایەتیانەش بە نازناوی (کورد)ییەوە لە سەرچاوەکاندا ناسراون، واتا حاشایان لە بنەچەو ڕەچەڵەکی خۆیان نەکردووە، لەبەرئەوەی موسڵمانن !

هیچ کامێکیش لەم کەسایەتییە ناودارە کوردانە بە ئامانجی خزمەتکردنی عەرەب و کولتورەکەی کارو کۆششیان نەکردووە بەڵکو بە مەبەستی خزمەتکردنی کۆمەڵگەو بیروباوەڕەکەیان کاریانکردووە و بە جۆرێك لە پەرستش (عبادەت)یان زانیوە.

چونکە ئەو کات تێڕوانین زۆر فراوانتر بووە لە تێروانینی هەندێك لە رۆشنبیران و ناسیونالیستانی ئەمڕۆ کە بە چاویلکەیەکی زۆر کورتبین و بچووکبین دەڕواننە شتەکان، کەچی لەم لاشەوە هەموو شتێکی (گلۆبالیزم) یان قبووڵە بە چاك و خراپیەوە، بەڵکو خراپی لێنابینن و ئامادەن زۆر بە دڵسۆزانە لاسایی بکەنەوە تەنانەت ئەگەر لەسەر حسێبی زمان و کولتوری نەتەوایەتیش بێت، بەڵام چونکە سەرچاوەکەی خۆرئاوایە ئەوا قبووڵکردنی سێ و دووی ناوێت، ئەمەیە فرەپێوەری !

**+ تا چەند هێزی ئیسلامیی کە هاتۆتە کوردستان ڕەچاوی ئاستی بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە کورد کردووە بەوەی کە زۆرداریی و دەسەڵاتی موتڵەقگەرایی بە سەردا نەسەپاندبێت و هەوڵی سڕینەوەی کولتورەکەی نەدابێت، تا ئێستا هیچ لە مێژوونووسان شتی لەم شێوەیان درکاندووە کەبەرامبەر بە کورد شتی لەو جۆرە کرابێت؟**

دکتۆر حەکیم: یەکێك لەم قەوانە سواوانەی زۆر لێدراوەو لێدەدرێتەوە ئەوەیە کە فتوحاتی ئیسلامیی گەیشتبێتە هەر ناوچەیەك قەتڵ و عامی خەڵکە سڤیلەکەی کردووەو وێران و تاڵانی وڵاتەکەی کردووەو تەڕو وشکی بەیەکەوە سووتاندووە. ئەم قسەیە کردنی زۆر ئاسانە بەتایبەتی لای کەسانێك کە بۆچوونێکی پێشوەختانەیان بۆ مەسەلەکان هەیەو هەر لە سەرەتاوە لە بیری

خۆیان ئەمەیان بڕاندۆتەوە کە ئاینیی ئیسلام و هەڵگرانی پەیامەکەی کەسانی توندو تیژو بکوژو تالانچی و خراپەکارو وێرانکار بوون و کاتێك کوردستانیان (داگیرکردووە!) چی خراپە هەیە بەخاك و خەڵکەکەی کردوویانە، وەك بڵێی پێش ئیسلام کوردستان وڵاتێکی ئازادو ئاوەدان و پڕ لە خێرو خۆشی و شارستانی بووبێت، نەك داگیرکراوو مافخوراوو دەست و پێوەندی داگیرکارە فارس و ڕۆمەکان بووبێت کە ئەمەیە واقیعەکە، لە هەمووش سەیرتر بەرگێکی زانستی لەبەردەکەن و هەر کەسێك وا بیربکاتەوەو بنووسێت بەبێ هیچ بەڵگەیەکیش ئەوە زانستخوازو ئەکادیمییە و بە پێچەوانەشەوە.

بەڵام لای کەسانی زانستخواز و ئەکادیمی و بەویژدان هەرگیز وا بە ئاسانی ئەم قسەیە ناکرێت، چونکە بەڵگە لۆژیکی و عەقڵی و مێژووییەکان پێچەوانەی ئەم بۆچوونەن، ئەگەر لە چەند سەرچاوەیەکیش کە دەیان هەزار لاپەڕەن و هەزاران گێڕانەوە (ڕیوایە)ی مێژوویان تێدایە، چەند ڕیوایەتێك تۆمارکرابن کە لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێناپەڕن و ئەوانیش لە یەکتر وەرگیراون، کە بە شێوەیەکی زیادەگۆیانە باسیان لە ڕووداوێك کردبێت کە توندوتیژی زۆرو کوشتاری زۆری تێداکرابێت بەرامبەر بە عەوامی خەڵك، ئەوە بە هیچ شێوەیەك، ئەگەر گریمان ڕاستیش بن —ناکرێت بەسەر سەراپای مێژووی ئیسلامدا بگشتێندرێت، چونکە ئەم حاڵەتانە شازو دەگمەن بوون، نەك گشتی.

جا ئەگەر چەند ڕۆژهەڵاتناسێکی داخ لە دڵ و بێ ویژدان بەدەر لە پێوەرە زانستیەکان ئەم ئاخافتنانەیان کردبێت و بە پێوەری واقیعی خۆرئاوا ڕوانیبێتیانە مەسەلەکان کە پێوەری ماددی و توندوتیژییەو مێژووی ئەوروپای پێناسراوە، هەروەها دەرچووانی قوتابخانەکانیان لە ڕۆڵەکانی میللەتانی ڕۆژهەڵات هەمان شت دووبارە بکەنەوە بەڵکو بەزیادەوەش (بە تایبەتی لە سەردەمی ناسیۆنالیزم کە هەموو میللەتانی موسڵمان هاندراون و تاودراون بە شێوەیەکی بەرنامەڕێژکراو) و مێشێك بکەنە گامێشێك و کێچێك بکەنە چیایەك.

ئەوە لە هەمانكاتدا چەندین ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونووس و نووسەری بوێرو بەویژدان دانیان بەوە داناوە كە موسڵمانان لە كاتی فەتحكردنی وڵات و ناوچەكان نموونەی لێبوردەیی و نەرمی و دادپەروەری بوون، خۆیان و ئایینەكەیان بەسەر دانیشتوانەكانیان نەسەپاندووە چونكە (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّين..)، (فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ...)، (..أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ)، (لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ)، بەڵكو سەرپشك كراوە لە نێوان موسڵمان بوون یان سەرانە (جزية)دا، ئەگەر لەسەر بیروباوەڕی ئایینی خۆیان بمێننەوەو مافە ئایینی و مەدەنییەكانیان پارێزراو دەبێت.

دیارە بڕی ئەم جزیەیەش دیاریكراو بووەو بە پێی باری گوزەرانی هەر تاكێكی (أهل الذمة) كە تا ڕادەیەكی زۆر شتێكی (ڕەمزی) بووە كە جۆرێك پابەندبوون بگەیەنێت بەرامبەر بە دەسەڵاتی ئیسلام، چونكە ئەوان لەسەریان نییە پشكداری سەربازی بكەن و لە پرۆسە سەربازییەكانی ڕۆڵیان هەبێت بە حوكمی ئەوەی موسڵمان نین و باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نییە، جا چۆن داوایان لێبكرێت كە بەرگری لێبكەن؟! ئەم بڕە پارەیەش هەروەها گوتمان زۆر كەم بووەو بە بەراورد لەگەڵ ئەم باج و سەرانەی پێشتر كوردەكان و غەیری ئەوان دەبووایە بیدەن بە دەسەڵاتدارانی ڕۆم و فارس.

لەلایەكی تریشەوە ئەم جزیەیە تەنها لەو پیاوانە وەردەگیرا كە توانای چەك هەڵگرتن و شەڕكردنیان هەبوو، واتە لە ژنان و منداڵان و پەككەوتووان و نابینایان و تەنانەت لە پیاوانی ئایینی وەرنەدەگیرا بە مەرجێك خاوەن موڵك و ماڵ نەبووبن. ئەم جزیەیەش جۆرێك نەبووە لەسزا لەبەرئەوەی ئیسلام نەبوون، بەڵكو لە بەرامبەر دابینكردنی ئەو پاراستنەبوو كە موسڵمانەكان بۆیان دابین دەكردن، چونكە وەرگرتنی جزیە لێیان مانای پارێزگاریكردنی سەروماڵیان، هەروەك (ئەبو یوسف) لە كتێبی (الخراج)دا باسی دەكات.

مێژوونووسی بەناوبانگی ئینگلیز (توینبی) دەڵێت: (لە وڵاتی ڕۆم و فارسەكان خەڵكان سەرپشك نەكراون لە نێوان ئیسلام و شمشێر، بەڵكو سەرپشك كراون لە نێوان ئیسلام و جزیە، ئەمەش پلانێكە جێگەی

دەستخۆشییە، چونکە ڕۆشنگەری پێوەدیارە، هەر ئەوەش بوو دواتر لە ئینگلتەرا پیادەکرا لە سەردەمی شاژن ئەلیزابێت).

(گۆستاف لۆبۆن) لە کتێبی (حضارة العرب) دەڵێت: (مێژوو کەسانێکی نەدیوە کە شوێنێك فەتح بکەن لە موسڵمانان بە بەزەییتربن)، هەروەها دەڵێت: (هێز فاکتەرێك نەبووە بۆ بڵاوبوونەوەی قورئان و موسڵمانەکان میللەتانیان بە ئازادی لە سەر ئاینیەکانی خۆیان جێهێشت)، هەروەها دەڵێت: (قورئان بە شمشێر بڵاونەبۆوە، بەڵکو تەنها بە بانگەواز بڵاوبۆوەو هەر بە بانگەوازیش میللەتان باوەڕیان پێی هێنا).

(ڕوبرنسون) لە کتێبی (مێژووی شارلکن) دەڵێت: (تەنها موسڵمانەکان جیهادو لێبوردەییان لەیەك کاتدا بەرامبەر شوێنکەوتووانی ئایینەکانی تر پیادەکرد، هەرچەندە بەسەریشیاندا زاڵبوون، بەڵام ئازادییان پێدان کە ڕێوڕەسم و بەندوباوە ئاینییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن).

(کۆنت هنری دی کاستری) لە کتێبی (الاسلام خواطر وسوانح)ی وەرگێڕانی (أحمد فتحی زغلول) دەڵێت: (موسڵمانان زۆریان لە کەس نەکرد بە شمشێر یان بە زمان بێنە ناو ئیسلام، بەڵکو ئیسلام خۆی بە خۆشەویستی و ویستی کەسەکە چووە ناو دڵان).

(تۆماس ئارنۆڵد) لە کتێبی (الدعوة إلى الاسلام) دەڵێن: (ئەگەر بڕوانینە ئەم لێبوردەییەی موسڵمانەکان بەرامبەر مەسیحییەکان لە سەرەتای حوکمی ئیسلام پیادەیان دەکرد دەردەکەوێت کە ئەم بیرۆکەیەی بڵاوبۆتەوەو دەڵێت بە هۆی شمشێرەوە خەڵك ڕوویان لە ئیسلام کردووە، ئەو زۆر دوورە لە ڕاستی).

هەروەها دەڵێت: (مەسەلەی زۆر لە خەڵك کردن تاکو بێنە ناو ئیسلام یان چەوساندنەوەیان بەهەر ڕێگەیەك، لە سەرەتاکانی فتوحاتی ئیسلامیی –کە کوردستانیش دەگرێتەوە– لە سەرچاوەکان هیچ بوونێکی نییە).

هەروەها لە شوێنێکی تری ئەم کتێبەدا دوای ئەوەی باس لە چەند هۆکارێکی لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ساسانی و هەرەسهێنانی ئایینی زەردەشت دەکات دوای هاتنی ئیسلام و فتوحات و مامەڵەکردنێکی باش و لێبوردەیی بەرامبەر

زەردەشتیەکان و پەرستگاکانیان، دەڵێت: (مەحاڵە بڵێین کزبوون و پاشەکشەکردنی ئایینی زەردەشتی بە هۆی ئەوەوە بووە کە موسڵمانەکان بە زۆر خەڵکیان کردۆتە ئیسلام، پێدەچێت ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوای وڵاتی فارس هەر لە سەرەتای فتوحات، ئیسلامیان قەبووڵکردبێت، بە ویستی خۆیان و لەکەشێکی هێمنی و ئاشتیدا).

مێژوونووسان شتی لەم جۆرەیان باس نەکردووە کە موسڵمانەکانی بەرایی لە کاتی فتوحات زۆردارانە مامەڵەیان لەگەڵ دانیشتوانی کوردستان کردبێت یان هەوڵ سڕینەوەی کولتورەکەیان دابێت، ئەمە تەنها (وەهمە)، پاشان کام کولتور؟ ئایا کورد پێش ئیسلام کولتوری دیار بووەو لە سەرچاوەکاندا باسی لێوەکراوە جگە لە هەندێك گریمانەی بێ سەرچاوەو بەڵگەنامەی باوەڕپێنەکراو؟

لەلایەکی تریش ئایینی ئیسلام و موسڵمانان گەیشتبێتە هەر ناوچەیەك بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری خەڵکیان لەبەرچاو گرتووە، هەوڵیان نەداوە بیانسڕنەوەو لە سفرەوە دەست پێبکەن یان کولتوری ڕەسەنی میللەتەکە فەرامۆش بکەن. بەڵکو هەر لایەنێکی کۆمەڵایەتی لە ئاکارو ڕەوشت، یان داب و نەریت یان بۆ ئەو یادەوەرییەکان بوو یان ئەدەب و هونەر، یان هەر شتێکی تر کە پێچەوانەی بنەماکانی شەریعەت نەبووبێت، ڕێزیان لێگرتووەو هێشتوویانەتەوە، بەڵکو پەرەی پێدراوەو بۆتە بەشێك لە پێکهاتەی شارستانی ئیسلامیی، یان هەندێك گۆڕانکاریی لەسەرکراوە تاوەکو بگونجێت لەگەڵ بنەماکانی شەرع.

لەلایەکی تریشەوە موسڵمانان کە دەسەڵاتیان لە کوردستان وەرگرتووە بەرپرسیارانە هەڵسووکەوتیان کردووە، چونکە ئەوان زۆر نزیکبوون لە سەردەمی پێغەمبەرو زۆربەیان لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون بەتایبەتی سەرکردەکان، واتە تا ڕاددەیەکی زۆر فەرمان و ئامۆژگاری و ڕاسپاردەکانی پێغەمبەرو خەلیفە ئەبوبەکریان لەبەرچاو بووە کە چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە فەتحکراوەکان کە تەنانەت هەستیان بە بەرپرسیارێتی لە ئاست درەخت و ئاژەڵ و بێگیانیشدا کردووە چ جای مرۆڤەکان، ئەم ڕاسپاردەیەی ئەبوبەکر کاتێك

یەکەم سوپا بەڕێدەکات دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەر لە گوێیان زرینگاوەتەوە کە داوا دەکات: داری تەڕو بەردار نەبڕن، ئاژەڵ نەکوژن بۆ خواردن نەبێت و ژن و منداڵ نەکوژن، تەنها ئەو کەسانەی چەك بەدەستن و شەڕکەرن، و پیاوانی ئاییی (لە هەر ئاینێك بن) نەکوژن و وازیان لێ بێنن لە پەرستگاکانی خۆیان خواپەرستی بکەن بە گوێرەی بیروباوەڕو تێگەیشتنی خۆیان.

نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت کە فەتحی کوردستان لەسەردەمی خەلیفەی دادوەر (عومەری کوڕی خەتاب) بووە کە هەمیشە لە خەمی خەڵك و دابینکردنی عەدالەتدا بووە، بۆیە پێشێلکارییەکانی لە سەردەمی ئەو زۆر کەم بوون، سەردەمەکەشی نموونەیی بوو، نەك لە مێژووی ئیسلام و ناوچەکە، بەڵکو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا.

**+ سێ هۆکاری گرنگ بەرمەبنای دواکەوتن وماڵوێرانی بوون بۆ کورد هەندێکیان لە مێژە، هەندێکیان نوێیە کە بریتیین لە: هۆکارە نێو خۆییەکان (شەڕی نێو خۆو خۆ خۆری)، هەروەها هۆکارە ئیقلیمییەکان (نەگونجانی وڵاتانی دراوسێ)، هۆکارە دەرەکییەکان یاخود نێو دەوڵەتییەکان کەئەمەیان نوێترە، هەروەکو م.س لازاریف دەڵێ: مەسەلەی کورد وەکو کێشەیەکی نێو دەوڵەتی لە سەرەتای چەرخی نۆزدەوە سەریهەڵداو لە سەدەی بیستەمیش دوای شەڕی یەکەمی جیهانی لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتی بایەخی زیاتربوو، پێتوایە تاوەکو ئەمڕۆ ئەو سێ هۆکارە ڕۆڵ دەبینن لە دواکەوتن و وەستانی قەزیەی سیاسی کورددا یاخود بەهۆی گۆڕان و پێشکەوتنە خێراکانی دنیاوە گۆڕانیش بە سەر ئەمانەدا دێت؟**

دکتۆر حەکیم: چەندین هۆکار بوونەتە مایەی دەردەسەری و شکستهێنانی کورد لە وەدیهێنانی مافە ڕەواکانی، لە پێشەوەی ئەم هۆکارانە: هۆکارە ناوخۆییەکان کە بەرجەستە دەبن، لە عەقڵیەتی خێڵەکی و پەیوەندییە دەرەبەگایەتییەکان و بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی سەرانی کوردو بنەماڵەکانیان و ململانێکردنی یەکتر و ڕازینەبوون بە حوکم و فەرمانڕەوایی یەکتر و

خۆسەپاندن، تەنانەت پەنابردنە بەر دوژمنی ئیقلیمی یا دەرەکی لە لایەن سەرکردیەکەوە لە دژی سەرکردەی هۆزێکی تر یا گرووپێکی تر، کاتێك بزانێت بەرژەوەندییەکانی لەژێر هەڕەشەدایە، بۆیە بەردەوام کورد لە یەك کاتدا خاوەنی چەندین سەرکردە بووە کە ڕکابەری یەکتربوون و لەپێناو بەدیهێنانی حەزو ئارەزوو تموحە شەخسیەکاندا هیچیان نەخوێندۆتەوە، نە عورف و نەئایین و نە هەستی نەتەوەیی و نە بەرژەوەندی کەس و لایەنانی دیکە.

هەروەها وڵاتە ئیقلیمیەکان پشت بەستوو بە زلهێزە خۆرئاواییەکان هەر جموجوڵ و بزاڤێکی کوردی بە هەڕەشە دەزانن و قبووڵی ناکەن، چونکە سیستمەکانیان سەرسەخترین سیستمی ناسیۆنالیزمی شۆفینیزمە کە غەیری دەسەڵاتی تاك نەتەوەیی و (سەردەستی) ڕەتدەکەنەوە، جا ئەم سیستمانە بە پیرۆزی دەڕواننە سنوورە جوگرافیەکانیان و دانیشتوانەکانیشیان بەچاوپۆشی لە ڕەگەزو نەتەوە بە بەشێکی جیانەکراوە لە وڵاتەکانیان دەزانن هەرچەندە لە ڕووی مامەڵەو مافەوە بە هاووڵاتی پلە دووش دادەنێن.

جا ئەگەر رۆژێك لە ڕۆژان بە حوکمی دراوسێیەتی جوگراف و پەیوەندییە مێژوویی و ئاینییەکان، نەتەوەو زمانە جیاوازەکان لە ناوچەکەدا، لەژێر سایەی یەك چەترو یەك سیستم کۆبووبنەوە بێ جیاوازی، ئەوا ئەمڕۆ بە حوکمی گۆڕانکارییەکانی دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و نەمانی خیلافەت و دروستبوونی چەندین دەوڵەت و قەوارەی نەتەوەیی، حوکمەکانیش گۆڕاون و کوردیش مافی ئەوەی هەیە کە چاو لە دەوروبەری خۆی بکات و ڕازی نەبێت بە حوکمی سەردەستی و خۆسەپاندنی نەتەوەیەکی دیاریکراو لەژێر هەر پاساوێکدا بێت.

سەبارەت بە هۆکارە نێودەوڵەتیەکانیش ئەوا ئێجگار کاریگەرن و تەنانەت دەتوانن کار لە هۆکارە ئیقلیمییەکانیش بکەن و لاوازیان بکەن ئەگەر بیانەوێت، چونکە هەر زلهێزەکان بوون کە ئەم واقیعە ئیقلیمیە تاڵەیان خولقاند لەسەر حسێبی نەتەوەی کوردو مافەکانی، هەر ئەوانیش درێژەپێدەری سیاسەتی پشتگیریکردنی سیستمە ناسیۆنالیستیەکانی ناوچەکەن و زەمانەتی مانەوەیانن

به‌هۆی هاوکێشه‌ی به‌رژه‌وه‌ندییه هاوبه‌شه‌کانیان مانه‌وه له ده‌سه‌ڵاتداو به‌رامبه‌ر به‌بردنی خێرو بێری وڵاته‌کان و پابه‌ندبوون به سیاسه‌تی زلهێزه‌کان له ناوچه‌که‌و لێ لانه‌دانی.

ئه‌وه‌ی زیاتریش باره‌که‌ی ئاڵۆزکردووه‌و ناعه‌داله‌تیه‌که‌ی چه‌ند جاره‌کردۆته‌وه سیستمی تاك جه‌مسه‌ری جیهانیه که تاکه زلهێزێك بڕیار له‌سه‌ر مه‌سه‌له جیهانیه‌کان و چاره‌نووسی وڵات و نه‌ته‌وه‌کان ده‌دات، له‌مه‌شدا جگه له به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانی خۆی هیچ شتێکی تر له‌به‌رچاو ناگرێت، ئه‌گه‌رچی به سیستمی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و مافه مه‌ده‌نیه‌کان و به‌رگریکردن له میلله‌ته چه‌وساوه‌کان و وه‌ستان دژی سیستمه دیکتاتۆریه‌کان خۆی ده‌ناسێنێت. که‌چی ئه‌م ناعه‌داله‌تی و دووره مافی مرۆڤه له‌م سه‌رده‌مه‌دا گه‌یشتۆته ئه‌وپه‌ڕی و پێشتر مرۆڤایه‌تی حاڵه‌تی وای به‌خۆیه‌وه نه‌بینیوه که هه‌رچی ئه‌و بیکات و بیڵێت ڕاست و دروست و یاسایی بێت و هه‌رچی غه‌یری ئه‌ویش بیکات و بیڵێت ئه‌گه‌ر پێچه‌وانه‌ی ویست و بڕیاری ئه‌و بێت، ئه‌وا ناهه‌قه و سه‌رپێچیی یاساو مافی مرۆڤه، هه‌ر ئه‌م سیاسه‌ته‌ش وایکردووه که هه‌ندێك جار له ڕووانگه‌ی به‌رژه‌وه‌ندییه خۆرئاواییه‌کان، کورده‌کانی پارچه‌یه‌کی کوردستان دیموکراسیخوازو له‌سه‌ر حه‌ق بن، له هه‌مانکاتدا کورده‌کانی پارچه‌یه‌کی تر تیرۆریست بن و جیاخواز بن.

سه‌ره‌ڕای گۆڕانکارییه خێراکانی دنیا که‌چی له‌وه‌ناچێت له مه‌ودای بینراو مه‌سه‌له‌ی سیاسیی کورد له ناوچه‌که چاره‌سه‌رێکی بنه‌ڕه‌تی و دادپه‌روه‌رانه بکرێت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م سیستمه نه‌ته‌وه‌ییانه‌ی له ناوچه‌که‌دا به‌رژه‌وه‌ندییه‌کانی ئه‌مریکا و خۆرئاوا ده‌پارێزن و به (ئه‌مانه‌ت) بڕگه به بڕگه‌ی سیاسه‌ته‌کانیان جێبه‌جێ ده‌که‌ن، کوردیش تاکو ئه‌مڕۆش نه‌یتوانیوه ببێته یاریزانێکی سیاسیی شاره‌زاو چاوکراوه له گۆڕه‌پانی جه‌نجاڵ و ئاڵۆزی هاوکێشه و په‌یوه‌ندییه نێو ده‌وڵه‌تییه‌کان، ته‌نانه‌ت تاکو ئێستا له نێو خۆشیان مه‌سه‌له و خاڵه سه‌ره‌کیه‌کانی مه‌سه‌له‌که‌یان به ته‌واوی ساغ نه‌کردۆته‌وه‌و هه‌ر کۆمه‌ڵێکی سیاسیی به گومانه‌وه ده‌ڕوانێته پڕۆژه‌و به‌رنامه‌و جمووجۆڵه‌کانی ئه‌ویتر،

بێگومان تا ماڵی ناوخۆش ڕێك نەخرێت مەحاڵە بتوانێت پشتیوانی دەرەکی (سیاسیی) ڕاستەقینە بەدەست بهێنێت، نەك پشتیوانی (مرۆییانەو سۆزدارانە).

لەلایەکی تریشەوە سروشتی پڕ خێرو بێری کوردستان و دەوڵەمەندی لە ڕووی دەرامەتەکانی نەوت و ئاو بە تایبەتی، تاکو ئێستاش هەروەك خۆیەتی و لەبن نەهاتووەو تاکو ئێستا مایەی چاوتێبڕین و کەمەندکێشکردنی وڵاتانی دنیایە، تا ئەم خێروبێرەش بەردەوام بێت ئەوا وا باشە بۆ ئەمریکا و خۆرئاوا کە کێشەی کورد بنەڕەتانە چارەسەرنەکرێت، لە باشترین حاڵەتیشدا کوردەکانی دانیشتووی هەر پارچەیەکی کوردستان لە سنووری وڵاتەکەدا جۆرێك لە حوکمی خۆجێیی پێ بدرێت و لە حاڵەتێکی گریمانەیی (دووری) لەوەش باشتر لە هەر پارچەیەك زۆربەی (نەك هەمووی) ناوچە کوردنشینەکان دابڕدرێت و قەوارەیەکی نەتەوەیی (لاواز)ی لەسەر دابمەزرێت و هەریەکێك لەم قەوارانەش بکەونە ململانێ لەگەڵ یەکتری لەلایەك و لەگەڵ ئەم دەوڵەتانەی لێیان جیابوونەتەوە لە لایەکی تر. بەڵام دروستبوونی کوردستانێکی گەورەی یەکگرتوو بە پێوەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکان و لە مەودایەکی دووریش، بەویست و ڕەزامەندی ئەمریکاو خۆرئاوا مەحاڵە بێتەدی، چونکە سیاسەتی ئەوان لەتلەتکردنە نەك یەکگرتنەوە.

جا چاوەڕێکردنی ئەملاوئەولا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد تەنها دڵدانەوەو دڵخۆشکردنە، ئەگینا ئەرکی سەرەکی ئەم پرۆژەیە دەکەوێتە ئەستۆی هەر تاکێکی کورد لە گشت پارچەکانی کوردستان، لە ڕێگەی بیرکردنەوەی واقیعیانە نەك عاتیفیانەو خۆهۆشیارکردنی و ناسینی دۆست و دوژمن و لێك جیاکردنەوەیان و گەڕانەوە بۆ ئەزموونە مێژووییەکان و پەندو سوود لێوەرگرتنیان، ڕوانینە مەسەلەکان و پێشهاتەکان بە شێوەیەکی سەردەمیانە و مامەڵە لەگەڵ یەك کردن بە شێوەیەکی مەدەنیانە، نواندنی خۆنەویستی لەسەر هەموو ئاستەکان، هەروەها کۆبوونەوە لە دەوری کەسایەتیەکی ڕابەری دڵسۆزو بوێرو خۆنەویست و شارەزا کە بەرژەوەندییە باڵاکانی نەتەوە لە سەرووی هەر ئیعتبارێکی تردا دابێت.

بەر لەمانەش هەموو بوونی پرۆژەیەکی نەتەوەیی بەرنامە ڕێژکراوی درێژخایەن و کار لەسەرکردنی وێڕای مامەڵەکردنی سیاسیانەی داناییانە لەگەڵ دەوروبەرو وڵاتانی دیکە.

لە کۆتاییدا دەڵێم: زۆرجار لە مێژوودا هەندێك گۆڕانکاری لەناکاو، چاوەڕوان نەکراو ڕوودەدەن کە پێشبینی و گریمانەکان هەڵدەوەشێننەوە کە بە هۆکاری (قەدەر) گۆڕانکاری مرۆیی یان سروشتی گەورە ڕوودەدان.

جا لەم حاڵەتەدا یان لە حاڵەتی پەیدابوونی دوو یا چەند هێزێکی جیهانی ڕکابەر، ئەوا لەوانەیە هاوکێشەکان و مەزەندەکان گۆڕانکارییان بەسەردا بێت و بەدیدێکی تر سەیری کێشەو مەسەلەکان بکرێت، بەڵام لەمانە گشتی گرنگتر ویست و کارکردن و خەباتی میللەتە کە ئەگەر هەوڵ و وزەکانیان یەکبخرێن و دروست ئاراستە بکرێن ئەوا زوو یان درەنگ مافە بنەڕەتیەکان دەستەبەر دەبن و ئەوەی تا ئەمڕۆ خەون و ئومێدو خەیاڵە دەبێتە ڕاستیەکی خۆسەپێنەر و واقیعێکی چاوەڕوانکراو.

**+ بەشێوەیەکی گشتی تا چەند کورد لە ژێر کاریگەری کولتوری داگیرکەراندا کولتوری خۆی بونیادناوە ؟**

**دکتۆر حەکیم:** دەستی قەدەر وایکردووە کە کوردستان کۆگەی خێر و بێرو سامانە سروشتیەکان بێت، هەر لە سەرچاوەکانی ئاو (ڕووبارەکان و کانی و کانیاو و بیرەکان) و کانەکانی نەوت و کانزاکانی ترو گونجانی ئاووهەواو خاکەکەی بۆ هەموو جۆرە بەرهەمێکی کشتوکاڵی و هتد. دیارە لە قورئانی پیرۆزدا باس لە پیت و بەرەکەتی کوردستان کراوە، لە ڕووداوی لافاوی سەردەمی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێ بێت)، کاتێك لەناو کەشتیەکە لە پەروەردگار دەپاڕێتەوەو دەڵێت: (خوایە دامبەزێنەو لەنگەر بە کەشتیەکەم بگرە لە جێگەیەکی پیرۆز و بە بەرەکەت)، (ئینجا کەشتیەکە لە ئاقار کێوی جودی لەنگەری گرت).

بەڕاستی زیادە گۆیی نییە ئەگەر بڵێین کوردستان بە سنوورە جوگرافیە مێژووییەکەی دەوڵەمەندترین وڵاتی ناوچەکەیە کە سامانەکانی لە بن نایەن و

کۆنترۆڵکردنی ئەم وڵاتە باڵادەستی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ خۆی مسۆگەر دەکات، ئەوەتا سەرچاوەی سەرەکی هەردوو سامانی سروشتیە (ئاو و نەوت) کە بوونەتە هۆی ململانێی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی لە سەری کە تا ئایندەیەکی نادیار بەردەوام دەبێت.

دەتوانین بێ دوودڵی بڵێین کوردستان خاوەن ئابووریەکی تەواوو تێروتەسەلە کە لە هیچ لایەنێکی سەرەکی کەم نییە، بەڵکو بە هۆی داهات و خێروبێرەکانی ئەگەر وەبەربهێنرێن زۆریش زیاد دەکات و تاکی کورد دەبێتە خاوەن بەرزترین ئاستی داهات لە جیهانداو تەنانەت لە ئاستی داهاتی وڵاتانی کەنداویش تێدەپەڕێت، چونکە تاکە سەرچاوەی داهاتی ئەوان نەوتە کەچی هی کوردستان جگە لە نەوتو ئاو و کانزاکان و کشتوکاڵ و گەشت و گوزاریش دەگرێتەوە..

بەڵام بەداخەوە دیارە هەڵکەوتەی جوگرافی سەختی و شاخاوی ناوچەکە کە ڕەنگیانداوەتەوە لەسەر پێکهاتەی دەروونی و کۆمەڵایەتی دانیشتوانەکەی کە لە خێڵایەتی و پەیوەندی کۆمەڵایەتی سنووردارو کورتبینی و هەست نەکردن بە بایەخ و گرنگی وڵاتەکەیان و دەوڵەمەندی خۆی دەبینێتەوە، لەلایەك و دابەشبوونی ناوچەکە بەسەر دەوڵەتە ئیقلیمیەکان دوابەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی، بە پێی بەرژەوەندی دەوڵەتە زلهێزەکان و ڕێگەدان بە سیستمە ناسیۆنالیستە فاشیستەکانی کوردیان بەسەردا دابەشکرا، لە لایەن زلهێزەکانەوە توندترین سیاسەتی تواندنەوەو قڕکردن و کۆچ پێکردن و دەربەدەرکردن و سەرکوتکردن و چەوسانەوە لە دژی کورد پەیڕەو بکەن، بۆ ئەوەی کورد نەك بیر لە قەوارەیەکی نەتەوەیی کە گشت پارچەکان بگرێتەوە نەکاتەوە، بەڵکو کوردی دانیشتوانی هەر بەشێکیان تەنها لە بیرلەخۆکردنەوە دابن و لە هەوڵی ئەوەدابن چۆن بەرپەرچی ئەم داگیرکاریە شۆفێنیزمە ببنەوە کە باڵی بەسەریاندا کێشاوە لە ڕێگەی چەندین شۆڕش و ڕاپەڕین کە هەموویان بە پشتیوانی زلهێزە ئەوروپیەکان کپکراونەتەوەو لە باربراون، هەرچەندە ئەم دەوڵەتانە لە ڕاگەیاندن و ئەدەبیاتەکانیان داکۆکی لە مافەکانی مرۆڤ و مافی میللەتان دەکەن لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان! بەڵام لە ڕاستیدا لە پێناو بەرژەوەندییەکانی

خۆیان ئامادەن هەموو بەها مرۆڤایەتی و ئەخلاقیەكان بخەنە ژێر پێی خۆیانەوەو بازرگانی بە گیانی ملیۆنەها مرۆڤ بكەن، جا بەڕاستی نەخۆشی و كێشەو گرفتە ناوخۆییەكان كە لە بەشێكیاندا زلهێزەكان بەرپرسیارن و تاكو ئەمڕۆش ڕەواجیان پێدەدەن و گەرمیان دەكەن، ئەوەندە زۆرن كە بەشێكی زۆری كورد تەنانەت لە ئاستە بەرزەكانیش (كوردستانێكی گەورە) بە خەون و خەیاڵ بزانن كە بەدیهێنانی مەحاڵ بێت بەلایەنی كەمەوە لە مەودای بینراودا. واش پێدەچێت سەركردایەتی كورد هەست بەوە بكات كە بە پشت بەخۆبەستن ئەستەمە كورد نەك لە كۆی نیشانە دابەشكراوەكەی بەڵكو لە هەر بەشێكیش بگاتە مافەكانی خۆی لە سنووری (دەستكردی ئەوروپی) دەوڵەتە ئیقلیمیە داگیر كەرەكاندا. دیارە ئەوەش ئەگەر لە ڕوانگەی بەرژەوەندی و پەیوندییە نێودەوڵەتەكانیان سەیری بكەین لەوانەیە جۆرێك لە مەنتیقی تێدابێت، بەلام لە هەمانكاتیشدا فەرامۆشكردنی یاخود پەراوێزكردنی هێزو وزە ناوخۆیی و خودییەكانە لە سەرووی هەموویانەوە بەدەستهێنانی (متمانەی میللیە) كە سەرمایەی بنەڕەتی بەدیهێنانی هەموو ئامانجێكەو سەركەوتنی ڕاستەقینە مسۆگەر دەكات.

كەواتە بەكورتی واقیعی كۆمەڵگەی كوردی كە لە قۆناغی سەرەتای پێگەیشتنیدایە، هەروەها سیاسەتی داگیركاری و داپڵۆسێنەرانەی وڵاتانی ئیقلیمی و پێشخستنی بەرژەوەندی كۆمەڵ و گرووپ و خێڵ و بنەماڵەو تاكەكەس بەسەر بەرژەوەندی گشتی و نەتەوەیی، سەرەڕای سیاسەتی دەرەكی خۆرئاوا كە تاكو ئەمڕۆ بەرژەوەندییەكانیان وا دەخوازێت میللەتی كورد بە دابەشكراوی بمێنێتەوەو بەشێك بێت لەم وڵاتەی كە پێشتر سنووری بۆكێشراوەو بە زۆری زۆردار كورد كراوەتە بەشێك لە پێكهاتەكەی وە لە باشترین حاڵەتیشدا لەوانەیە خۆرئاوا بە پێی بەرژەوەندییەكانی فشار بخاتە سەر دەسەلاتدارانی وڵاتە ئیقلیمیەكان كە پشتگیریان دەكات، چەند مافێكی سەرەتایی كولتوری و سیاسیی بدەن بە كوردەكان، بەلام هەر لە سنووری جوگرافی هەر وڵاتێكدا وەك

ئەوەی بیرکردنەوە لە بەزاندنی ئەم سنووره تاوانێکی گەورە بێت یان دەرچوون بێت لەسەر یاسا نێودەوڵەتیەكان و سەروەری وڵاتان !

جا لە واقیعێکی ئاوادا کورد ناتوانێت خێرو بێرەکانی خۆی بۆ خۆی بەرکابهێنێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە وەك چەکێك لە دژی خۆی بەکاردەبرێن.

**+ مەسەلەیەك هەیە دەڵێ: هەرکەس کۆنترۆڵی هەموو کوردستان بکات باڵادەستی لەڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاستدا بۆخۆی دابین دەکات، ئەوەش بووەتە زیان بۆ کورد، ئەی کورد بۆخۆی ئەو سوودەی لێ نەبینی ؟ لەلایەکی تر هەستدەکەیت شکستیەك لەدەروونی کورددا هەبێت هەمیشه خۆی بەکەم ومەزڵووم و بێهێزوو دۆڕاو زانیوەو داوای مافی خۆکردنی کەمبووەو بەرگری زۆر بووە.؟**

دکتۆر حەکیم: بەداخەوە ئەزموونە مێژووییەکان سەلماندوویانە کە کورد لە رووی سیاسییەوە بە ئاسانی فریودەدرێت و دەخەڵەتێنرێت، تەنها چەند ڕستەو دەستەواژەو وتەیەکی شیرین و بریسکەداری بێ بنەماو ناوەڕۆك بەسە بۆ ئەوەی قەناعەت بێنێت و ڕازی بێت بەم پلان و بەرنامەیەی لەسەری دەوروژێنرێت لەلایەن هەر کەس و وڵات و لایەنێکەوە، شکستیە یەك لە دوای یەکەکان میللەتی کوردیش کە لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا دووچاری هاتووە لە لایەکەیەوە ئەنجامی ئەو خۆشباوەڕییە بووە، کەچی لە ناوخۆدا بێ متمانەیی لە نێوان سەرانی کورد لە هەر ئاستێکدا بووبن یەکێك لە خاسیەتە هەرە دیارەکانی کەسایەتی کوردییە.

لە هەمانکاتیشدا، نەبوونی متمانە لە ناو ناخی تاکی کوردو هەستکردنی بە بێ چارەیی و بێ دەسەڵاتی وایکردووە کە هەر مۆدەو گۆڕانکاری و کولتورێك کە سەرچاوەکەیان لە دەرەوەی واقیعی کۆمەڵگەی کوردستانی بێت، بە نەرم و شلی وەربگیرێت و بە چاوی گەورەیی و پۆزەتیڤانە سەیربکرێت، تا وای لێدێت شوێنی کولتوری ڕەسەنی کوردی بگرێتەوە، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە تاچەند لەگەڵ واقیعی خۆمان دەگونجێت و زیان بە بنەماو نەگۆڕە کولتورییە ڕەسەنەکەمان ناگەیەنێت کە بەشێکە لە تایبەتمەندی مێژوویی و کولتوری و ناسنامەی کەسایەتی نەتەوەییمان، هەربۆیە تاکو ئێستاش دەبینین کەسایەتی

كولتوریمان لێڵاوی و تەماوییەو بە هۆی كاریگەری توخمە كولتورییە بیانییەكان سەربەخۆ نییەو شێواوی و هەڵبزڕكاوی پێوەدیارە.

بەڕاستی كاریگەری كولتوری داگیركەرانی خۆرئاوایی و ئیقلیمی ئەوەندە زۆرە تا ئەو ڕاددەیەی گەیشتۆتە شێوازی بیركردنەوەو هەنگاونان لە لایەن دەسەڵاتداران و ڕۆشنبیران و هەوڵی سەرەكی ڕێژەیەكی بەرچاو لەو چین و دەستانەی لە ریزی پێشەوەی بڕیاردان و قەڵەم بە دەستان، خۆنزیككردنەوە بێت لە داگیركەران و دوژمنانی مێژووی گەلەكەمان لەپێناو ڕازیكردنیان و خۆچوواندن پێیان و لاساییكردنەوەی توتیانەی ئەوان لە زۆربەی بوارەكاندا.

هەروەها ئەم شكستە دەروونیەی بەسەر تاكی كورددا هاتووە چ لە ئاستی بڕیار بە دەستان بێت یان لە ئاستی كەسێكی ئاسایی كە بێگومان ئەوەش كەڵەكەبوو درێژبوونەوەی مێژوویەكی دوورودرێژە لە كۆیلایەتی و پاشكۆیاتی و ژێردەستەیی، كاردانەوەی خراپی لێكەوتۆتەوە كە هەمیشە كورد خۆی بە بێ دەسەلات و ستەملێكراو دەزانێت و وا قەناعەتی هاتووە كە ئەم حاڵەتە نائاسییە هەر بەردەوام دەبێت و هەمیشە لە هەڵوێستی بەرگریدابێت نەك هێرشبەر و زیندوویی لە بەگژاچوونی داگیركەران و سەندنی مافەڕەواكانی خۆی، چونكە ماف دەسەنرێت و نابەخشرێت، بەتایبەتی لە سەردەمی ئەمڕۆدا كەسێك یا نەتەوەیەك هەرچەندە خاوەن ماف بێت نابێت چاوەڕێی لایەن و هێزی دەرەكی بكات كە بۆی بگەڕێیننەوە، ئەگەر خۆی لە پێگەیەكی بەهێزدا نەبێت و لێبڕاوانە هەوڵی وەدەستهێنانی نەدات. بەڕاستی ئەم وتەیە كە زۆرجار دووپات دەكرێتەوە لە نێوەندەكان خەڵك كە دەڵێت: (كورد قەت ناگاتە مافی خۆی)، (كورد خۆخۆرن)، (كورد هەردەم ناتەبابوون)، (كورد خاوەنی هیچ نییەو نابێتە هیچ)، (كورد نۆكەرایەتی بێگانەی پێخۆشە)..هتد.

جا ئەمە گوزارشتێكە لەم شكستە دەروونییەو بێمتمانەییەی لە ئەنجامی كەڵەكەبوونی ئەزموونە مێژووییە تاڵەكان بەسەر تاكی كورددا هاتووە، كە لە حەقیقەتدا (خۆكوشتنە) یا خۆبەدەستەوەدانەو بڕیاردانە لەسەر ئەوەی كە كورد هەروا دەمێنێتەوەو قابیلی گۆڕان و ڕاستكردنەوەی هەڵە مێژووییەكان نییە، كە

ئهمه بیرکردنهوهیهکی ههڵهیه، چونکه زۆر له میللهتانی تر ڕۆژێك له ڕۆژان خاوهنی هیچ نهبوونهو گرفت و کێشهی ناوخۆییان ئێجگار زۆر بووه بهڵام ئێستا گۆڕاون.

خۆڕزگارکردنیش لهم واقیعه تاڵه پێویستی به ههوڵ و کۆششی جددی ههیه لهلایهن دڵسۆزان و لێزانان، ههروهها دهستنیشانکردنی کهموکورتی و خاڵه لاوازهکانی ئهزموونه مێژووییهکان و ڕاستکردنهوهیان به بیرکردنهوهی تازهو تێڕامانی ووردترهوه.

**+ بۆچی سهرکردهیهکی نهتهوهیی ههمهلایهن و بیرمهندێکی گهورهی کورد دروست نهبووه که دهسهڵاتی ناوچهیی تێپهڕێنێ و ههموو لایه یهك بخات و ئاراستهیان بکات ؟**

دکتۆرحهکیم: بهڕاستی ئهم حاڵهته پێویستی به لێکۆڵینهوهو بهدواداچوونی ورد ههیه. ئێمه له مێژووی کوردی سهدهکانی ناوهڕاستدا (له سهردهمی ئیسلام) نموونهی دهرکهوتنی کهسایهتی کوردی ناوداری زۆرمان ههیه له بواره جیاجیاکانی سهربازی و سیاسیی و زانستی...هتد، بهڵام ئهوهی جێی سهرنجه پێگهیشتن و گهشهکردنی ئهم بلیمهت و ناودارانه زیاتر له دهرهوهی کوردستان بووه، واته کاتێك دهرفهتیان بۆ ڕهخساوه و قهدهر له نیشتمانی دایك دووری خستوونهتهوه جا به هۆکاری زانستی یان سیاسیی یان سهربازی یا کۆمهڵایهتی یا ئابووری بووبێت، ئهوا جێ پهنجهو نهخشیان له مێژوو و شارستانێتی ئیسلامییدا دیاربووه، ههرچهنده ئهوان نکوڵیان له ڕهچهڵهکی خۆیان نهکردووه، بهڵام به حوکمی پێوهرهکانی سهردهم و (جیهانی)بوونی ئیسلام، ئهوانیش له سنوورێکی بهرفراوانتر له جوگرافیاو نهتهوهو زمان..هتد له بوارهکانی خۆیان کاریانکردووه و بهرههمیان ههبووه ههروهك ههموو میللهتانی تری سهردهمی خۆیان که چهتری ئیسلام کۆی کردبوونهوه.

بۆیه زۆرجار واقیعی جوگرافی دهبێته بهربهست لهبهردهم داهێنان، کاتێك کهسێك دهچێته واقیعێکی تری (شارستانی)و چاوی به دهوروبهر دهکهوێت و له

سنووری تەسکی ناوچەی شاخاوی دەردەچێت و پەیوەندی بە خەڵکانی ترەوە دەکات، ئەمە یارمەتیدەر دەبێت بۆ ئاسۆیەکی فراوانترو ڕوونتر..

لە سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچی - دوانزەم و سیانزەمی زایینی کەسایەتیەکی کوردی وەك صەلاحەددینی ئەیوبی کە لە ژینگەیەکی ناکوردی چاوی کردەوەو پێگەیشت، هەرچەندە باوك و باپیرانی لە کوردانی ڕەسەنی ڕەوادی هەزبانین کە لە (دوینی) ئەرمەنستان دەژیان، دواتر ئەوێیان جێهێشت بەرەو تکریت، موسڵ، شام کۆچیانکرد، ئەم کەسایەتییە کە خاوەن بیرو بەرنامەو پرۆژەیەك بوو کە بۆ سەردەمی ئەو زۆر پێویست بوو، ئەویش یەکخستنی جیهانی ئیسلامیی بوو ڕزگارکردنی لە پەرتەوازەیی و خۆخۆری و خۆکوژی لە پێناو ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسی و داگیرکاری ئەوروپیە خاچدروشمەکان بوو.

جا لەم قۆناغە هەستیارەدا صەلاحەدین ئەوەی پلانی بۆ داڕشتبوو، بە دڵسۆزانەو بوێرانەو لێبڕاوانە کاری بۆ دەکرد هاتەدی و کوردێك و بنەماڵەیەکی کوردی توانیان ڕابەرایەتی جیهانی ئیسلامیی بکەن لە قۆناغێك لە قۆناغە مێژوویيە هەرە هەستیارو ترسناکەکاندا، بەڵێ سەلاحەدین توانی لاپەڕەیەکی سەروەری لە مێژووی ئیسلام بۆخۆی تۆمار بکا، هەرچەندە ئەو بیری لە ناوبانگ نەدەکردەوە، بۆیە بە نەمری مایەوە، چونکە بە دڵسۆزی و خۆنەویستی کاری دەکرد، لە هەمانکاتیشدا بوو بە نموونەیەك لە مرۆڤایەتی و لێبوردەیی و دادپەروەری کە لە ئەوروپا دەنگیدایەوەو لە سەردەمی (ئومەمیەتی) ئاینیی لە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، صەلاحەددین بووە سومبولی مرۆڤایەتی و لە ڕێگەی ئەوەوە ناوی کورد چووە ناو مێژووی ئەوروپاوە کە لە سەرچاوەکانیشدا بە پێشەنگ و سوارچاك و سەرکردەی جەنگ و ئاشتی ناسراوە، کە لە ڕەوشت بەرزیدا هاووێنەی نەبووە.

مەبەستمان ئەوەیە دەکرێت کەسایەتییەکی کوردی سەرکردەو بیرمەند و نەتەوەیی هەڵبکەوێت بە مەرجێك لە مەرجەکانی سەرکردایەتی ڕاستەقینەو پێشەنگی ڕاستەقینەی تێدادێتەدی خاوەن پرۆژەو بەرنامەیەکی دیاریکراو بێت

که دڵسۆزانه و خۆنەویستانه خەباتی بۆ بکات نەك ببێته بەشێك له پڕۆژەو بەرنامەی ناحەزان و نەیاران جا هەستی پێبکات یان نا !

دیاره ئێمه به حوکمی سروشتی جوگرافی و واقیعی کۆمەڵایەتی خێڵەکی کەسایەتی سەرکردەیی ناوچەیی و عەشایری زۆرمان له نێودا هەڵکەوتووه، بەڵام هەر سروشت و واقیع و شێوازی بیرکردنەوەیه که تاوەکو ئێستا وایکردووه ئەم جۆره نموونانەمان لەناودا هەڵنەکەوێت لەوانەیه ئەگەر کەسێکی واش هەڵکەوتبێت یان هەڵکەوێت ئەوا بەرەو ڕووی ناڕەزایی و ئیرەیی کەسایەتییه ناوچەییەکان دەبێتەوه، که به هیچ شێوەیەك ڕازینابن بەرژەوەندییه تایبەتیەکانیان هەرەس بهێنن، جا هەر زووبەزوو به توانای تایبەتی خۆیان یان به پشتگیری هێزی دەرەکی ئامادەن هەر هەوڵێکی لەم شێوەیه لەبارببەن به بەکارهێنانی هەموو جۆره شێوازێك، ئەمه سەرەڕای هۆکاری دەرەکی که ئامادەیه ڕاستەوخۆ دەخالەت بکا له حاڵەتێکی لەم شێوەیەدا.

## پرۆفیسۆری یاریدەدەر، سەلام ناوخۆش
## پسپۆڕی زانستی زمان و مێژوو لە زانكۆی صەلاحەددین. هەولێر



**دامەزراندنی حكومەتێكی كوردی لە هەر پارچەیەكی كوردستان هەڕەشەیەك بووە لە ئینگلیزو دیكتاتۆرە دەستكردەكان دەكرا.**

ـ ١٩٦٦ له دایكبووه.

ـ قۆناغەكانی خوێندنی له هەولێر تەواو كردووه.

ـ ١٩٩٦ ماستەری له زمانی ئینگلیزیدا وەرگرتووه.

– له ساڵی ٢٠٠٥ بۆته پرۆفیسۆری یاریدەدەر، ئێستا قوتابی دكتۆرایه له زانكۆیەكی بەریتانی

ـ ١٩٨٧ بابەتو نووسینی بڵاوكردووەتەوه.

ـ له بواری مێژووی سیاسییدا چەندین كتێب و نووسراوی چاپكردووه كه بریتین له:

١ـ كوردستان چۆن داگیركراو دابەشكرا؟

٢ـ سێكوچكەی هەرەس.

٣ـ هۆكارەكانی لكاندنی ویلایەتی موسڵ بەعێراقی عەرەبی.

٤ـ ململانێی تورك و ئینگلیز.

٥ـ دۆزی كورد له نێوان بەرداشی سۆڤیەتو ئەمریكادا.

٦ـ احتلال و تقسیم كردستان.

٧ـ لۆزانی ١٩٢٣و لۆزانی ١٩٩٠.

٨ـ مافی مێژوویی غەیرە كورد بەسەر كوردستان. ؟

٩– ئایین و ناسیۆنالیزم

١٠– شێخ مەحموود و سێ ئەفسەرەكە

١١–فەشەلی عەلمانیەكان و غیابی ئیسلامیەكان

ـ له بواری وەرگێڕان:

١٢ـ قورئان و زانستی نوێ.

١٣ـ كرۆنۆلۆژیای مەسەلەی موسڵ.

١٤ـ كوردو كوردستان.

١٥– نۆ چیرۆك له بارەی خەڵكەوه

ـ لەبواری زمانەوانی:

١٦ـ سارا بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی.

١٧ـ زمانناسی و چەند بابەتێکی زماناسی کوردی .

١٨ـ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد، ئینگلیزی ـ کوردی.

١٩ـ فەرهەنگی گیرفانی ئۆکسفۆرد ینگلیزی ـ کوردی.

٢٠ـ ئاین و زمانناسی ، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری.

٢١ـ چەند بابەتێك لە بارەی زمانناسی کوردی بە زمانی ئینگلیزی.

ـ لەبواری ئەدەب:

ـ کۆبەندی چەند بابەتێك لە بارەی رەخنەو رۆمان و رۆژنامەگەری ئیسلامیی کوردیی.

ـ ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی صەلاحەددین.

**+ كورد له مێژه رووی له فیكری چەپگەرایی كردووه، تا چەند ئەستێرەكانی ئاسمانی دونیای كۆمۆنیستی و پێشڕەوانی ئایدیالیستی رۆژهەڵاتی له ناسنامەی نەتەوەیی كوردیان روانیوه وەكو نەتەوەیەكی بندەست؟**

سەلام ناوخۆش: له بیستەكانی سەدەی بیستەمدا خێوی ئیمپریالیزم، به ناوی شارستانی كردنی گەلانی رۆژهەڵات و رزگاركردنی گەلانی ژێردەست، تەواوی شوێنه ستراتیژییەكانی داگیركردبوو، دروستبوونی زلهێزێكی جیهانی بۆ بەربەستكردنی ئەو شاڵاوی داگیركردن و ئەو ماڵوێرانییه زەرورەتێكی مێژوویی بوو، ئەوه بوو له ئاكامی كۆدێتایەك بەلشەفییەكان فەرمانداری رووسیایان به دەستهێنا. دروستبوونی یەكێتیی سۆڤییەت له دیدگای عەقڵییەتی هێندێك سەركردەی رۆژهەڵات هێندە گرنگ بووه به جۆرێك لەو بارەیەوه جەواهیر لال نەهرۆی سیاسەتمەدار دەنووسێت: گەر شوورەی –سۆڤییەت– نەبووایە ئەبووایە دروستمان بكردبایه[1]. ئەو بیرو راو بۆچوونانه جیهانێكی فانتازیان له واهیمەی گەلانی رۆژهەڵات به گشتی و كورد به تایبەتی پێكهێنا بوو، به شێوەیەك تاكو سەرهەڵدانی پرێسترۆیكا و گلاسنوستی میخائیل گۆرباتشۆڤ ئەستەم و دژوار بوو، بتوانێت به ئاسانی لەو "خێوەی" نێو تەلیسمی سیحری شیوعییەتدا رزگاری ببێت، چونكه دیماگۆژی دەزگای راگەیاندنی سۆڤییەت له لایەك و رۆڵی ماركسیه عەرەبەكان و توركەكان و فارسەكان تاكو كوردەكانیش له چەواشەكردنی گەلاندا له لایەكی دییەوه بوو بوون به لەمپەر و دیواری بەرلین لەبەردەم هەر دژه ئایدیایەكی سۆڤییەتی، یاخود كۆمۆنیستی به گشتی! بەڵێ سێ چارەكه سەدە به رۆژی رووناك وەك شۆڤینییەكانی عێراق و سوریا و توركیا و ئێران، دەسەڵاتی بێدادی سۆڤییەت نكوڵی له ناسنامەی نەتەوایەتی بەشێكی به زۆرداریێژراوی كوردستان دەكرد و حەملەی به كۆمەڵ كۆچ پێكردن و رەشەكوژی لەگەڵ دەكردن. هەركاتێكیش له كۆڕو كۆبوونەوەیەك باس هاتبایە سەر كوردی بندەستی سۆڤییەت، ئەوه هێندە قەرزاری عەدالەتیی سۆشیالیزم دەكراین. كورد واتەنی "به حەوت پشتان له ژێری دەرنەدەچووین" بۆ ئەوەی باسەكەمان سنووری لێكۆڵینەوەی زانستی نەبەزێنێت و دوور له دەمارگیری قەومییەوه له مەسەله

بنەڕەیییەکان بکۆڵینەوە وا بە چاك دەزانین شتەکان لە دوو خاڵی بنەڕەتی چڕ بکەینەوە ئەویش، یەکەم: ناسنامەی نەتەوەیی کوردستانی بندەستی سۆڤییەت و دووەمیش: چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤی کورد لە کوردستاندا.

خاڵێکی دی بۆ بە زانستیکردنی لێکۆڵینەوەکەمان ئەوەیە هەڵوێستی دژەکان –سۆڤییەت و داروودەستەی لە رۆژهەڵات– بەرامبەر بە هەردوو خاڵە بنەڕەتییەکە پێشکەش بکەین ئینجا هەستین بەشیکردنەوەی راستییەکان لە گۆشەنیگای بەڵگەی مێژوویی لە لایەك و راگەیاندنی راستی لە زادەی کوردەکانی ئەوێ لە لایەکی دی.

لە سەردەمی لینین ١٩١٧–١٩٢٤ز یەکەم سەرۆکی دەوڵەتی سۆشیالیستی سۆڤییەتدا، کوردی سۆڤییەت نەتەوەیەکی بچووکی نیشتەجێ نەبووی یەکێتیی سۆڤییەت دادەنرا.

نیکۆلای بۆگای سەبارەت بە راگواستنی نەتەوە ژێردەستەکانی یەکێتیی سۆڤییەت دەنووسێت: لە ساڵی ١٩٢١دا لە سەردەمی کۆنگرەی دەیەمی پارتی کۆمۆنیستی رووسی (بەلشەفی)، دەستەیەکی کۆمیتەی ناوەندی بە سەرکردایەتی لینین و ستالین بابەتی ئەرکەکانی پارتیان سەبارەت بە "پرسی نەتەوەیی" ئامادەکرد. ستالین وەکو قۆمیسەری میللی پرسی نەتەوەیی رۆگی تایبەتی لە ئامادە کردنیاندا هەبوو.

پۆلۆنی، جوولەکە، یۆنانی، ئەڵمانی، بولگار، کورد، هێمشین و لاز–یان وەکو "گروپی نەتەوەیی نیشیەجێ نەبوو" سەیر دەکران. کە زۆریان نە چەپکەرێکی چینایەتی دیار کراویان هەیە، نە "خاك" دەرەنجامی رێگەو بواری فراوانی بۆ کردبوونەوە، ئەو گروپە نەتەوەییانە "خاکی مێژووییان" نییە، کەوایە بە ئاسانی دەتوانرێت رابگوزرێن! (٢).

تەمەنی کورتی لینین بواری نەدا ئەم پرۆسە ئیمپریالییە، ئیشتراکییەتە پیادە بکات، دوای لینین جۆزیف ستالینی دیکتاتۆر بوو بە سەرۆکی سۆڤییەت.

ستالین نەك هەر باوەڕی بە ناسنامەی قەومیی و كوردستانی بوونی كوردستانی بندەستی سۆڤییەت نەدەكرد، بەڵكو لە دیدگای ستالیندا "كورد نەتەوە نییە"، چونكە بە پێی تێڕوانینی ستالین بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی، هەر گروپێك ئابووری هاوبەشی نەبێت نەتەوە نییە. هەر گروپێكیش دەسەڵاتی ناوەندی نەبێت ناتوانێ ئابووری هاوبەشی هەبێت، هەر لەو روانگەیەوە لە ساڵی ١٩٢٩زدا كوردستانێكی ئویەزدی هەڵوەشاندەوە. بۆ چوونێكی دی دەسەڵاتی سۆڤییەت سەبارەت بە نكوڵی كردنی لە ناسنامەی نەتەوایەتی كوردی بندەستی سۆڤییەت، بۆ چوونی –بوكشبان–ە. بوكشبان لە پەرتووكی "كوردی ئازەربایجان" دبلۆماسییانە دەیەوێت بۆیەی توركی بوون لە كورد و كوردستانی بندەستی سۆڤییەت بدات، هەروەك لە پەرتووكە راپۆرت ئاساكەیدا هاتووە: "شتێكی ئاشكرایە، ئەو بارودۆخە نوێیە، دامەزراندنی كوردستانێكی ئۆزیەزد–بوو بە هۆی ئەوەی لە گەلێ لەو ناوچانەی كە زۆرینەی دانیشتوانیان تورك بوون خۆیان ناوبنێن كوردو ناوی كوردی لە ناوچەكانی خۆیان بنێن[٣] بوشكبان هەڵوەشاندنەوەی كوردستانێكی ئۆیەزدیش بە كارێكی بە جێی رێبازی ماركسیزم و لینینیزم دادەنێت. ئەو تێڕوانینە تەسكەی دەزگای باڵای سۆڤییەت سەبارەت بە كورد و گەلانی دی بە شێوازێكی توند تر لە نێو عەقڵییەت و مەنهەجی فیكری كۆمۆنیستەكانی كوردستاندا رەنگیداوەتەوە. ئەوان ناهەق نین لەمەدا، چونكە لە دیدگای ماتریالیزمی مێژووییەوە دەڕواننە مێژووی مرۆڤایەتی كە جەوهەری فەلسەفەكەی بریتییە" لە گەڕان بە دوای بژێوی و خۆراكدا" بەڵێ لە روانگەی سۆڤییەتییەكانی كوردستاندا جێگیربوونی كورد لە نێو ئیمپراتۆری رووسی و سۆڤییەتی بە گەڕان بە دوای پاوان و لەوەڕی ئالیك بۆ ئاژەڵەكانیان دادەنێن، یاخود ستەمی بێدادی عوسمانییەكان و سەفەوییەكان دەكەنە بەهانەی بوونی كورد لە سۆڤییەتدا. لەو بارەیەوە دكتۆر مارف خەزنەدار لە ژێر كاریگەری زانیاری دەستكردی نێو فەرهەنگی سیاسیی سۆڤییەتدا، بە كوردی زانینی هەرێمی "نەخچەوان" بە هەڵەیەكی گەلێك گەورە دەزانێ.

هەروەك لە گۆڤاری توودن– ١٩٦٩ بە ناونیشانی "کوردی ئەرمەنستانی بابەت سۆڤییەت" دەنووسێت: بە پێویستی ئەزانین کە ئەبێ هەڵەیەکی گەلێك گەورە راست بکەینەوە لە بابەت هەرێمی نەخچەوان کە کوردەکان بە تایبەتی هی کوردستانی عێراق بە کۆمارێکی خۆماڵی کوردی دائەنێن.

لە راستیشدا ئەمە وا نییە. بۆ ئەم راستکردنەوەیە ناچارین هەندێك زانیاری لە فەرهەنگی سیاسیی رەسمی سۆڤییەت وەربگرین کە ئەڵێ: "کۆماری خۆماڵی نەخچەوان کەوتۆتە ناو خاکی ئەرمەنستان، بەڵام سەر بە کۆماری ئازەربایجانە، سنووری لەگەڵ ئێران و تورکیادا هەیە، لە (٩)ی شوباتی ١٩٢٤ز دا دامەزراوە، گەورەیی خاکەکەی (٥٢) هەزار کیلۆمەتری چوار گۆشەییە، ژمارەی دانیشتوانی (١٢٩) هەزار کەسە (بە پێی سەرنووسینی ١٩٥٦) دانیشتوانی بریتین لە: ئازەربایجانی و ئەرمەنی، پایتەختی شاری نەخچەوانە[٤]. سەرەڕای ئەوەی سەرانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق بە حوکمی پەیوەندی "سەید و عەبد" یان لەگەڵ مۆسکۆ بە چاوی خۆیان پێچەوانەی راو بۆچوونەکانی خۆیان لە سۆڤییەت دەبینی، کەچی کوردەکانی نێو ئەو رێکخراوە مارکسییەش شێڵگێرانە تر لە لینین و ستالین دەیانووت و دەیان نووسی "چەند هەزار رۆڵەیەکی –کورد–، لە ئەنجامی گەردشی رۆژگارەوە و بە هۆی ستەم و چەوساندنەوەی میللییەوە لەم یەك دوو سەدەی دواییدا کەوتوونەتە وڵاتی گەلانی تر. لە ناو ئەمانەدا ئەو چەند هەزارەی کەوتوونەتە ئەرمینیا و کۆمارەکانی ئەمڕۆی قەوقازەوە. ئێستا لە ژێر سایەی رژێمی سۆشیالیستی و لە خۆشترین و پێشکەوتووترین و بەختەوەرترین پلەی ژیاندا دەژین[٥].

مامۆستا کەندال–ی پەیمانگای کوردی لە پاریس لە نووسینێکیدا بە نێوی "کورد لە یەکێتیی سۆڤییەتدا" بە راشکاوی نکوڵی لە ناسنامەی قەومی کوردستانی بندەستی سۆڤییەت دەکا، هەروەك دەبێژێت: "لە چوارچێوەی سنووری یەکێتیی سۆڤییەتدا، هیچ ناوچەیەك نییە کە تەواو کوردی بێت و بلکێ بە کوردستانەوە". کەندال لە شوێنێکی دی نووسینەکەیدا توندتر دەبێت لەسەر بۆچوونەکەی و دەنووسێت: "هەر چەندە هیچ هەرێمێکی کوردی لە یەکێتیی

سۆڤییەتدا نییه، بەڵام بروسان (جالیه)ی کوردی لێیه- یاخود راستر چەند کۆلۆنییەکی کوردی تێکچڕا و وێکچووی ئەوانەی ئەنادۆڵی تورکیا- بەسەر قەفقاس و کۆمارەکانی ئاسیادا، له ئەرمینیا، ئازەربایجان، جۆرجیا، کازاخستان تورکمانستانی یەکێتیی سۆڤییەتدا پەرش و بڵاو بوونەتەوه(٦).

ئەو هەموو بۆ چوونانه بۆ ماوەی زیاتر له نیو سەده ١٩١٧- ١٩٨٩ ز دوگما و دەستووری پیرۆز بوون هەر یەکێك، گروپێك پێی به جەرگی خۆوه نەبا و لەو "راسته هێڵه" لای دابا، ئەوا هەزاران ناوو ناتۆرەی " فیودال-دەرەبەگ" شۆڤێنیست و و کۆنەپەرست و نۆکەری ئیمپریالیزمی جیهانی لێدەنرا، بەڵام داگیرکردنی شوومی ئەفغانستان و هاتنه سەر حوکمی گۆرباتشۆڤ پەردەی لەسەر جیهانی تیرۆرو گەندەڵی سۆڤییەتی رووگه یەکسانی گەلانی ئەوساوه هەڵماڵی! لەو نێوەندەش زمانی کلیل دراوی کوردی بندەستی سۆڤییەت بۆوه، چەندەها راستی گومکرا و سەبارەت بەو بەشەی کوردستان و گەله ئەنفال پێکراوەکەی به دەرکەوتن. ئێمەش جارێك له زاری شەرعی ئەوان و بەڵگەی مێژووییەوه خاڵی یەکەم، که سەبارەت به ناسنامەی نەتەوایەتی ئەو بەشەی کوردستانه، شی دەکەینەوه. له چەرخی فەرمانداری ئیسلامدا کورد چەندەها حکومەتی یاخود میرنشینی فیدراڵی و سەربەخۆی دامەزراندووه. یەکێك لەو حکومەته هەرێمیانه، حکومەتی شەدادییه. "له ساڵی ٩٥١ زاییني موحەممەدی کوڕی شەدادی کارتۆ ئارانی شەدادیدا ئاوەدان دەکاتەوه و تاوەکو ساڵی ١٠٧٦ز دەمێنیٚ" ئەو حکومەتەی بنەماڵەی شەدادی که قەرەباخ -کوردستانی سوور- نەخچەوانی گرتبۆوه بۆ ماوەی (١٢٥) ساڵ فەرمانداری کوردی له نەخچەوان دەکات، روحی فراوانخوازی هەر یەك له ئیمپراتۆری رووسی و عوسمانیی و سەفەوی، شەڕی یەك له دوای یەکیان لەو بارەیەوه رۆڵی سەرەکی بینیوه له گۆڕین و بەش بەشکردنی خاکی کوردستاندا. له پاش شەڕی دوو ساڵەی چاڵدێران ١٥١٤-١٥١٦ز کوردستانی گەوره له روانگەیەکی نەزەرییەوه له نێوان عوسمانییەکان و سەفەوییەکاندا دابەشکراوه، به پێی پەیمانی زەهاو یاخود قەسری شیرین ١٦٣٩ز

بەشی رۆژهەڵاتی کوردستان و ئەرمەنستان بە ئێرانەوە لکێندران بەشەکەی دی کوردستان و ئەرمەنستان خزێنرانە نێو قەڵەمڕەوی عوسمانییەوە.

دکتۆر کەمال سەیدۆ قەرەداغی لە نووسینێکیدا بەنێوی "کورد لە یەکێتیی سۆڤییەتی پێشوو و بار و دۆخی نوێ"دا باس لە دوو پەیمانی شوومی نێوان رووسیا و ئێران دەکات کە بە پێی دەقی رەسمی ئەو پەیمانانە بەشێکی خاکی کوردستان خزێنراونەتە نێو ئیمپراتۆری رووسیای قەیسەری. دکتۆر کەمال قەرەداغی دەنووسێت: "بە گوێرەی دەقی بڕوانامەی گولیستان– ١٢ی ئۆکتۆبەری ١٨١٣ز ئێران دانی بە دەسەڵاتی سۆڤییەتی هێنا لەسەر ناوچەیەکی فراوان لە نێوان هەردوو وڵات کە ناوچە کوردنشینەکانیشی دەگرێتەوە. ئەم ناوچانەش لە لایەن رووسەکان بە (کوردستانێکی) تا (یەزدا) ناو دەبران-"[٧].

لە ساڵی ١٨٢٦دا شەڕێکی دوو ساڵە لە نێوان رووسەکان و ئێرانییەکان هەڵگیرسا، لە ئاکامدا ئەرتەشی ئێران شکا و پەیمانێکی ئاشتی بە ناوی پەیمانی ئاشتی تورکمانچایی لە ١٠ی شوباتی ١٨٢٨ز لەگەڵ رووسیای قەیسەری مۆر کرد. "بە پێی پەیمانی ئاشتی تورکمانچایی ئەرمەنستانی ئێرانی بووە بەشێك لە ئیمپراتۆری رووسیای قەیسەری"، هەر بەگوێرەی ئەو پەیمانە" رووسیای قەیسەری بەشێکی زۆری لە ناوچە کوردییەکان داگیرکرد کە کەوتبووە سەر سنووری هەرێمی (کارەباخ) و (نەخچەوان) و لە ئەنجامی زاڵبوونی رووسیا بەسەر عوسمانییەکان (١٨٧٧–١٨٧٨ز) هەرێمی قارس کە بەشێکی زۆر لە ناوچە کوردییەکان دەگرتەوە، کەوتە ژێر دەسەڵاتی رووسەکان[٨].

لەو پێودانگەوە کورد بە رەسمی لە بەرایی سەدەی نۆزدەهەمدا لە رووسیادا وەك نەتەوەیەکی خاوەن ناسنامەی نەتەوایەتی هەیە. ئەو راستییەش ئەکادیمیی کوردی سۆڤییەت نادر نادرۆف لە چاوپێکەوتنێکیدا بە پەیامنێری گۆڤاری "ئاسیا و ئەفریقیا" رادەگەیەنێت: "دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٠١ز دا گورجستان و گانجین و قەرەباغ و شیکین، کە زۆربەی دانیشتوانەکانی کورد بوون بە رووسیاوە لکێندران بەرەسمی لە پیتەربۆرگ راگەیاندرا کە لە ئیمپراتۆری رووسیادا (کوردیش لە ریزی نەتەوەکانیدا هەیە). نادرۆف لە چاوپێکەوتنێکی تردا زێتر بە

قووڵاتی مەسەلەکەدا خلۆر دەبێتەوە و دەڵێت: "لە شەڕەکانی نێوان رووس و عوسمانییدا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم (١٨١٣-١٨٢٣) ئیمپراتۆری رووسی توانی بەرەو خوار بکشێت و چەمی ئاراس داگیر بکات کە ئەویش "پارچەیەکی دانەپچڕاوی کوردستانە"، رووسەکان پێی دەڵێن چەمی "ئاراکس" بەڵام ناوەڕاستەکەی "ئاراس"ە. ئەمە کراوە بە سنووری رەسمی نێوان یەکێتیی سۆڤییەت و دەوڵەتی تورکیا. لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧-شەوە شار و شارۆچکەکانی ئەو ناوچەیە بە گشتیی کورد بوون هەتا ئێستاش هەر زۆربەیان کوردن" نادرۆف سەبارەت بە کوردی بوونی" نەخچەوان"یش دەڵێت: "شارە گرنگەکانی ئەو پارچەی کوردستان "لاچین" و "شوشە" و "ناخچەوان"ە گوندو نیمچە شاریشی لێیە، بۆ نموونە "کەلبەجەر" و "دەرەکەند" لە گەرمەی جەنگی ئیمپریالیزمی یەکەمیشدا ١٩١٤-١٩١٨ز رووسیای قەیسەری لەگەڵ بەریتانیا و فەرەنسای هاوپەیمان پەیمانی شوومی سایکس-بیکۆی ١٩١٦ز سەبارە بە داگیرکردن و دابەش کردنی ئیمپراتۆری عوسمانیی مۆرکردو دوای ئەوەی لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧ز بەلشەویەکان هاتنە سەر حوکم پەیمانێکیان لەسەر سنووری هەردوولا لەگەڵ عوسمانییەکان مۆر کرد سۆڤییەتییەکان لە ئازاری ١٩١٨دا پەیمانی بریست - لیستۆفیسك-یان لەگەڵ عوسمانییەکان بەست و ئەو پەیمانە کۆتایی بە شەڕی نێوانی هەردوو لا هێنا[٩] و لە ئاکامدا سوپای سۆڤییەت لە ناوچەکە کشایەوە، پاش ئەوەی بە گوێرەی دەقی رەسمی ئەو پەیمانە شوومە سۆڤییەتییەکان پارچەیەکی گەورەی کوردستانیان بەرکەوت کە بریتییە لە ناوچەی ئاران (قەرەباغ -کوردستانی سوور- ئەرمینیای سۆڤییەت، نەخچەوان) لە گۆشەنیگای بەڵگە مێژووییەکانەوە بۆمان ساغ بۆوە کە هەروەك چۆن ئینگلیز و فەرەنسا بە پێی پەیمانی سایکس-بیکۆ ١٩١٦ز، سان ریمۆ ١٩٢٠ز، لۆزان ١٩٢٣ز کوردستانی عوسمانلییان بە گوێرەی بەرژەوەندییە سیاسیی و فیکریی و عەسکەری و ئابوورییەکانەوە بەسەر عێراق و سوریا و تورکیا دابەش کردووە هەر بە هەمان شێوازی کۆلۆنیانە رووسیای قەیسەری دوای یەکێتیی سۆڤییەت بەشێك لە خاکی کوردستانی رۆژهەڵات و باکووری بە گوێرەی پەیمانی گوڵستان ١٨١٣ز،

تورکمانچایی ١٨٢٨ز و بریست– لیتسۆفیسك ١٩١٨ز بۆ خۆی دابڕاندووە. سەبارەت بەو خاکە هێندە بەسە بڵێین کە بەشێکی کوردستان لە بندەستی سۆڤییەتدا هەیە بەڵام هەروەك داگیرکەرانی تورکیا و سوریا بە رەسمی نکوڵی لەو راستییە دەکەن!

## چەوساندنەوەی نەتەوایەتی:

هەر کاتێك نەتەوەیەك نکوڵی لە ناسنامەی نەتەوایەتی بکرێت ئەوا بە راشکاوی ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو نەتەوەیە مافە سیاسیی و نەتەوەییەکانی پێشێل دەکرێ. لەو گۆشە نیگایەوە با لە خاڵی دووەمی باسەکەمان بکۆڵینەوە. بەڵام بەر لەوەی ئەمە جێبەجێ بکەین وەك خاڵەکەی پێشوو وا چاکە، هەڵوێستی سۆڤییەت و نۆکەرانی سۆڤییەت لەو بارەیەوە بخەینە روو. "شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەو شۆڕشە نەمرەیە کە بۆ یەکەمجار نموونەی یاساو پەیڕەوێکی سۆشیالیزمی وای دانا کە رووتاندنەوە و چەوساندنەوەی مرۆڤی لە شەش یەکی گۆی زەوی تا ناچاری گۆر کرد"[١٠] "کورد لە ژێر سایەی رژێمی سۆشیالیستی لە خۆشترین و پێشکەوتووترین و بەختەوەرترین پلەی ژیاندا دەژین"[١١]. "شارە کوردییەکانی سۆڤییەت دووچاری هیچ سیاسەتێکی جیاوازیکارانە نەبوون، باری ئابووری و نەتەوایەتیشیان هیچی لە نەتەوە هاوسێکانیان کەمتر نییە." لە ژێر سایەی سۆشیالیزم ئەدەب و مێژوو و فۆلکلۆری کوردی لە ئەکادیمیادا بڕوانامەی بەرزیان لەسەر دەبەخشرا بە کورد، کوردستانی ئۆتۆنۆمیداری هەیە، ئێزگەی کوردی هەیە، لە نێو کوردانی سۆڤییەت رۆژهەڵاتناس و ئەکادیمیی و پرۆفیسۆری زانکۆ و نووسەری بەرز وەك کوردوییف، جەلیلی جەلیل، نادری نادرۆف، عەرەب شەمۆ، حاجی جندی هەن. لە کاتێکدا کە ئەوەمان لەگەڵ باری کوردەکانی بندەستی تورکیا و ئێران و سوریا و عێراق بەراوورد دەکرد هەزار و یەك نەفرەتمان لە ئیمپریالیزم و داگیرکەرانی کوردستان دەکرد. نیو سەدە زیاتر ئەو راستییە مزەوەرانە، بوو بوون بە مێردەزمەی عەقڵ و هۆشی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان" بەڵام داگیرکردنی ئەفغانستان ١٩٧٩–١٩٨٩ز و گۆڕانە بنەڕەتییەکانی سۆڤییەت و

ئەورووپای شەرقی بارودۆخێكی نوێی هێنایە كایەوە هەقیقەتی جیهانی تیرۆری و چەوساندنەوەی چینایەتی و نەتەوایەتی و ئایینی و مەزهەبی ژێر فشار و كەڵەگای شیوعییەتی ساغ كردەوە. ململانێی شەڕی سارد و بوركانی ئایینی و نەتەوەیی هەرەسی بەو فەرمانداریە ئیستعمارییە هێنا و راست و دروستی سۆشیالیزمی عیلمی لە رووی تێوری و پراكتیكەوە لە بن و بۆتكەوە هەڵتەكاند. بەڵگە بەدەركەوتن، كورد وەك بەشەكانی دی دەچەوسێنرێتەوە، ئەنفال دەكرێ، بە كۆمەڵ ئاوارە دەكرێ، دەكوژرێ...!

بەڵێ هەر لەسەردەمی زێڕینی سۆڤییەتدا كورد كەوتۆتە ژێر نەشتەری سیاسەتی میكیاڤیللی( پەرتكە زاڵبە). وتەكەی نیكۆلای بۆگای راستییەكی حاشا هەڵنەگرە: "كورد نەتەوەیەكی نیشیەجێ نەبووی سۆڤییەتە، بێ خاك و مێژووە، بۆیە راگوێزانی ئەركی پارتی كۆمۆنیستە!" لێرەدا لەوانەیە یەكێك بپرسێت ئەدی بە دەست پێشخەری لینین لە حەوتی تەمووزی ١٩٢٣ز كوردستانی سوور دانەمەزرا؟ ئەو گرێ ئایدۆلۆژییە ئێستاشی لەگەڵدابێت هەر لە واهیمەی ماركسییەكان دەخولێتەوە و دەیانەوێت هەر چەواشەكردنی راستییەكان بكەن بە ویست و مەرازی خۆیان. مێژووی كۆن و نوێی كورد هەقیقەتێكی رەهای سەبارەت بە عەقڵییەتی داگیركەران و هەڵوێستی ناوخۆیان لە ئاست كورد و كوردستاندا تۆمار كردووە. زلهێزەكانیش بە گوێرەی بەرژەوەندی سیاسیی و عەسكەری خۆیان، درێغیان لە دەست تێوەردانی چارەنووسی گەلی كورددا نەكردووە. ئێمە كاتێك لەو بارودۆخە نوێیەی كۆدێتای ئۆكتۆبەر و دوای رووداوەكە دەكۆڵینەوە لەسەر سێ بنەمای سەرەكی دەوڵەتە نوێیەكەی سۆڤییەت جەخت دەكەین، ئەویش ئایدۆلۆژی دەوڵەتەكە و ستراتیژی دەوڵەتەكە و تاكتیكی دەوڵەتەكەیە. لە دیدگای ئایدۆلۆژی لینین-ەوە مەسەلەی نەتەوایەتی، كردەیەكی بورژوازییەتە و هەر لەگەڵ بەسەرچوونی قۆناغی سەرمایەداری بەسەر دەچێت و گەلان بەرەو ئوممەمیەت و شیوعییەت دەچن. هەر وەك لینین خۆی لەو بارەیەوە دەڵێت: "مەسەلەی نەتەوایەتی لە چاو مەسەلەی پرۆلیتاریادا بە پلەیەكی كەم گرنكتر دێت"[١٢].

ئامانجی دیاریكراوی دەوڵەتەكەش دامەزراندنی كۆمەڵگەیەكی بێ چینایەتی و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی بوو. شیوعییەكان لەو خاڵەدا فیكرەی كوردستانی گەورە بە فیتی ئیمپریالیزم دەزانن، هەر تێكۆشانێكی جوداخوازی كورد له عەرەب و فارس و تورك بە زەرەر و زیانی چینی پرۆلیتاری ئەو گەلانه دادەنێن . كه وابێ ئامانجی ئۆكتۆبەر ئەوه بوو" مەسەلەی نەتەوایەتی كورد بوو بە بەشێك لە مەسەلەی ئازادیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یا بە واتایەكی روونتر مەسەلەی هەر بەشێكی كوردستان بوو به بەشێك له مەسەلەی" ئەو وڵاتەی كه تێیدا ئەژی، زیاتر لەوەی كه هەموو مەسەلەیەك پێكەوه بنێ..."[١٣] هەر لەو پێودانگەوه سۆڤییەت به پێی پەیمانی بریست – لیستۆفیسك دەستبەرداری حكومەتەكەی عەبدولڕەزاق بەدرخان بوو لە چاڵدێران. بە پێی لێكدانەوەی لینین ئەتاتۆرك مرۆڤێكی بەلشەویكه و پشتگیری لە هەڕەشەی ئیمپریالیزم دەكات و سنووری خوارووی سوڤیەت له هێرشی ئیمپریالیزم دەپارێزێت، هەر بۆیه نوێنەری ئەتاتورك له كۆنگرەی باكۆ ١٩٢٠ز بە نوێنەری بۆرژوای نیشتمانی وەردەگرێت و له ١٦ی ئاداری ١٩٢١ز لەسەر حیسابی ئامانجی ستراتیژی خەباتی رزگاریخوازی كورد و ئەرمەن دەستی لە ئەرمەنستانی گەورە و باری ناوخۆی توركیا هەڵگرت و دانی بە سنووری باشووری رۆژهەڵاتی توركیا–كوردستانی باكوور– بۆ توركیا ناو دەستی لە ویلایەتی قارس و ئەردەهان هەڵگرت"[١٤]. لە ساڵانی ١٩٢٠–١٩٢١ز یەك ملیۆن روبلی زێڕ و "٣٩ هەزار تفەنگ و ٦٣ ملیۆن فیشەك و ٥٤ تۆپ و ٢٠ هەزار ماسكی دژی كیمیایی و زەخیره و نەفتێكی زۆری كردە خەڵاتی توركیا". شۆڕشەكەی شێخ مەحموودیش له بەرژەوەندی ستراتیژی سۆڤییەت نەبووه، ئەگەر نا لینین وەڵامی یەك له سێ نامەكەی شێخ مەحموودی دەدایەوه ![١٥] لەمەدا دەردەكەوێت كه ئامانجی ستراتیژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد هیچ كاتێك لەگەڵ ئامانجی ستراتیژی سۆڤییەت نەگونجاوه ئەگەر نا لینین له دانراوەكانیدا تەنیا ئاماژەیەكی بۆ ئەو جووڵانەوه ئازادیخوازه دەكرد!

جا ئەگەر ئەوه هەڵوێستی لینین بێت سەبارەت بە كوردەكانی دەرەوەی سۆڤییەت، ئەی چۆن ناوچەی ئۆتۆنۆمیداری بۆ كوردەكانی بندەستی سۆڤییەت

دامەزراندووه؟! هەروەك وتمان بە دەستپێشخەری لینین لە حەوتی تەموزی ١٩٢٣ز ناوچەیەکی ئۆتۆنۆمیدار لە بەشێکی "کوردستانی سۆڤییەت بە ناوی کوردستانی سوور دامەزراند. دکتۆر کەمال مەزهەر لە پیرسترۆیکا و کورد دەقی بڕیارەکە و شوێنەکانی ناوچەکە بەو شێوەیە دەنووسێت: "بڕیاری دامەزراندنی" کوردستانێکی ئۆیەزد- ناوچەی کارگێڕی کوردستان- بەو شێوەیەی خوارەوە دەرچوو.

دەربارەی کوردستان.

دامەزراندنی رژێمێکی ئۆتۆنۆمی کوردستان کە دەبێ مەرکەز و سنووری لەگەڵ سنووری رژێمی ئۆتۆنۆمی ناکۆرنەی قەرەباخدا دیاری بکرێت. "سەبارەت بە شوێنەکانی نێو ئۆتۆنۆمییەکە دەنووسێت: "لە پێنج دایەرە یا مەڵبەندی سەرەکی پێکهاتبوو کە ئەوسا ناویان کەلبەجەر و کورد حاجی و موراد خانلی و قەرەقشلاغ و قوتورلی بوو". تاکتیکی دەسەڵاتی سۆڤییەتیش سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی ئۆتۆنۆمی بووە، هەروەك لینین دەڵێت: "پیلانی ئێمە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی نەتەوایەتی ئۆتۆنۆمیە: "[١٦] لەو چەند خاڵەی خوارەوەدا دەیسەلمێنین کە دامەزراندنی "کوردستانێکی ئۆیەزد" تاکتیکێکی کاتی سیاسەتی سۆڤییەت بووە، دەقا و دەق وەك "ئۆتۆنۆمییە" سەقەت و پەقەتەکەی (١١)ی ئازاری ١٩٧٤ز بووە لە چەند روویەکەوە:

١- بچووککردنەوەی جوگرافیای کوردستان و دابڕانی کوردەکانی ئەوێ لە بەشە کوردستانی باکوور، بەوەی بەشێکی ستراتیژی کوردستانی سۆڤییەتی وەك نەخچەوان و کەرەباخی تێدا نەبوو.

٢- لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتی -کوردایەتی- ئەویش لە گۆشە نیگای بیرۆچکەی "ئومەمیەت" و "یۆتۆپیای کۆمۆنیستی".

ئەمەش سیاسەتێکی دوو سەرە بوو: سۆڤییەتی لە کێشەی نەتەوایەتی رزگار دەکرد و بەو گەمارۆدانەش خزمەتێکی زۆری ئاسایشی نێوخۆ و حکومەتی تورکیای نوێی دەکرد. دیرك کینان لەو بارەیەوە لە پەرتووکی "کورد و کوردستان" دنووسێت: "کوردەکانی یەکێتیی سۆڤییەت لە دەرەوەی ئەو

بارودۆخە پەرەسەندووە و پێشکەوتنە نوێیەی هەڵچوون و هەستی نەتەوایەتی بوون. "ئیگلتۆن"یش لە "کۆماری مەهاباد-١٩٤٦ز" سەبارەت بە لاوازی هەستی نەتەوایەتی کوردەکانی سۆڤییەت دەنووسێت: (لە سەردەمی کۆماری مەهاباددا، تەنیا یەك کوردی سۆڤییەتی لە کوردستانی ئێراندا بوو).

٣- دامەزراندنی کوردستانی ئۆتۆنۆمیدار هاوکات بوو لەگەڵ دامەزراندی حکومەتەکەی شێخ مەحموود ١٩٢٢ز، هەروەها بڕیاری ئینگلیز و حکومەتی عێراق سەبارەت بە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە باشووری کوردستان . ئەو بڕیارەش لە ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ز لە بەیاننامەیەکدا بڵاوکرایەوە.

ئەتاتورك لەگەڵ هاوپەیمانەکان لە ٢٣ی تەمووزی ١٩٢٣ز بیرۆکەی دەوڵەتی کوردی لە باکوور هەڵوەشاندەوە و لە باشووریش لە جیاتی پیادەکردنی بەیانەکەی ٢٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢ز لە تەمووزی ١٩٢٣ز حکومەتەکەی کوردیان بە جارێك هەڵوەشاندەوە.

ئۆتۆنۆمییەکەی سۆڤییەتیش کە بە گوێرەی رەوتی رووداوەکانی کوردستان دامەزرا بوو، هەر بۆیە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی حکومەتەکەی باشوور و نسکۆی شۆڕشەکانی سمکۆ، شێخ مەحموود و شێخ سەعیدی پیران، ئەویش هەڵوەشێندرایەوە. ئەو هەڵوەشاندنەوەش لە روانگەیەکی بەرژەوەندی بیرۆکەی مارکسیزم- لینینیزم بووە، هەروەك بوکشبان خۆی ئەو راستییە دەدرکێنێت[١٧].لە سەردەمی فەرمانداری ستالینیش ١٩٢٤-١٩٥٣ز سێ کووچکەی سۆڤییەت سەبارەت بە کورد بە گشتیی و کوردی بندەستی سۆڤییەت بە تایبەتی شێوازێکی دڕندانەیان بە خۆوە گرت. ئەوەی لینین لە کۆنگرەی دەیەمی (پ. ك. س) بەلشەڤی دەرهەق بە راگوازینی کورد دەستووری لەسەر دابوو، ستالین زۆر بێ رەحمانە پیادەیکردن. لە ساڵی ١٩٢٩ز هەستا بە دروستکردنی "پشتە سنووری سوور" ئەویش بە زۆری هەرێمی نەخچەوان و ناوچە سنوورییەکانی تر. ئەو پرۆسە عەسکەرییەی سۆڤییەت پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە باری شلۆقی حکومەتی ئەنقەرە و سەرهەڵدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد و دامەزراندنی حکومەتی ئارارات هەبوو. ژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشای فەرماندەی حکومەتی ئارارات لە

یاداشتەکەیدا ئەو هەڵوێستە نامرۆییانەی ستالینی بۆ تۆمار کردووین: "فەرماندەی کورد زانی کە تیپێك لە هێزەکانی سۆڤییەت بۆ یارمەتی هێزە دوژمنکارەکانی تورك لە ئاوی ئاراس پەڕیوەتەوە و دەوروبەری باکووری رۆژهەڵاتی چیای ئاگری بچووکیان داگیرکردووە". لە ئاکامی ئەو پیلانە هاوبەشەدا شۆڕشی کورد ئابلۆقەی دراو لە ئەیلوولی ١٩٣٠ز حکومەتەکەی ئارارات هەرەسی هێنا، کاتێك "خەتەری کورد" لەسەر تورکیا کپکرا، جۆزێف ستالین تێڕوانینێکی نوێی سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوایەتی داڕشت، بە شێوازێك بە ناوی ئومەمیەت زمانی رووسی و گەلی رووسی بەسەر گەلانی سۆڤییەتدا زاڵکرد. بە گوێرەی ئەو بۆچوونەی ستالین "دەبێت هەلو مەرجێك بێتە ئاراوە بۆ هەموو یەکبوونی کولتووری نەتەوەیی لە یەك کولتووری ناوکۆ و بە تاکە زمانێکی هاوبەش"[١٨] لە گۆشە نیگای ئەو بۆ چوونەوە گەلانی بچووکی نێو سۆڤییەت بە زۆری توێندرانەوە، دەربەدەر کران و رێژەی گەلی رووسیش هەر روو لە زیادی کردوو بە جۆرێك ئێستا ٥١٪ رێژەی دانیشتوانی سۆڤییەت پێکدێنن. لە ساڵی ١٩٣٧ز ەوە کە ساڵی تازەکردنەوەی پەیمانی دۆسیایەتی لینین –ئەتاتورك–ی ساڵی ١٩٢١ز بوو، "کوردی خەڵکی نەخچەوان هەموویان ناردرانە ئاسیای ناوەڕاست (ئازیائۆریە) کە دەکاتە وڵاتەکانی تورکمانستان و تاجیکستان و ئۆزبەکستان و قریقیزیا و نیوەی دەوڵەتی کازاخستان" هەرچی کوردەکانی بە نێو کوردەکانی سووریش بوون لە ساڵی ١٩٢٦–ەوە تاکو ١٩٧٩ز زۆربەی هەرە زۆری لە بۆتەی ئازەری و گەلانی دی توێندرانەوە. لەسەردەمی باقیرۆف هەموو کوردەکانی ئازەربایجان زیاد لە هەموو شوێنێك لە بۆتەی ئازەری توێندرانەوە، سیمای نەتەوایەتییان شێوێندرا و ئیتر چیتر دان بەبوونی کورددا نەدەنرا. سەبارەت بەو کارە دڕندانەیە هێندە بەسە کە وتەیەکی نیکیتا خرۆشۆف بێنینەوە کە بە کوردەکان دەڵێت: "ئێمە ناتوانین کوردستانی سۆڤییەت دابمەزرێنینەوە، چونکە کورد لەو ناوچانەدا نەماون– یان گوازراونەتەوە یان توێنراونەتەوە". راگوازینەوەی کوردی بندەستی سۆڤییەت بۆ سیبیریاو کۆمارەکانی سۆڤییەت یاخود یۆتۆبیای کۆمۆنیستی دەقاودەق لە راگوازینی بارزانییەکانی کۆمەڵگا زۆرە ملییەکانی هەولێر دەچێت. نادر نادرۆڤ

کوردی سۆڤییەت لە کۆنگرەی مۆسکۆ ٢٥–٢٦ی تەمووزی ١٩٩٠ز بەو شێوەیەی خوارەوە راگوازینەوەکە دەگێڕێتەوە: "وەچەی بە ساڵدا چووی ئەمڕۆ (ئەوانەی لە سەرو بەندی چەوساندنەوەکەدا منداڵ بوون) لە بیریانە چۆن لە شەوێکدا نەهامەتی رووی لەگوندەکەیان کرد، هەرچی پیاو هەبوو هەموویان کۆکرانەوە و بە سواری شەمەندەفەرێك بەڕێکران، تا ئەمڕۆش کەس نازانێ بەرەو کوێیان بردن، چوونیان بوو هاتنەوەیان نەبوو کەسیان نەگەڕانەوە. لە دوای ناردنی پیاوان، ژن و منالێشیان بە سواری ماشێنی نالەبار بەرە و رووەتێکی تر هەنارد..."[19].

لە پاش چاکسازی کوردی سۆڤییەت، ستالین لە پاش جەنگی دووەمی جیهانی ١٩٣٩–١٩٤٥ز زەبرێکی کوشندەی لە حکومەتە ساواکەی مەهاباد دا. ئەویش لە رێگای رێکەوتنێکەوە لەگەڵ قەوام سەڵتەنەی ئێرانەوە ناوچەکەی بۆ ئەرتەشی تیرۆرستی فارسی چۆڵکردووە وای بە کوردەکان راگەیاند کە شەڕ کردن لەگەڵ ئێراندا دەبێتە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی سێیەمی جیهانی![20] لە ساڵی ١٩٤٧زیش کاتێك ژەنەراڵ بارزانی رازینەبوو رەحیمی قازی، پیاوی باقرۆف، بکا بە کارگێڕی خۆی لە حکومەتە کاتییەکەی کورد لە هەندەران، دەزگای باڵای سۆڤییەت حکومەتەکەی هەڵوەشاندەوە و بارزانی و هاوڕێکانی تاکو کۆچی دوایی ستالین ١٩٥٣ز لە سۆڤییەتدا نەحەسانەوە. ئەو هەڵوێستەی سۆڤییەت هەر لە سەردەمی لینین ١٩١٧–١٩٢٤ز و جۆزیف ستالین ١٩٢٤–١٩٥٣ز نەبووە، بەڵکو تاکو هەڵوەشاندنەوە و پاش هەڵوەشاندنەوەش هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی لە ئاست کورد نەبووە. ئەوەتا حەبیب موحەممەد کەریم لە گۆڤاری "کادیر" پیلانێکی سۆڤییەت – عێراقی لە دژی سەرکردەی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کورد دەنووسێت: "لە ٩ی نیسانی ١٩٧٢زدا سۆڤییەت پەیمانی دۆستایەتی و هاریکاری لەگەڵ حکومەتی عێراقدا بەست و داوای لە بارزانی نەمریش کرد کە هاریکاری حکومەتی عێراق بکات، بەڵام بارزانی داواکەی سۆڤییەتی رەت کردەوە و هەر لەو کاتەشدا بوو لە لایەن دەزگا ئەمنییەکانی عێراقەوە دوو جار هەوڵی کوشتنی بارزانی نەمر درا. "بەو شێوەیە دوای نسکۆکەی ١٩٧٥ بە جارێك وشەی "کورد" لە میدیای رەسمی سۆڤییەتدا قەدەغە کرا. لە بەهاری ١٩٨٨یشدا کە هەڵەبجە

شەهید کرا، کورد ئەنفال کرا، ئاوارەی ئێران و تورکیا و ئەوروپا کرا، جاسمی جەلیلی (شیوعی لە ساڵی ١٩٣٠)ەوە سکالانامەیەکی لەو بارەیەوە بۆ گۆرباتشۆف نووسی بۆ ئەوەی سۆڤییەت هەڵوێستێك لە هەمبەر جینۆسایدی کورد وەربگرێت" بەڵام رژێمی سۆڤییەت نەك هەر لەم تاوانە بەدەنگ نەهات، بەڵکو لە شوباتی ١٩٨٩ز نەیهێشت کۆمیتەی مافەکانی مرۆڤ لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە بڕیارێك عێراق تاوانبار بکات. "لەمەش زیاتر رۆژنامەی پراصدا"ی زمانحاڵی (پ. ك. س) بەلشەفی کارەساتی هەڵەبجەی، بە درۆ و دەلەسەی ئیمپریالیزم نێو برد! ئەمەش لە لێدوانی پەیامنێرەکەی لە واشنتنەوە بڵاو کردەوەو "تاوانبارکردنی عێراقی بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بە درۆ و پڕو پاگەندەی ئیمپریالیستی لە قەڵەمدا"[(٢١)].

دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی سۆڤییەت و دامەزراندنی "دەوڵەتانی کۆمن و یلیس"جارێکی تر کێشەی کورد لەوێ سەریهەڵدایەوە. ئەمجارە کۆنە شیوعییەکان ئازەری و ئەرمەنی لە دیدگای جیاوازی "قەومیەت" و "ئایین" و "مەزهەب"دا ناوچەی کوردستانیان خستە بەر رەحمەتی هێرشی هەردوو لا. ئەمەش لە خۆڕا نەبوو، بەڵکو لە ترسی دروستبوونی "کیانێکی کوردی" بوو لە ئاکامی ئەو بارودۆخە نوێیەی لەگەڵ هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤییەت هاتبووە کایەوە. ئاکامی ململانێی ئازەری و ئەرمەنی و داگیرکردنی شاری "شوشە"ی لە ٨ی ئایاری ١٩٩٢ز لێ دەرچوو. ئەو داگیرکردنەی ئەرمەنی، هەر خاك داگیرکردن نەبوو بەڵکو داگیر کردنی فیکر و ئەخلاق و ئابڕوو بوو. ئەو راستییەش لە زاری رزگاربووانی شارەکەدا تۆمار دەکەین: "لە شەوی ٨ی مانگی ئایاردا ئەرمەنەکان دەستیان بە هێرش کرد، تۆپبارانی هەموو کوچە و قوژبنێکی شار دەستی پێکرد، دەنگی هاوار و قیژەی منداڵ تێکەڵ بوو بە دەنگی تەقە و تۆپ" زۆر لە منداڵانیان کوشتین و زۆر لە کچان و ژنانیان فڕاندین. بە چاوی خۆم دیم دەستدرێژییان دەکردە سەر ئافرەتان لە کۆڵانەکانی مالوبیلیەدا، ئەو دێیەی بوو بووە فڕنێکی گەورە، لە (٢٥٠٠) کەس کەمێکیان دەرچووین، ئەوانیتر کوژران یان دیل کران"[(٢٢)] ئەوەبوو حاڵی کورد لە ئیمپراتۆرییەتی شیوعییەتی عیلمی و پرۆلیتاریا. بەڵێ

هەروەك چۆن ئێمە لە كوردستانی بندەستی بەعسدا جێگری سەرۆك، وەزیر و ئەكادیمی دكتۆرای ناوك و پرۆفیسۆری زانكۆ و كوردستانی ئۆتۆنۆمیمان هەبوو، هەڵەبجەی شەهیدو دوو سەد هەزار گومكرا و وڵاتێكی وێرانیشمان هەبوو، دەقاودەق لە ژێر سایەی ئومەمیەتی شیوعییەتیشدا جیهانێكی تۆقین و گومكردن تیرۆری بە كۆمەڵ و ئاوارە و دەربەدەری بە كۆمەڵمان هەبوو!

**+ لە زۆربەی قۆناغە مێژووییەكاندا كورد پشتی بە رۆژئاوا بەستووە وەكو فریادرەسێك لێی روانیوە، تا چەند رۆژئاوا لە روانگەی ستراتیجیانەی خۆیەوە دۆزی سیاسیی كوردی هەڵسەنگاندووە؟ بە مانایەكی تر پێتوایە رۆڵی هەبووبێت لە چارەسەری كێشەی سیاسیی كورددا؟**

سەلام ناوخۆش: مەسەلەی كورد وەك دۆزێكی سیاسیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی ركابەری رزگاریخوازی كورد لە سەدەی نۆزدەهەمدا شكلێكی نوێی وەرگرت و بوو بە ماددەیەكی گرنگی ئەجێندای دەوڵەتە ئیمپریالیستەكانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا. هەریەك لە دەوڵەتە زلهێزەكانی ئەوسا وەك ئەڵمانیا، رووسیای قەیسەری، بەریتانیا، هەردەم مۆركی شوێنپێی تووندكردنی خۆیان بوون لە ناوچەكەدا. هەر یەكەو بە بیانوویەك دەیویست "شەرعییەتی" دەسەڵاتی خۆی لە ناوچەكەدا بچەسپێنێ!!

بەڵێ دەوڵەتانی وەك رووسیا و ئینگلیز هەر لەگەڵ ئاشنابوونیان لەگەڵ میللەتی كورد و دۆزەكەی، لە سەرانی دەوڵەتی عوسمانیی و ئێرانی نزیكبوونەوە و بە كردەوەش بەشداری حكومەتەكەی بەدرخان و شۆڕشەكەی شێخ عوبێدوڵڵای نەهریان كرد. ئەمە وەنەبێ لەگەڵ سەرانی عوسمانیی و ئێرانی لە بەرنامەی و ستراتیژییەتدا یەك بگرنەوە، بەڵكو ستراتیژییەتی بنەڕەتی رۆژئاوای مەسیحیەت ئاژاوە نانەوەو رووخاندنی بونیادی سیاسیی و عەسكەری و كۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی جیهانی ئیسلامییە. ئەمە و بۆ ئەوەی بەرنامەی رۆژئاوا بە سروشتی پیادە بكرێ، ماسكی شێواندنی راستییەكان و ئیزدیواجیەت لە هەڵوێست و رووداوەكانی سەردەمدا سیاسەتێكی نەگۆڕی رۆژئاوا بوو. دووان لەو سیاسەت و ستراتیژیەتەی رۆژئاوا كتێبێكی تایبەتی دەوێ، بەڵام بۆ ئەوەی لەو بوارە

تەسكەدا رۆشناییەك بخەینە سەر ئەو مەسەلە حەساسە، كورتەیەك لە هەڵوێستەكانی رۆژئاوا دەخەینە روو.

دوای هەرەسی ئیتیحادییە عوسمانییەكان ١٩٠٨-١٩١٨ز لە جەنگی ئیمپریالیزمی یەكەمدا مەسەلەی كورد بوو بە وەرەقەی هەڕەشە و تۆقاندنی سەرانی ئتیحادییەكان بە جۆرێك شوێنێكی گرنگی لە نێو كاری زلهێزەكان داگیركرد" هەروەك لازاریفی كوردناس لەو بارەیەوە دەنووسێت: مەسەلەی كورد وەكو كێشەیەكی نێو دەوڵەتان لە سەرەتای چەرخی نۆزدەهەمدا سەریهەڵدا و لە سەدەی بیستەمیش دوای شەڕی یەكەمی جیهان لەسەر ئاستی نێودەوڵەتان بایەخی زیاتر بوو[٢٣]، ئەمەو لە بەڵگەنامە رەسمییەكانی ئینگلیزدا هاتووە كە هەر یەك لە رووسیای قەیسەری و ئینگلیز بە هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهانیدا بەڵێنی لە نێوبردنی ئەمبراتۆریەتی عوسمانییان دابوو ئەگەر بێتو سەرانی دەوڵەت لە جەنگدا بچنە پاڵ ئەمبراتۆریەتی ئەڵمانیا . لە ئابی ١٩١٤ز ئیتیحادییەكان جاڕی جەنگیاندا ئەو جەنگە دەرفەتێكی لەباری رەخساند بۆ ئەوەی رۆژئاوا نەك وەك "داگیركەر"ێك بەڵكو وەك "رزگار كەر"ێك رۆژهەڵاتی ئیسلامیی داگیر بكات و شەرعییەتێكیش بە داگیركردنە شومەكەی بدات !

سیاسەتی دووفاقی دەسەڵاتی مەسیحیەتی رۆژئاوا كە خۆی لەبەرەی هاوپەیمانەكانی رۆژئاوا دەنواند، هەرلەگەڵ دەست پێكردنی كرداری سەربازی ئەو هەقیقەتەی سەرەوەی پێوە دیار بوو، لە سەرەوە بە گەلانی بچووك و ژێر دەستەی ئیمپراتۆرەكانیان دەوت: مەبەستی ئێمە لەو جەنگە دژوارەدا ئەوەیە كە نەتەوە بچكۆلە و بێ دەسەڵات و بندەستەكان لە ژێر حوكمی بێدادی و ستەمكەری دەوڵەتانی زلهێز رزگار بكەین، بە نهێنیش خەریكی داگیركردنی عەسكەری و فیكریی و دابەشكردنی وڵات و سەروەت و سامانی نەتەوەیی ئەو گەلانە بوون كە چارەنووسیان كەوتبووە ژێر رەحمەتی ئەو سیاسەتە گڵاوەی هاوپەیمانەكانەوە !

لە گەرمەی ئەو جەنگەدا، سێرمارك سایكس وەزیری دەرەوەی ئینگلیزو جۆرج بیكۆی وەزیری دەرەوەی فەرەنسا كەوتنە خۆ بۆ ئامادەكردنی پرۆژەیەكی

نێودەوڵەتی بۆ داگیرکردن و دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و کوردستانی باکوور و باشوور و رۆژئاوا، بە حوکمی ئەوەی رووسیاش لە ناوچەکەدا دەسەلاتی سەربازی بەهێز بوو، هەر بۆیە سایکس و بیکۆ داوایان لە سێرجی سازانۆف وەزیری دەرەوەی رووسیا کرد کە بەشداری ئەو پرۆژە ئیمپریالییە بێت. سازانۆف رەزامەندی حکومەتەکەی بە چەند مەرجێك بەستەوە وەك: دەبێ هاوپەیمانەکان مافی شەرعی داگیرکردنی کوردستانی باکووری پێ بدەن، وە ویلایەتەکانی وان و ترابزۆن و بەتلیس و ئەرزەرۆم-یش لە ژێر دەسەلاتی رووسیدا بێت. پاش ئەوەی هەرسێ لا لەسەر پرۆژەی داگیرکردنەکە رێککەوتن، نەخشەیەکی نهێنی یان بۆ شوێنی دەسەلاتی خۆیان دانا: ئەو شوێنەی بەڕەنگی سوور بۆیە کرابوو، ئەوە شوێنی دەسەلاتی ئینگلیز بوو کە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیبوو لە دۆڵی رافیدەین و ئەو ناوچەیە لە خانەقینی کوردستانی باشوور بەرەو خوارەوە درێژ دەبێتەوە تاکو باشووری کوێت. ئەو شوێنەی بە رەنگی شین بۆیە کرابوو بۆ دەسەلاتی فەرەنسی تەرخانکرابوو، کە بریتی بوو لە ویلایەتی موسڵ لە باکووری عێراق و هەرێمی کلکیا و ئەو شوێنانەی ئێستا پێی دەڵێن کوردستانی بندەستی عێراق و سوریا (٢٤). ناوچەیەکیش کە بە ڕەنگی سەوز بۆیە کرابوو، ئەم ناوچانەی دەگرتەوە: باکووری خۆرهەلاتی تورکیا- هەرێمەکانی ئەرزەڕۆم و تەرابزۆن و وان بەتلیس و ناوچەی ورمێ. ئەو رێککەوتننامەی هاوپەیمانەکان تاکو ئاگر بەست مۆدرۆس ١٩١٨/١٠/٣٠ز هەر لە چوارچێوەیەکی نهێنی مایەوە، بەجۆرێك دەمێك کە سوپای ئینگلیز لە کۆتایی ١٩١٧ەوە دەستیکرد بە داگیرکردنی خانەقین و دووجار داگیرکردنی کەرکووك- جارێك لە نیسانی ١٩١٨ز وە جاری دووەم لە ١٩١٨/١٠/٢٥ز دوایی هەولێر..و هتد، هەر بانگەشەی رزگاریخوازی و عەدالەتی کۆمەلایەتی دەکرد. بەلام کاتێك ئاگر بەست راگەیانرا شاری موسڵ و سلێمانی داگیر نەکرابوون. ئەو شوێنە ستراتیژییەی شاری موسڵ، خالێکی تایبەتی مەنهەجی ئیمپریالیانەی ئینگلیز بوو. هەر بۆیە ئینگلیز لە بیانوێك دەگەڕا بۆ ئەوەی ئەو شوێنە ستراتیژییە داگیر بکات، هەر بۆیە هەر بە پێی بەندی حەوتەمی ئاگر بەستی مۆدرۆس مافی ئەوەیان بە خۆیاندا کە موسڵ داگیر بکەن. ئەمە و بە

كرده‌وه‌ و هه‌ر هه‌فته‌یه‌ك دوای مۆركردنی ئاگربه‌ست، شاری موسڵیان داگیر كرد[٢٥]. ئه‌و داگیركردنه‌ شوومه‌ سه‌ره‌تایه‌ك بوو له‌ ئاشكرا بوونی هه‌قیقه‌تی رۆژئاوا له‌ رۆژهه‌ڵات، هه‌روه‌ها سه‌ره‌تای تروكاندنی گه‌رای داگیركردنی كوردستانی عوسمانلی بوو. سه‌باره‌ت به‌ شاری سلێمانیش به‌ شێوه‌یه‌كی سیاسیی و دبلۆماسییانه‌ حوكمداری ناوچه‌كه‌یان به‌ شێخ مه‌حموود به‌خشی، دواییش به‌ زه‌بری چه‌ك حوكمدارییه‌كه‌یان هه‌ڵوه‌شانده‌وه‌.

هاوپه‌یمانه‌كان بۆ ئه‌وه‌ی شه‌رعیه‌تێك به‌ داگیركردنی وڵاتی گه‌لان بده‌ن له‌ ١٩١٩/١/٢٥ز كۆمه‌ڵه‌ی گه‌لانیان دامه‌زراند و له‌ ١٩١٩/١/١٨ز جاڕی كۆنگره‌ی ئاشتی پاریس یاندا بۆ لێكۆڵینه‌وه‌ له‌ مه‌سه‌له‌ گرنگه‌كانی رۆژهه‌ڵات، مه‌سه‌له‌ی كوردیش بوو به‌ یه‌كێك له‌ مه‌سه‌له‌ گرنگه‌كانی ئه‌جێندای ئه‌و كۆنگره‌یه‌: هه‌ر بۆیه‌ هه‌ندێك له‌ سه‌رانی كورد ئه‌و ده‌رفه‌ته‌یان قۆسته‌وه‌ و چه‌ندان كۆمه‌ڵه‌ی سیاسیی كوردستانی شه‌ریف سه‌عید پاشایان به‌ نوێنه‌ری كورد بۆ كۆنگره‌ی پاریس ره‌وانه‌ كرد. هه‌وڵ و ته‌قه‌لا دبلۆماسییه‌كه‌ی شه‌ریف پاشا سێ به‌ندی په‌یمانی سیڤه‌ری لێ ده‌رچوو، كه‌ بریتی بوون له‌ به‌نده‌كانی ٦٢، ٦٣، ٦٤. ئه‌و په‌یمانه‌ له‌ دید و روانگه‌ی كورده‌ عه‌لمانییه‌كانه‌وه‌ زیاد له‌ پێویست گرنگی پێدراوه‌، به‌ڵام له‌ راستیدا په‌یمانه‌كه‌ هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ بڕیاری له‌سه‌ر درابوو گه‌مه‌ به‌ عه‌قڵیه‌تی بكرێت و دۆزی كوردان هه‌ر له‌ نێو گۆماوێكی مه‌نگدا بهێڵرێته‌وه‌. بۆ راستی قسه‌كانیشمان هه‌قیقه‌تی په‌یمانه‌كه‌ و هه‌ڵوێستی رۆژئاوا له‌ چه‌ند خاڵێكدا روون ده‌كه‌ینه‌وه‌، سه‌ره‌تا هه‌ر به‌ پێی ناوه‌ڕۆكی به‌ندی ٦٤ی په‌یمانه‌كه‌، "سه‌ربه‌خۆیی" كوردستانی عوسمانلی به‌ چه‌ند مه‌رجێكی دژوار و موسته‌حیل به‌سترابۆوه‌.

**یه‌كه‌م:** دانانی ماوه‌ی ساڵێك بۆ دامه‌زراندنی ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌ خه‌یاڵیه‌ی كورد كه‌ ده‌كه‌وێته‌ رۆژهه‌ڵاتی فورات و خوارووی ده‌وڵه‌تی سه‌ر كاغه‌زی ئه‌رمینیا، ئه‌و ماوه‌ زه‌مه‌نییه‌، كورد پێویستی پێ نه‌بوو، به‌ڵكو هاوپه‌یمانه‌كان هه‌ر بۆ به‌رژه‌وه‌ندی خۆیان وه‌ك مه‌رجێك دایاننابوو بۆ ئه‌وه‌ی به‌ گوێره‌ی ره‌وتی رووداوه‌كان هه‌ڵوێستی خۆیان وه‌ربگرن. ئه‌گه‌ر هاوپه‌یمانه‌كان له‌گه‌ڵ كورد راست بوونایه‌، ئه‌وا هه‌روه‌ك چۆن رێیان به‌ عه‌ره‌به‌ سوننه‌كانی عێراقدا له‌ ١٢ی ئابی ١٩٢١ز ده‌وڵه‌تی

عێراق دابمەزرێنن و رێیان بە ئەتاتورکدا لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ز تورکیای نویێ دابمەزرێنێ و رێیان بە رەزا شا دا لە ١٩٢٥ز دەوڵەتی ئێران دابمەزرێنێ رێیان بە کوردیش دەدا لەگەڵ دەرچوونی پەیمانی سێڤر دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنێ.

**دووەم:** دەبێ دانیشتوانەکانی ئەو ناوچانەی لە خاڵی یەکەم خرانە روو "خۆیان داوای جیابوونەوە لە تورکیا بکەن. ئەو مەرجەش تەواو بیری لێکرابۆوە، چونکە ئەوان چاك شارەزایی پێکهاتی کۆمەڵی کوردەواری و عەقڵییەتی عەشایەری و سیاسیی کورد بوون، ئەوسا سەرانی کورد بوو بوون بە دوو سێ بەرەی دژ بەیەك و هەر یەکە بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی و بەرژەوەندییەکانی دەیڕوانییە مەسەلەکە. کۆمەڵێك کە لە ئاغا و سەرکردە خێڵەکان و هەندێك ئەفسەری کۆنی عوسمانیی پێکهاتبوون، بە جارێك کەوتبوونە ژێر گوشاری دیماگۆژییەتی ئەتاتورکەوە. هەر بەقسەی ئەتاتورك بیری سەربەخۆیی کوردستانیان رەت کردەوە و تەلەگرافیان بۆ ویدرۆ ویلسن نارد و دەیانووت: ئێمە سەربەخۆیی کوردستانمان ناوێ، برایەتی کورد و تورك-مان دەوێ[٢٦] بەشێکی تر کە بریتی بوون لە کۆمەڵەی بەرزێتی کوردستان. ئەوانە بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوون لە بازنەی عوسمانییەت دەربچن و دەوڵەتێکی کوردی لە دەرەوەی ئیمپراتۆری عوسمانیی دابمەزرێنن. بەشی سێیەمیش کە کۆمەڵێکی بێ دەسەڵات بوون داوای سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد. هاوپەیمانەکان ئەو هەقیقەتەیان چاك دیراسە کردبوو، هەر بۆیە جیابوونەوەی کوردیان لە دەسەڵاتی عوسمانیی بە مەرجێك دانابوو!

**سێیەم:** ئەگەر هەموو کوردەکانیش رازیبوونایە و یەك بڕیاری سیاسییان بدایە، هێشتا دەوڵەتە خەیاڵییەکەی کورد بە پێی پەیمانی سێڤر لە دایك نەدەبوو، چونکە هەر بە گوێرەی دەقی بەندی ٦٤ دەبوو "هاوپەیمانەکان-کۆمەڵەی گەلان" بە بڕیاری سیاسیی کورد رازیبوونایە، ئەوسا دەوڵەتی کوردی دادەمەزرا؟ ئەمەش خۆی لە خۆیدا لە مەنهەجی هاوپەیمانەکان هەر حسێبیشی بۆ نەکرا بوو، چونکە هەر لە هەمان رۆژی راگەیاندنی پەیمانی سێڤر ١٩٢٠/٨/١١ز هاوپەیمانەکان بڕیاری هاوبەشی داگیرکردنی کوردستانی باکووریاندا کە لە ئاکامی کودێتای سووری

رووسیا و ئاگر بەست ئیتیحادییەکان و رووسیا و بەپێی پەیمانی بریست لیتسۆفیسك لەشكری رووسیا ئەو ناوچەیەی چۆڵ كردبوو. ئەمە و ئینگلیز رێی نەدا وەفدی شێخ مەحموود له كوردستانی خواروو و وەفدی كوردەكانی كوردستانی رۆژهەڵات بەشداری كۆنگرەی ئاشتی بكەن یان هەر هیچ نەبێ یاداشتی ئەو دوو بەشەی كوردستان به وەفدی كوردی رابگەیەنن. ئەمەش هەر خاڵێكی گرنگتر بوو، هەقیقەتی ئیزدیواجیەتی عەقڵییەتی رۆژئاوا دەخاتە روو. ئەوان به گوێرەی پەیمانی سیڤر كوردستانی خواروو به بەشێك له دەوڵەتی ئاییندەی كورد دادەنێن، بەڵام كوردستانی رۆژهەڵات به بەشێك له ئێران دادەنێن. به بیانووی ئەوەی ئێران بەشداری شەڕی نەكردبوو، هەر بۆیە كوردەكانی بندەستی ئێران مافی "كورد" بوونیان پێ رەوا نەبینرا. ئەو هەڵوێستە لەلایەن ئینگلیزەوە به تەواوی شكڵێكی توندتری وەرگرت، چونكە ئەو دوو بەشەی كوردستان بەشێك بوون له ئامانجی ستراتیژی ئینگلیز له ناوچەكەدا. كوردستانی رۆژهەڵات له ژێر رەحمەتی رەزا شای پیاوی ئینگلیز بوو، هەرچی كوردستانی خوارووش بوو به پێی پەیمانی سایكس بیكۆ دەبوو له ژێر كۆنترۆڵی فەرەنسی بێ، بەڵام ئینگلیز لەگەڵ هاوپەیمانەكانیش راست نەبوو، هەر بۆیە له رێگایەك دەگەڕا ئەو هەرێمە پترۆڵییە له ژێر كۆنترۆڵی فەرەنسی دەربێنێ، ئەوەبوو جۆرج لۆئیدی سەرۆك وەزیرانی ئینگلیز توانی له كۆنگرەی سان ریمۆ١٩٢٠ز، كلیمانسۆی سەرۆك وەزیرانی فەرەنسا رازی بكات بەوەی دەست بەرداری ویلایەتی موسڵ بێ[(٢٧)] بەر لەو كۆنگرەیەش، ئینگلیز سەبارەت به كورد لەو قەناعەتە دابوو كه شێخ مەحموودی حوكمداری سلێمانی و دەوروبەری نەك هەر بەرژەوەندییەكانی ئینگلیز ناپارێزێ، بەڵكو خەریكە هەڕەشەش له دەسەڵاتی ناشەرعی دەكات، هەر بۆیە به زەبری هێز حوكمداریەكەی شێخی له حوزەیرانی ١٩١٩ز له نێو برد. له باشووری عێراقیش شیعە عەرەبەكانی هاو مەزهەبی ئێران لهساڵی ١٩٢٠ له دژی دەسەڵاتی ئینگلیز راپەڕین و ئەوانیشی سەركوتكرد، هەر بۆیە ئینگلیز له سەركردەیەكی كلاسیكی عەرەبی سوننە دەگەڕا كه حوكمی عێراقی عەرەبی و كوردستانی خواروویان پێ بدات، له نیسانی ١٩٢١ز به ئامادەبوونی (٤٠) سەركردەی عەرەب

لە شاری قاهیرە، میر فەیسەڵێكی –غەیرە عێراقی كردە مەلیكی عێراق[٢٨] بە حوكمی ئەوەی شیعەی باشووری عێراق زۆربەی دانیشتوانی عێراقی عەرەبی پێكدێنن و لەگەڵ فارسەكانی ئێران هاومەزهەب و هاوستراتیژیەتن. لەو نێوە كوردەكانی خوارووی كوردستان خرانە نێو تەرازووی فەیسەڵ بۆ ئەوەی هاوسەنگی و بەرامبەری لە نێوان دەسەڵاتی فەیسەڵ و شیعەكانی باشووری عێراق دامەزرێ. بەم جۆرە سەركردایەتی كورد (شێخ مەحموود، سمكۆ، كوردەكانی قۆچگیری) لە هەموو لایەكەوە لێیان درا. لەولاوەش ئەتاتورك هەر بە هاوكاری ماددی و مەعنەوی ئینگلیز و فەرەنسا و ئیتالیا و یەكێتیی سۆڤییەت لە ١٩٢٣/١٠/٣٠ توركیای عەلمانی لەسەر حسێبی بەشێكی خاكی كورد دامەزراند. بەم جۆرە نەك هەر "دەسەڵاتی ئیسلامی" لە ناوچەكەدا نەما، بەڵكو زۆر بە ئاشكرایی سیاسەتی بە رۆژئاواییكردنی دین و ژیار و كولتوری ئیسلامیی پیادە كرا.

ئینگلیز بۆ ئەوەی تەواو دڵنیا بێ كە عەلمانییەتی عەرەب و تورك و فارس بەرنامەكەی بە تەواوی جێبەجێ دەكەن، هەمووی لەیەك بەرەدا دژ بە كورد كۆكردەوە، ئەوانیش بە حوكمی ئەوەی نۆكەرێكی گوێڕایەڵ و خاوەن بەرژەوەندی هاوبەش بوون یەكبوونی كورد دەسەڵاتە ناشەرعییەكەی ئەوانی دەتۆقاند، هەر بۆیە بێگوێدانە ئەوەی كە لەگەڵ كورددا هاودین و حەزارەی و مێژوون، دژ بە كورد هەرچی پێیانكرا كردیان. هەر بۆ نموونە هەردوو دەسەڵاتی توركیا و عێراق لە ژێر كۆنترۆڵی ئینگلیزدا لە ئەنقەرە كۆبوونەوە لە ١٩٢٦/٦/٥ز بڕیاریان لەسەر هێڵی برۆكسل–دا. بە رەسمیش لە ١٩٢٦/٦/١٨ز كوردستانی خوارو لە كوردستانی عوسمانلی دابڕاو بە عێراقی عەرەبی لكێنرا و ناونرا "باكووری عێراق" یەكبوون و تەبایی داگیركەرانی كوردستان لەسەر لێدانی دۆزی كورد، عەقڵییەتی خێڵەكی بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد لە لایەكی ترەوە بوون بە هۆی هەرەس و كوژاندنەوەی شۆڕشی شێخ مەحموود، شێخ سەعیدی پیران، ئاگری داغ و بارزانی یەكەم، سمكۆی شكاك و دەرسیم و ...هتد، كوردستان تاكو كۆتایی جەنگی

دووەمی جیهان تەواوی لە رووی عەسکەری و فیکرییەوە لەلایەن داگیرکاران کۆنترۆڵکرا، بزووتنەوەیەکی چەکداری دیار لە ناوچەکەدا نەما.

لە کۆتایی سییەکان، بە دروستی لە ساڵی ١٩٣٩ز، بەرژەوەندییە عەسکەری و ئابووری و سیاسییەکانی زلهێزەکانی جیهان جارێکی تر چارەنووسی گەلانی بەرەو چارەنووسێکی نادیار و سامناك راپێچ کرد. ئەگەر چی ئاکامی ئەو جەنگە جیهانخۆرییە "سەرکەوتنی" عەسکەری هاوپەیمانەکان و هەرەسی فاشیەتی ئیتالیا و نازیەتی ئەڵمانی و عەسکەرتارییەتی یابانی لێدەرچوو، بەڵام هەر لە نێو خودی هاوپەیمانەکان دا ململانێیەکی توندتر تەقییەوە. ئەو ململانە ئایدۆلۆژی و عەسکەرییە ئاکامە عەسکەری و سیاسییەکانی جەنگە جیهانییەکە سیناریۆی دووبارە دارشتنەوەی نەخشەی جوگرافیای سیاسیی جیهانی لێکەوتەوە. هەروەك بیستەکانی ئەو سەدەیە، بۆ ئەوەی پاساو بۆ کارو پرۆسەی ئیمپریالی خۆیان بهێننەوە، لە ٢٥ی مایسی ١٩٤٥ز رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیان دامەزراند. لەبەر رۆشنایی دەرئەنجامی رووداوەکان، گەلی ئازەری لە کۆتایی ١٩٤٥ز حکومەتێکی ئازەری لە تەبرێز و کوردەکانی رۆژهەلاتی وڵاتیش لە بەرایی ١٩٤٦ز حکومەتێکی دیموکراتیان لە مەهاباد دامەزراند. دامەزراندنی ئەو دوو حکومەتە دەرکەوتنی خاڵی گۆڕانی بەرژەوەندییەکانی سۆڤییەت و ئەمریکا بوو لە ناوچەکەدا، چونکە ئەو دوو حکومەتە لە ژێر چاودێری عەسکەرتارییەتی سۆڤییەت دامەزرابوون، ئەمەش لە دید و بۆ چوونی ئەمریکا و بەریتانیا هەڕەشەیەك بوو لە بەرژەوەندییەکانیان دەکرا. ئەو هەقیقەتەش شتێکی شاراوە نییە، چونکە ئینگلیز نەك هەر بەرپرسی بڕیاری سیاسیی و عەسکەری بەغدا و تەهران و ئەنقەرە بوو، بەڵکو بە کردەوەش بەشداری کرداری سەربازی کرد لە دژی شۆڕشی بارزانی لە ١٩٤٥ز.

هەر بۆیە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە هەر پارچەیەکی کوردستان، هەڕەشەیەك بوو لە ئینگلیز و دیکتاتۆرە دەستکردەکانی دەکرا. لەبەر رۆشنایی ئەم راستییە حوکمی لێدان و لەبەینبردنی ئەو ئەزموونەی کورد شتێکی حەتمی بوو، دەبوو بکرێ! لە ئاکامدا هەر یەك لە بەریتانیاو ئەمریکا توانیان لە رێگای

"الأمم المتحدة"ەوە هەرەسی هەردوو حکومەتەکە مسۆگەر بکەن، ئەویش بە کشانەوەی سوپای هەرسێ لا، سۆڤییەت و ئەمریکا و بەریتانیا، لە ئێران و کەنداو، دەسەڵاتی مەرکەزیش بۆ کوردستان و ئازەربایجان، بەم جۆرە لە (١)ی دیسەمبەری ١٩٤٥ز سوپای ئەمریکی، لە (١)ی ئاداری ١٩٤٦ سوپای بەریتانی، وە لە(١٠)ی ئاداری ١٩٤٦ز لەشکری سووری سۆڤییەت، ناوچەکەیان بۆ ئەرتەشی ڕەگەزپەرستی فارسی چۆڵکرد[٢٩].

ئەو کشانەوە عەسکەرییە لە ناوچەکە دوو سوودی ستراتیژیی بۆ ئەمریکا و ئینگلیز مسۆگەر کرد:

**یەکەم:** لاوازکردنی دەسەڵاتی سۆڤییەت و بەر بەستکردنی تەوژمی مارکسییەت لە ناوچەکەدا.

**دووەم:** لاوازکردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان و لە بەینبردنی حکومەتی کوردستان و ئازەربایجان، لەو نێوەش سۆڤییەت ئامادەنەبوو لەبەر خاتری کورد و ئازەری لەگەڵ ئینگلیز و ئەمریکا بچێتە شەڕەوە. ئەمە و سۆڤییەت هەر بەوەندە نەوەستا بەڵکو کاریگەرێکی زۆر سەلبی لە ورەی سەرانی هەردوو حکومەت کرد و پێیان ڕاگەیاندن کە حکومەتی قەوام سەڵتەنە هەڵبژاردنێکی دیموکراتیانە لە سەراپای ئێران– بە کوردستان و ئازەربایجان– ساز دەکا، هەر بۆ ئەوەی بەر بەستی ئەرتەشی ئێران نەکەن!

لە ئاکامدا سەرانی هەر دوو حکومەتی ئازەری و کورد بەبێ بەرگری ئاشبەتاڵیان لێکرد. لێرەدا پێویستە هەقیقەتی هەڵوێستی سۆڤییەت روون بکەینەوە. سۆڤییەت دەستێکی باڵای هەبووە لە رووخاندنی هەردوو حکومەتەکە، ئەو رێکەوتننامەیەکی نهێنی لەگەڵ حکومەتی تەهران مۆر کردووە و بەپێی ئەو رێکەوتننامەیە کۆمپانیایەکی نەوتی هاوبەش لە ئێران دابمەزرێ. ئەو کۆمپانیا نەوتییەش پاڵنەرێکی سەرەکی بوو کە سۆڤییەت ئەو هەڵوێستە وەربگرێ، بەڵام دەمێك ئەرتەشی ئێران هەردوو حکومەتەکەی لە نێو برد، رێکەوتننامەکەی بە شتێکی "هەروا بزانە نەبووە"[٣٠] دانا. بەم جۆرە سەرانی (الأمم المتحدة) نەك هەر وەك "کۆمەڵەی گەلان ١٩١٩ز" حکومەتی کوردیان لەنێو برد، بەڵکو سنوورە

ئیمپریالییەکانیان بە پیرۆز زانی و (مافی ڤیتۆ)یان کردە گرێ کوێرەی هەموو مەسەلەکان.

ئەمەو لە ١٩٤٨/١٢/١٠ز جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ درا، بەڵام لە راستیدا ئەمەش هەر خۆی لە خۆیدا دووچاری کردنەوەی سیاسەتی ئیمپریالیزم بوو. هەروەك لە بەندێکدا هاتووە "هیچ دەوڵەتێك بۆی نییە دەست بخاتە ناو کاروباری ناوخۆی دەوڵەتێکی دیکەوە، چونکە هەر دەوڵەتە و لە سنووری نێو دەوڵەتی خۆیدا سەربەخۆیە".

کۆمەڵەی گەلان، کوردستانی دابەشکرد و بە عێراقی عەرەبی و سوریاو تورکیاو ئێرانیەوە لکاند، مەسەلەی کورد لەو دەوڵەتانە بوو بە مەسەلەیەکی ناوخۆیی. لەو پێودانگەوە کورد بێ دەوڵەتە و ناکرێ بە هیچ جۆرێك دەست بخرێتە کاروباری ناوخۆی عێراق و سوریا و تورکیا و ئێران، چونکە هەریەك لەو دەوڵەتانە، دەوڵەتی سەربەخۆن لە دوای جەنگەوە ململانێی نێوان هاوپەیمانەکانی جەنگ بە جارێك توند بوو، جیهان بۆ دوو کامپی دژ بەیەك دابەشکران، هەر بۆیە کێشەکانی جیهانی سێیەم هەر لە نێو تەلیسمدا مانەوە. ئەوەو شەڕی ساردی نێوان سەرانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە پەنجاکاندا بوو بە شەڕی ئەمریکا و سۆڤییەت، هەر یەکە دەیویست لە رێگای هاوپەیمان و تۆکەرەکانیەوە شوێن پێی ئەوی تر لە رۆژهەڵات لەق بکات. "لە پەنجاکاندا دەسەڵاتی ئەمریکا لە ناوچەکەدا دەستی لە دەسەڵاتی فەرەنسی و ئینگلیزی هاوپەیمانیشی سەند بوو. دەسەڵاتی ئەمریکی لە ناوچەکە لەلایەك، وە یەکرێزکردنی دیکتاتۆرەکانی ناوچەکە و پتەوکردنی پەیوەندی عەسکەری و سیاسیی و ئابووری لەگەڵیان لە لایەکی ترەوە هەڕەشەیەکی ئاشکرا بوو لە سنوورەکانی ـ تورکیا، سۆڤییەت ـ ئێران دەکرا"[(٣١)] بۆ دەمکوتکردنەوەی هەر بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی بە گشتی و کورد بە تایبەتی هێزێکی ناوخۆیی لە عێراق، ئێران، تورکیا، پاکستان، پێکهات بۆ زیاتر بەرجەستەکردن و قوڵکردنەوە و کارپێکردنی بڕیارەکانی سەعد ئاباد، ١٩٣٧، لە ١٩٥٥/٢/٢٤ پەیمانی بەغدا–سەنتۆ– بە نوێنەرایەتیکردنی ئەو دەوڵەتانەی خوارەوە:

لە عێراقدا نووری سەعید، لە تورکیا عەدنان مەندەریس، لە ئێران حسێن عەلاء لە پاکستان جودری موحەممەد عەلی، لە بەریتانیا هارۆڵد ماکمیلانی مۆر کرا. لازاریف دەنووسێ "ئەمریکا کوردستانی نەکردبووە ئامانجێکی خۆی، بەڵام بەرژەوەندی لەوەدابوو جوڵانەوەی نەتەوەی کورد بە لاوازی بمێنێتەوە، کە نەبێتە هۆی جێ پێ لەقکردنی ئەو رژێمە کۆنەپەرستانەی سەر بە رۆژئاوان لە تورکیاو ئێران و عێراقدا"[٣٢] لە لایەکی تریش ئەمریکا هەر بۆ ئەوەی کاریگەری کۆمۆنیستی لە ناو کورددا لاواز بکا و سەرکردە عەشائیرییەکانی ناوچەکە بە کۆ هەردوو پارتی فیکر کۆمۆنیستی لە کوردستانی باشوور دەبن نێت، پڕوپاگەندەی کوردستانی سەربەخۆی بڵاوکردەوە.

"هەر لەو بارەیەوە سەفارەتی دەرەوەی ئەمریکا داوای لە بابا عەلی شێخ مەحموودی کۆنە وەزیر کرد، کە ئەگەر بێت و کورد لە سۆڤییەت دوورکەونەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا ببەستن ئەوا حوکمی زاتیان پێدەدرێ"[٣٣] بەڵام دەسەڵاتی هەردوو حیزبە مارکسییەکەی کوردستان لە دەسەڵاتی سەرکردە عەشائیرییەکان بە هێزتر بوو، هەر بۆیە سەرانی کورد هەر لە نێو تەلیسمی سۆڤییەت مانەوە !

مانەوەی سەرانی کورد لە نێو کامپی سۆڤییەت، هەڵوێستی ئەمریکای بەرامبەر بە کورد تووند تر کرد، بەجۆرێك ئەمریکا نەیهێشت حیزبەکانی کوردستان سوود لە بڕیاری ١+١٥١٤/٧ز نەتەوە یەکگرتووەکان کە لە ساڵی ١٩٦٠ز دەرچوو ببینن ،کەچی هەرسێ رێکخراوی راف و پۆلیساریۆ و سواپۆ لەبەر رۆشنایی ئەو بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی رەوایان پێدرا، کە نوێنەرایەتی دۆزەکانی خۆیان بکەن لە (الأمم المتحدة) ئەمە و بۆ ئەوەی رادەیەکیش بۆ دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسمی سۆڤییەتی و رەوتی کۆمۆنیستی لە ناوچەکەدا دابنێن، توانیان لە رێگای بەعسییەکانی عێراقەوە ئەو ئامانجە بهێننە دی.

کودێتاکەی هەشتی شوباتی ١٩٦٣ز بە سەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکرو عەلی ئەلسەعدی و مونزیر لونداوی کودێتایەکی ئەنگلۆ ئەمریکی بوو "هەر وەك (علي صالح السعدي) خۆی دانی پێدادەنێ: "ئێمە بە شەمەندەفەری ئەمریکی

فەرمانڕەوایی عێراقمان وەرگرت" سەرانی کودێتا کەوتنە قڕانی کورد و کۆمۆنیستەکان، هەر بۆیە لە ژێرەوە سۆڤییەت پاڵی وە مەنگۆلیای میللییەوە نا کە نامە یەکی هەڕەشە ئاراستەی ئەنجوومەنی ئاسایش بکا بۆ ئەوەی سنوورێك بۆ ئەو رەفتارانەی بەعسییەکان دابنێ، بەڵام لە پاشان سۆڤییەت هەر خۆی زۆری لە مەنگۆلیا کرد داواکەی وەرگرێتەوە، چونکە سۆڤییەت ئامادە نەبوو بەرژەوەندییە ستراتیژیەکانی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست قوربانی "قڕانی کوردە کۆمۆنیستە نۆکەرەکانی بکات!"[٣٤].

ئەمە و دەمێك دەسەڵاتی رۆژئاوا بۆی دەرکەوت کە بەوەندە ئامانجە ستراتیژییەکەی نایەتە دی زۆری لە بەعسییەکان کرد کە بە هاوکاری ئێران و تورکیا بەجارێك "هەڕەشەی کورد" نەهێڵێت. لە ژێر چاودێری رۆژئاوا هەر چوار داگیرکەری کوردستان: عێراق، ئێران، تورکیا، سوریا لەسەر (پرۆژەی دیجلەی- Tigers) رێککەوتن.

بە گوێرەی نەخشەی دیجلە دەبوو هێزی ئاسمانی ئینگلیز لە قوبرسەوە هێزی پێشمەرگە بوردومان بکا، هێزی تورکیا بەرەو موسڵ بێ و هێزی ئەرتەشی ئێرانیش بەرەو ناوچەی سلێمانی هێرش بەرێت، رژێمی عێراقیش بەرەو چیای پێرس هێرش بەرێت بۆ ئەوەی هەموویان لە یەککاتدا گەمارۆی شۆڕشی کورد بدەن و قڕانی کورد بکەن و بە پێی تەلەگرافی ژمارە (٣٤٧٨/س)ی رۆژی ١٩٦٣/٧/٢ز حکومەتی عێراق دەبێ هێزی ئاسمانی ئەو دەوڵەتانەی سەرەوە کاریان دژی کورد یەك بخەن![٣٥].

لە شەستەکان بەغدا بوو بووە شانۆی کودێتای عەسکەری و سیاسیی، دواجار کە بەعسییەکان جارێکی تر لە ١٧ی تەموزی ١٩٦٨ز حوکمی عێراقیان گرتەوە دەست دبلۆماتی سۆڤییەت بریماکۆف، بە نیازی جێ پێ لەقکردنی ئەمریکا و گەشە پێکردنی رەوتی کۆمۆنیستی لە ناوچەکە و "چارەسەرکردنی" کێشەی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا، بەعسییەکانی رازیکرد گفتوگۆ لەگەڵ مەلا مستەفا بکەن، ئەو هەڵوێستەی سۆڤییەت لە پێناوی کورد نەبوو، بەڵکو هەموو هەوڵی سۆڤییەت ئەوە بوو هەڵوێستی ئەمریکا لە نێو عەرەبان لاواز بێ، دەسەڵاتی

سیاسیی کوردیش ببێته پاشکۆی حیزبی کۆمۆنیستی عێراقی، هەر بۆیە دەمێك سەرانی کورد رازینەبوون بێنە نێو بەرەی (شیوعی– بەعسی) دووجار هەوڵی تیرۆرکردنی مەلا مستەفا درا، لە لایەکی دیش سۆڤییەت شیوعییەکانی لە شۆڕشی کوردستان دابڕی و لەشکری عێراقیشی بە نوێترین چەك و خیبرەی عەسکەری تەیار کرد. لەولاوەش ئەمریکا تەواو دەستی بەسەر (بڕیاری سیاسیی) سەرکردایەتی شۆڕشدا گرتبوو، بەڵێنی بەو سەرکردایەتییە دابوو کە تا دوا ساتی رووخانی رژێمی بەعس درێژە بە هەڵوێستی خۆیان دەدەن[٣٦].

بەڵام بەڵێنی ئەمریکی تەنیا تاکتیکی کاتی بوو، کوردستان لە دەرەوەی بازنەی ستراتیژی ئەمریکادا بوو، ئەو راستییە ئاشکرایەش دەبوو سەرانی کورد هەر لە بەرایی لێی تەواو حاڵی بان و نەکەوتبانە ئەو هەڵە مێژووییەوە، چونکە هەر یەك لە تەهران و ئەنقەرە دوو حکومەتی ئەمریکی بوون، سەرکەوتنی شۆڕشی باشووری کوردستان هەڕەشەیەك بوو لەوان دەکرا، جا ئێمە دەپرسین ئەمریکا بەرژەوەندی خۆی لە دوو حکومەتی ئێران و تورکیا قوربانی شۆڕشی کورد دەکات؟! لێرەدا جارێکی تر چارەنووسی گەلی کورد لە نێو بەرژەوەندی سۆڤییەت و سیاسەتی ناعادیلانەی ئەمریکا و دەست و پێوەندەکانی لە رۆژهەلات وەك ئەنوەر سادات، هاواریان بۆ مەلیك حسێن، موحەممەد رەزا شا، دووچاری هەرەسێکی مەزن بوو! هەر وەك ئاشکرایە ئێرانی ئەمریکا بە گوێرەی، رێکەوتننامەی جەزائیر ٦ی ئازاری ١٩٧٥ز، ناوچەیەکی ستراتیژی لە شەتولعەرەب بەرکەوت، بەڵام کاتێك لە ١٩٧٩ز گەلانی ئێران راپەڕین خومێنی دەسەڵاتی دەوڵەتی وەرگرت و حوکمی (ئیسلامیی) راگەیاند کۆشکی غەرب و شەرقی هەژاند، هەر بۆیە دەوڵەتانی هەردوو کامپی رۆژهەلات و رۆژئاوا حکومەتی عێراقیان هاندا داوای ئەو بەشەی شەتولعەرەب بکاتەوە. بەمجۆرە رێکەوتننامەی جەزائیر بوو بە هەڵگیرسێنەری شەڕی یەکەمی کەنداو، هەر بۆ ئەوەی بە هەر جۆرێك بێ حوکمی (ئیسلامیی) ئێران سەرنەگرێ و جارێکی تر دۆزی کورد وەك کێشەیەکی سیاسیی سەرهەڵنەداتەوە، ئەمریکا دەورێکی گرنگی بینی لە کودێتا عەسکەرییەکەی کەنعان ئیڤرین بۆ ئەوەی لەگەڵ عێراق یەکبگرن دژ بە ئێران و دۆزا کورد، لەو

نێوه هەردوو دەسەڵاتی عەسکەری عێراقی و تورکی لە پێناوی راونان و لێدانی بزووتنەوەی کورد ئەو سنوورە نێو دەوڵەتیەشیان بەزاند کە بە زۆر بەسەر کوردیاندا سەپاندووە.

هەرچەندە عێراق بە شێوەیەکی فراوان لە رووی عەسکەریی و ئابوورییەوە لەلایەن ئەمریکا و سۆڤییەت یارمەتی دەدرا، بەڵام هەڵوێستی عەسکەری عێراق لەبەرەی جەنگدا هەر لاواز دەبوو ئەو قەیران و پەشێوییە عەسکەرییەی عێراق ئەمریکای بە تەواوی نیگەرانکردو ترسی ئەوەی لێ نیشت عێراق برووخێ و شیعەکانی باشوور حکومەتێکی ئیسلامیی دابمەزرێنن و تەواو جێ پێی رۆژئاوا لە ناوچەکەدا لەق بێ، هەر بۆیە ئەمریکا لەبەردەم دووڕیانێکدا بوو یان دەبێ بە ئەمری واقیع رازی بێ، هەروەك چۆن بە ناچاری بە ئێران رازییبوو، یان شتێکی وا بکات عێراق لە رووخان رزگار بکات، لەو نێوە لە بەرایی (وەرەقەی کێشەی کورد)ی هەڵبژارد. لە پێناو بە ئەنجامگەیاندنی ئەو فیکرەیە "لە ١٩٨٦/١١/٧ز ویلیەم سافیی سەرۆکی CIA سەردانێکی لە ناکاوی بۆ تورکیا کرد، هەرچەندە ئەو سەردانەی ساف لە لایەن ئاژانسی ئەنادۆڵی نیمچە رەسمییەوە بە مەسەلەی پەیوەندی چەکی ناتۆ "لێکدرایەوە بەڵام راستی مەسەلەکە هەر وەك گۆڤاری تورکی Lkibnedogpu لە ژمارە (١١)ی ئاداری ١٩٨٨ دەریخست بەم شێوەیە بوو: "گەڕاندنەوەی ویلایەتی موسڵ لە ژێر چاودێری ئەمریکا[٣٧]" بەڵام کە پیلانە عەسکەرییەکە مەیسەر نەبوو، ئەمریکا بۆ ئەوەی حکومەتی عێراق لە هەرەسی حەتمی رزگار بکات بە کردەوە لایەنگیری عێراقی کرد لە جەنگدا وە زۆری لە ئێران کرد بە بڕیاری ٥٩٨ی ئەنجوومەنی ئاسایش رازیبێ ئەمە و گڵۆپی سەوزیشی بۆ حکومەتی عێراق هەڵکرد بۆ ئەوەی بە هەر جۆرێك و بە هەر بەشێوەیەك بێ بزووتنەوەی کورد لە نێو بەرێ بەمجۆرە ئەوانەی لە رووی عەسکەرییەوە چاوەڕێ دەکرا سەرکەون، ژێر کەوتن.

ئەوانەی مشوری (عروبە) دەخۆن جەنگی دووەمی کەنداو بە داگیرکردنێکی نوێی رۆژهەڵات دادەنێن. گەرچی ئەو بۆ چوونە تەواو لەگەڵ ستراتیژییەتی ئەمریکا و پیلانەکەی پرنارد لویس، لەمەڕ رۆژهەڵات، یەك دەگرنەوە. "هەروەکو

لە داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە دەرکەوت، کە ئەوەی بەلای ئێمە سەرەکی و گرنگە نەهێڵین دەوڵەتێك بەسەر دەوڵەتێکی تردا زاڵ بێت، یاخود هێزەکانیان یەکبگرن و لە ناوچەکەدا بالا دەست بن". بەڵام تەوژمی (عروبە)یش هەر خۆی لە خۆیدا جۆرە داگیرکردنێکی فیکرییە لە ئاقار ئیسلام و داگیرکردنێکی عەسکەریشە لە بەرابەر گەلانی رۆژهەلات بە تایبەتی کورد !

دوای هاتنە سەرکاری گۆرباتشۆف، قەیران و تەنگژە سیاسیی و ئابوورییەکانی سۆڤییەت بەدەرکەوتن و ململانێی مۆسکۆ و واشنتن خاو بۆوە، هەر بۆیە ئەو دەسەلاتە سیاسییەی ئەمریکا لە رۆژهەلات هەیبوو (توقع)دەکرا بێ ململانێ بێ بە دەسەلاتێکی عەسکەری و ئابووری فراوان. لەو روانگەیەوە هاوکات لەگەڵ گەرمەی رووداوەکانی کەنداو، یەکێتیی سۆڤییەت وەکو زلهێزێکی هاوشانی ئەمریکا هەرەسی هێنا، بەمەش بڕیاری لێدانی عێراق بێ ڤیتۆی سۆڤییەت دەرچوو !

دوای ئەو هەرەسە عەسکەرییەی عێراق لە کوێت، ئاوەژۆ دەکرا هاوپەیمانەکان بەغداش بگرن، بەڵام لە راستیدا ئەمەیان "جاریێ" ستراتیژیەتی ئەمریکا نەبوو، چونکە "کۆماری بە زۆر سەپاوی عێراق" دوو کێشەی زۆر ئالۆزی لە خۆوە گرتووە:

یەکەم: کێشەی شیعەکانی باشوور کە زۆربەی دانیشتوانی عێراق پێکدێنن، ئەمە و ئەو شیعانە لەگەڵ ئێران هاومەزهەب و هاو ستراتیژیەتن.

دووەم: مەسەلەی کورد لە "باکووری عێراق"–کوردستانی خواروو– ئەوانیش بەشێك لە خاکەکەیان لە ژێر دەسەلاتی تورکیای هاوپەیمانی ئەمریکادایە.

هەر لەو پێودانگەوە دەمێك جۆرج بوش لە ١٩٩١/٢/٢٨ز بڕیاری شەڕ راگرتنی لەگەڵ رژێمدا، مەبەستی بوو شەڕێکی نێوخۆی توند لە نێوان گەلانی عێراق و کوردستان هەڵبگیرسێنن، هەروەك چۆن هنری کیسنجەر سوننە و شیعە و کاسۆلیك و ئەرسەدۆکس و دروز و فەلەستینییەکانی لوبنانی بە گژ یەکەوەنا، پاشان ئاکامی راپەڕینی شیعەکانی باشوورو کوردەکانی "باکوور" تەواو پێچەوانەی خەونەکانی رۆژئاوا بوون، چونکە هەروەك وتمان، ئەمریکا بە هیچ جۆرێك رازی نابێ شیعەکانی باشوور حوکمی عێراق بکەن و کوردەکانیش ببنە

"مەترسی" بۆ تورکیا، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو هەروەك لە نیسانی ١٩٩١ رادیۆی دەنگی ئەمریکا بڵاویکردەوە "پنتاگۆن داواکاری کۆمەڵە ئەفسەرێکی نێو کۆشکی کۆماری عێراقیشی رەت کردەوە کە دەیانویست بە پاڵپشتی ئەمریکا کودێتایەکی سەربازی لە دژی صەددام بکەن ئەمە هەروەك دوایی دەرکەوت، CIA ئەو پلانەی ئاشکرا کرد و ناوی سەرانی کودێتاکەشی بە رژێمدا! هەروەك لە پێشد وتمان، راپەرینی شیعەکان و کوردەکان لەگەڵ ستراتیژیەتی ئەمریکا یەکی نەدەگرتەوە هەتا "ئیسرائیل"یش رایگەیاند کە (سەددامێکی لاواز و بێ دەسەڵات) لە حکومەتێکی شیعەی یان کوردی پێ باشترە، هەر بۆیە جۆرج بوش نەك هەر لە قسەکانی خۆی پەشیمان بۆوە، کە دەیوت گەلانی عێراق دەبێ خۆیان مشوری حاڵی خۆیان بخۆن، بەڵکو رێی بە سوپای سەرکوتکەری عێراقدا بە هەر "جۆرێك" بێ راپەرینەکە دابمرکێنێتەوە.

لە باشوور بە ئاشکرا هێزی هاوپەیمانەکان هاوکاری سوپای عێراقیان کرد، لە کوردستانیش هەلیکۆپتەر و تانکی عێراقی شارەکانی وێران دەکرد و فڕۆکەکانی رۆژئاواش لە سەرەوەی هەلیکۆپتەرەکانەوە "وێنەی" ئەو مەرگەساتەیان دەگرت! لە ماوەی چەند رۆژێك هەر چوار شاری کوردستان، کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و دهۆك داگیرکرانەوە لە هەندێك ناوچە سوپا گەیشتە سەر سنووریش، لە ئاکامدا نزیکەی دوو ملیۆن کورد بەرەو سنوورە دەستکردەکانی ئێران و تورکیا بەرێکەوتن. ئاکامی ئەو کۆچڕەوەش خەریکبوو بە زەرەری ئەمریکا تەواو ببێت، چونکە لە لایەك کوردی سێ پارچەی کوردستانی داگیرکراو تێکەڵ بەیەك دەبوون و جۆرە "هاوپەیمانییەکی رۆحی"یان لە لا دروست دەبوو، بە تایبەتی لە کوردستانی باکوور P.K.K. ئەو دەرفەتەی قۆستەوە و سەرانی تورکیش هەستیان بە نیگەرانی کرد، هەر بۆیە داوایان لە ئەمریکا کرد، سنوورێك بۆ هێرشەکەی سەددام دابنێ. لە لایەکی تریش کۆچڕەوەکە خۆی لە خۆیدا فاشلبوونی کرداری (عاصفە الصحرا)ی ئەمریکا دەگەیاند و لە نێو خودی کۆمەڵگای رۆژئاواش رەخنەی توند ئاراستەی سیاسەتی ئەمریکا کرا سەبارەت بە عێراق، هەر بۆیە ئەنجوومەنی ئاسایش لە شەوی ٦/٥ی نیسانی ١٩٩١ بڕیاری

ژمارە "٦٨٨" دەرکرد[٣٨]. ئەو بڕیارەی ئەنجوومەن دوو خاڵی زۆر گرنگی سەبارەت بە کوردە لە خۆ گرت.

**یەکەم:** ئەو بڕیارە کە بە واتای "دەستتێوەردان لە کاروباری ناوخۆی دەوڵەتێکی سەربەخۆ دێت"، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەزاندنی بڕگەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە دەڵێ: هەموو دەوڵەتێك لە سنووری نیشتمانی خۆیدا سەربەخۆیە، لێرەدا سنوورە "پیرۆزەکەی" ئیمپریالیزم بەزاندرا و خودی جۆرج بوش لەو بارەیەوە دەڵێت: "لەمەودوا لە هەر شوێنێك دیموکراسییەت- بەرژەوەندی ئەمریکا- بکەوێتە خەتەرەوە دەبێ بە زەبری چەك ئەو قودسییەتە بگەڕێنینەوە شوێنی خۆی" لە دوا بڕگەی ئەو بڕیارەشدا هاتووە کە مەسەلەی پابەندبوونی عێراق بەڕاگرتنی شەڕ لە دژی کوردان و دابینکردنی ئاشتی و ئاسایش دەبێ هەر لە ژێر چاودێری بێ.

**دووەم:** کردنەوەی فایلی کورد، دوای پەیمانی سیڤر ١٩٢٠ ئەو بڕیارە یەکەم لا لێکردنەوەی نێو دەوڵەتییە لە دۆزی کورد هەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو بڕیارەش بوو هێلی (٣٦) دیاریکراو زۆربەی خەڵکەکەش گەڕایەوە نێو شار و شارۆچکەکان.

دوای ئەوەی کوردەکان جارێکی تر هەرسێ شاری هەولێر و سلێمانی و دهۆك- یان کەوتەوە بەردەست، ئەمریکا نەیهێشت دەسەڵاتی سەرانی کورد بگاتە ناوچە نەوتییەکانی کوردستان، ئەمە و بڕیاری (٦٨٨)یش داوا لە حکومەتی عێراق و سەرانی کورد دەکات کە کێشەکانیان بە گفتوگۆ چارەسەر بکەن. ئەمەش بە ڕاشکاوی ئەوە دەگەیەنێت کە "جارێك" ئەمریکا لەگەڵ دامەزراندنی کیانێکی کوردی نییە، چونکە هێشیا تورکیا لە نێو ئامانجی ستراتیژیەتی ئەمریکایە، هەروەك لە ئامۆژگارییەکانی داڕێژەرانی سیاسەتی ئەمریکا بۆ سیاسەتی دەرەوەیان لە کەنداوی فارس و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هاتووە: "پەیوەندی بەهێز لەگەڵ تورکیادا بهێڵرێتەوە و چەکی پێشکەوتووی پێ بدرێ و دەرگای بازاڕەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوا بۆ شمەکی ناردەی تورکیا بکرێتەوە". ئەو هەڵوێستە ئیزدیواجیەتەی ڕۆژئاوا لە پاش دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان زەقتر

بوو! هەر بۆ بەڵگەش ئەو چەند راستییەی خوارەوە تۆمار دەكەین كە هەموویان دژ بە بڕیاری (٦٨٨) و هێلی (٣٦)ی ناوچەی ئارامی ئەمریكیە.

ئابلۆقەی رژێم، جینۆسایدی خەڵكی، بڕینی كارەبای بادینان و تیرۆركرنی كارمەندانی U.N. و رێكخراوە خێرخوازەكان و بەزاندنی عەسكەری سنووری هەرێم لەلایەن سوپای عێراق، توركیا، ئێرانەوە! پێشێلكردنی بڕیاری (٦٨٨)و سەروەری حكومەتی هەرێم لەلایەك و بەربەستكردنی تەكنەلۆژیای عەسكەری هەرێم لەلایەكی ترەوە تەواو لەگەڵ پیلانەكەی لویس دەسازێن كە دەیەوێت لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەوڵەتی بەهێز نەمێنن و تەنها چەند مەمالیكێكی بچووكی ئۆتۆنۆمیدارو لاواز لە رووی سیاسییەوە لەسەر بنەمایەكی ئەتنیكی دابمەزرێن بۆ ئەوەی بە بێ دژواری ئەمریكا بتوانێ دەسەڵاتی عەسكەری خۆی بەسەریان بسەپێنێ، لە رێنمایی بەرنامەدانانی پێنتاگۆن بۆ ساڵانی ١٩٩٤–١٩٩٩ز ئەو راستییە بە راشكاوی دەربڕاوە: "هەموو ئامانجمان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری رۆژئاوای ئاسیا ئەوەیە كە وەك هێزێكی دەرەكی باڵادەست لە ناوچەكەدا بمێنینەوە و پارێزگاری ئەوەش بكەین كە ئەمریكا و رۆژئاوا بەسەربەستی دەستیان بگاتە نەوتی ناوچەكە هەروەكو لە داگیركردنی كوێت لە لایەن عێراقەوە دەركەوت، ئەوەی بەلای ئێمەوە سەرەكی و گرنگە نەهێڵین دەوڵەتێك بەسەر دەوڵەتێكی تر زاڵبێت یاخود هێزەكانیان یەكبگرن و لە ناوچەكەدا باڵادەست بن"، لەو چەند دێرە دەفامرێتەوە كە ئەمریكا نایەوێت نە حكومەتی هەرێم دەسەڵاتی لەوەندە زێتر بێت نە دەشیەوێ حكومەتی بەغدا بەهێز بێتەوەو هەڕەشە لە كەنداوییەكان بكات.

**+ لەوانەیە یەكێك بپرسێ كەی سیاسەتی رۆژئاوا دەگۆڕێ و دۆزی كورد دەبێتە ئامانجی ستراتیژیەتی رۆژئاوا ؟!**

سەلام : رەوتی رووداوە سیاسیی و عەسكەرییەكان لە عێراق و توركیا شیمانەی ئەوەیان لێدەكرێ كە دوو گۆڕانكاری زۆر گرنگ روو بدەن و ئەو دوو گۆڕانكارییەش وەرچەرخانێك دەبن لە مێژووی سیاسیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، چونكە هەردووكیان تەوژمی بە ئەمریكی كردنی ناوچەكە بەربەست دەكەن، لەو

نێوه ئەمریکا ناچار دەبێ یان دەست له عێراق و تورکیا هەڵگرێ هەروەك چۆن دەستی له باشووری ڤێتنام و لوبنان و کوردستانی باشوور هەڵگرت یان به زەبری چەك بەرژەوەندییەکانی بپارێزێ.. له نێو ئەو گەمه سیاسییەدا شیمانەی ئەوه دەکرێ، ئەمریکا به جددی وەرەقەی کوردی بەکار بێنێ و رەنگه ئەمجاره کیانێکی کوردی دابمەزرێنێ؟!

ئەمریکا، دوای هەرەسی سۆڤییەت له پەنای سیستمی نوێی جیهان دەیەوێت جیهان هیچ هێزێکی بەربەرەکانیکەری ئەمریکای تێدا نەبێ و ئەمه و ئەمریکا ناهێڵێ هیچ دەوڵەتێکی ئیقلیمی له رۆژهەڵات دەست بەسەر پەترۆڵی ناوچەکەدا بگرێت، لێرەدا شەڕێکی حەتمی له نێوان ئێران و کەنداویەکان هەڵدەگیرسێ هەر له ئێستاوەش ئەمریکا ئیماراتی عەرەبی هان دەدات که به هیچ جۆرێك دەستبەرداری دورگەکانی نەبێ بۆ ئێران! بەڵێ تاکو سەرانی عەرەب و فارس بەو عەقڵییەته عەسکەرییەی ئێستاوه بیر بکەنەوە، ئەوا شەڕێکی (عەرەبی – فارسی) و شەڕێکی (سوننی – شیعه) حاڵەتێکی ئاوەژێکراو دەبێ.

دووەمیش گۆڕانکارییەکانی نێو تورکیاو دەوروبەری: به حوکمی ئەوەی ماوەیەکی زۆر تورکیا بنکەیەکی ئیسلامیی گرنگ بووه و له پاشان هەر لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری تورکیا ١٩٢٣ به زۆر کراویەوه بنکەیەکی بڵاوکردنەوەی عەلمانیەت و مەدەنیەتی رۆژئاوا، ئەمه و له ئەیلوولی ١٩٨٠زوه عەقڵییەتێکی عەسکەری توندڕەو تورکیا بەڕێوه دەبەن، لەو روانگەوه شیمعون پێرێز راستی بۆ چووه، که له ١٩٩٤/٤/١٠ز له ئەنقەره به سەرانی تورك دەڵێت: له وڵاتەکەیان ٣٥ هەزار مزگەوت و ملیۆنێك عەسکەری و ملیۆنێك مرۆڤی جامعیی هەن، ئەو هەڵبژاردنەشیان داهاتووی تورکیا دیاری دەکات[٣٩]، هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٤ز زۆربەی عەلمانییەکانی نێوخۆ و دەرەوەی تورکیای سەرسام کرد. ئەمەو هەر پێنج کۆماری تورك زمان کازاخستان، تورکمانستان، ئازەربایجان، قیرقستان و ئۆزبەکستان ئەوەچەندین جاره له دوای هەرەسی سۆڤییەت له تورکیا لەگەڵ سەرانی تورك کۆ ببنەوە.

جەنگی یەكەمی جیهانی كه زیاتر به جەنگی ئیمپریالیزمی نوێ تیۆرێزه دەكرێ، شێوازێكی نوێی داگیركردن بوو هەر داگیركردنی عەسكەری نەبوو، بەڵكو داگیركردنی فیكرو حەزارەتیش بوو.

یەكێك له ئامانجه ستراتیژییەكانی ئەو داگیركردنه هەڵوەشاندنەوەی (خیلافەتی ئیسلامیی)و دامەزراندنی چەند حكومەتێكی نەتەوەیی و ئیقلیمی بوو. ئەو حاڵەتەش جۆره تەنگژەیەكی نوێی له نێو گەلانی رۆژهەلاتدا دروستكرد.

ئەو سنووره دەستكردانەی كۆمەڵەی گەلان له ١٩١٩زدا بڕیاری له سەردان قونبەلەیەكی تەوقیتكراوی له نێو تەنگژەكەدا دانا بۆ ئەوەی هەردەم ناوچەكه له نێو ئاشوب و گێژەندا خول بخوات و چاوی له چارەسەری رۆژئاوا بێ. لەم روانگەوه دەمێك كورد وەك نەتەوەیەك و كوردستان وەك نیشتمانی كورد بەسەر عێراقی عەرەبی و توركیای كەمالی و سوریا و سۆڤییەت[٤٠] دابەشكران، مەسەلەكه هەر لێدانی كورد نەبوو، بەڵكو لێدانی گەلانی ناوچەكەش بوو بۆ ئەوەی هیچ كاتێك ئەو دەوڵەته نا شەرعیانه پەره نەسێنن و نەبنه هێزێك هەڕەشه له بەرژەوەندییەكانی رۆژئاوا بكەن! به واتایەكی تر (كێشەی كورد) كرا به وەرەقەیەك بۆ ئەوەی شادەماری پەرەسەندنی ئابووری و عەسكەری هەر یەك لەو دەوڵەتانەی خاكی كوردی بەركەوتووه له ژێر كۆنترۆڵ و چاودێری دەسەڵاتی رۆژئاوا بێ. بەمجۆره هیچ (هەستێكی نیشتمانی) له نێوان كورد و گەلانی سەردەسته دروست نەبووه و هەر دەمێكیش دەرفەت بۆ كورد رێككەوتبێ و رێك بكەوێ بەو ژێر دەستییه رازینەبووه و نابێت.

به كورتی كۆمەڵەی گەلان (League of Nation) نەخشەیەكی سیاسیی نوێی بۆ رۆژهەڵات داڕشت بەمەش سەرەتایەكی بۆ چەند شەڕێكی ئیقلیمی دانا. دەمێكیش هەر یەك له ئەڵمانیا ئیتالیا و ژاپۆن به دەسەڵاتی كۆنه ئیمپریالیزم و سۆڤییەت رازینەبوون ویستیان (بڕیاری سیاسیی) و كارگێڕی دەوڵەتان بەوان رەوا ببینرێ.

هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی پیادەكردنی ئەو پێشنیارەی عەقڵییەتی عەسكەرتاریەتی ژاپۆن و ئیتالیا و ئەڵمانیا بوو. گەرچی دەرەنجامەكانی جەنگەكه

هەرەسی عەسکەرتاریەتی ژاپۆن و فاشیەتی ئیتالیا و نازیەتی ئەڵمانیا بوو، لە هەمانکاتیشدا سەرەتایەکی نوێ بوو بۆ تەنگژەی نوێ که کۆمەڵەی گەلان نەخشەی بۆ داناو نەتەوە یەکگرتووەکان (١٩٤٥ز) شەرعیەتی پێ بەخشی!

کۆمەڵەی گەلان بڕیاری دابەشکردنی کوردستانیدا و هەر ئەویش چەند سنوورێکی دەستکردی لە نێوان کوردستانی عێراق و سوریاو تورکیا و سۆڤییەت دانا، نەتەوە یەکگرتووەکانیش نەك هەر ئەو سنوورانەی بە (پیرۆز) ناسی بەڵگە شەرعیەتیشی بەو دەوڵەتە ناشەرعیانەی ناوچەکەدا، لەو پێودانگەوە دەتوانین بە راشکاوی بڵێین کە نەتەوە یەکگرتووەکان تەنگژەکانی قووڵتر کردەوە و مەسەلەی دامەزراندنی کیانێکی نەتەوەیی کوردی بە بڕیارێکی (نێو دەوڵەتی) دوورتر کردەوە، دروستبوونی (کامپی رۆژهەلآت –سۆڤییەت) و (کامپی رۆژئاوا– ئەمریکا)و دابەشبوونی داگیرکەرانی کوردستانیش لە نێو هەردوو کامپدا بڕیاری نێودەوڵەتی نەزۆك کرد، چونکە هەر بڕیارێك بۆ کورد بیری لێکرابێتەوە بە ڤیتۆی ئەمریکی یاخود سۆڤییەتی وەلآم دەدرایەوە. ئەو هەلۆێستە نامرۆڤانەی ئەو دوو دەسەلآتە تەنانەت چاویان لە لێدانی کیمیایی هەڵەبجەش پۆشی. ئەگەر ئەو رووداوە لە هەر ولآتێکی تر رووی دابا بە بڕیارێکی عەسکەری ئەنجوومەنی ئاسایش وەلآم دەدرایەوە! بەمجۆرە هەر لە دوای جەنگی دووەمی جیهانەوە تاکو هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی کەنداو مەسەلەی کورد وەك مەسەلەی نەتەوەیەك تەواو لە ئەجێندای نەتەوە یەکگرتووەکان فەرامۆشکرابوو، بەلآم داگیرکردنی کوێت لە لایەك و هەرەسی سۆڤییەت لە لایەکی ترەوە فایلی مەسەلەی کوردی کردەوە!

هەلۆەشاندنەوەی سۆڤییەت و رزگار کردنی کوێت ئەمریکایان کرد بە یەکەم دەسەلآت، ئەویش لە پەنای سیستمی نوێی جیهانی ستراتیژیەتێکی نوێی بۆ خۆی داڕشتووە و ئامانجی ئەو ستراتیژیەتەش لەوەبەر ئاماژەمان پێدا لە رێنمایی بەرنامەدانانی بەرگری پێنتاگۆن بۆ سالآنی ١٩٩٤–١٩٩٩ز ، بیرنارد لویس باوەڕی وایە کە دەبێ فیکرەی عەرەبایەتی(نەتەوەی عەرەب) نەهێڵرێت، ئەو هەڕەشەیەش بە قەناعەتی لویس لە شەڕی دووەمی کەنداو لە نێو بردرا، هەر لەو

بارەیەوە پێنتاگۆن هەموو هێزی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ ئەوەی (دەسەڵاتێکی ئیسلامیی) لە ناوچەکەدا دروست نەبێ، ئەو راستییەش هەر لە رێنماییەکاندا هاتووە (هەروەکو لە داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراقەوە دەرکەوت، کە ئەوەی بەلای ئێمەوە سەرەکی و گرنگە نەهێڵێن دەوڵەتێك بەسەر دەوڵەتێکی تردا زاڵ بێت، یاخود هێزەکانیان یەکبگرن و لە ناوچەکەدا باڵادەست بن).

ئیدی بە گوێرەی پیلانی برنارد لویس دەبێت هەموو دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تاکو هیند لەسەر بنەمای رەگەزی و زمانی و تایفەیی لە نێو ببرێن و تەنیا دەسەڵاتی هەرێمی لە ناوچەکەدا بێت، ئەویش راستەخۆ لە ژێر کۆنترۆڵی ئەمریکا دابێت. ئەو پیلانەی لویس تەواو لەسەر بنەمای پیلانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی دامەزراوە کە دەڵێت: چەند مەمالیکێکی بچووکی ئۆتۆنۆمیدار، لاواز لە رووی سیاسییەوە لەسەر بنەمای ئەتنیکی دابمەزرێن بۆ ئەوەی رۆما (ئەمریکای ئەمڕۆ) بە ئاسانی بتوانێ دەسەڵاتی عەسکەری خۆی بەسەریاندا بسەپێنێ. ئەو هەرێمە ئەتنیکیانە هەندێ ئازادی و سەربەستیان دەبێ تاکو وەلائو گوێڕایەڵ و رێزی رۆما –ئەمریکا–یان لا دەبێ!

هەر وا لویس پێشبینی ئەوە دەکات لە ئایندەدا چەند شەڕێکی هەرێمی لە ناوچەکەدا هەڵدەگیرسێن و هەر یەك لە تورك و عەرەب و فارس دەیەوێ لەسەر حسێبی ئەویتر دەسەڵاتی عەسکەریی و سیاسیی خۆی لە ناوچەکەدا فراوانتر بکات، لە دیدی لویس–ەوە رۆحی فراوانخوازی ئێران دەوڵەتی ئێران دووچاری چەند شەڕێکی هەرێمی و مەزهەبی و قەومی دەکات، لویس دەڵێت دەست بەسەرداگرتنی نەوتی باکووری عێراق لە لایەن تورکیاوە یەکێك لەو بەڵێنانە بووە هاوپەیمانەکان بە تورکیایانداوە بۆ ئەوەی لە دژی عێراق بەشداری شەڕی دووەمی کەنداو بکات، دیارە هەر لە کۆتایی بیستەکانەوە لە عەقڵییەتی عەسکەرتارییەتی کەمالیەکانەوە حسێبی بۆ کراوە بە جۆرێك دەمێك لە هەشتاکان لەشکری عێراق لە شکانێکی حەتمیدا بوو تورکیا هێزێکی تەواوی بۆ ئەو داگیرکردنە ئامادەکردبوو، بەڵام ئەگەر ئەمە لە ئایندەیەکی نزیك بێتە دی، ئەوا تورکیا لە دوولاوە –تورکی–عەرەبی، تورکی –ئێرانی– تووشی شەڕێکی حەتمی دەبێ، چونکە هەر یەك لە

ئێران و سوریاش بەشێك لە خاكی كوردستانیان داگیركردووە. دەمێك (باكوری عێراق)، كوردستانی خواروو بدرێ بە توركیا، ئەوا توركیا دەسەڵاتێكی عەسكەری و ئابووری بەهێزی دەبێ و دەبێتە مەترسیەكی گەورە بۆ سەر سوریا و ئێران.

لەم چەند لاپەرەیەدا دەفامرێتەوە كە بەرایی بە عەلمانیەتكردنی دۆزی كورد، وەرچەرخانێكی سەلبی بووە لە گۆڕانی هەمە رەوتی ململانێی دەسەڵاتی كورد لەگەڵ دەسەڵاتی داگیركاران وە هەم ئامانجی ستراتیژی بزووتنەوەی ئازادیخوازی كورد، لە لایەكی تریش مێژووی ئەو سەدەیەی خەباتی دەسەڵاتی كورد و دەست تێوەردانی سەرانی دەوڵەتی كۆمۆنیست و دیموكراتی، بێجگە لەپاشاگەردانی و نسكۆو هەرەس هیچی تریان بۆ كورد وەك نەتەوەیەك نەكردووە.

**+ ماوەیەك بە شەپۆل روو لە فیكری چەپگەرایی‌و ماركسییەت دەكرا، پاشا وردە وردە بیرۆكەی دیموكراسییەت سەریهەڵدا، پێتوایە دیموكراسییەت بۆ كورد ببێتە بەدیلی كەموكوڕییەكانی ماركسەیەت، هەروەكو بینیمان ئەو فیكرەیە هیچ خێرێكی بۆ كورد نەدایەوە لە رابردوودا ؟**

سەلام ناوخۆش: پاشهاتی هەر جەنگێك زێتر ماهیەتی ئایدیۆلۆژیا و ئامانجە ستراتیژیەكانی زلهێزەكان دەردەخات. جەنگی یەكەمی جیهان تەواو ماهیەتی ئیمپریالیزم و پلانە گڵاوەكانی لە جیهان بە گشتی و رۆژهەڵاتی ئیسلامیی بە تایبەتی دەرخست. هەرچی جەنگی دووەمیش بوو، تەواو ماهیەتی ماركسییەت و دیموكراتیەتی دەرخست و سیناریۆی ململانێی ئیشتراكیەتی سۆڤییەت و دیموكراتیەتی ئەمریكای ئاشكرا كرد.

ئەو دوو زلهێزە، شیوعییەت و دیموكراتیەت لە رێگای دەزگا دیماگۆژییەكانیان هەر یەكەی خۆی بە ئەلتەرناتیفی ئیجابی رزگاری گەلان لە چەوساندنەوەی نەتەوەیی و چینایەتی دەناساند. لە دیدی شیوعییەت، دیموكراتیەت، بیروڕای سەربەخۆ، مافی تاك، پەرلەمانی میللی هەمووی پڕوپاگەندە و فیشاڵی دەزگای سەرمایەداری بوون. لە دیدی دیموكراسییەتیش، شیوعییەت، دیكتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و سۆشیالیزم هەر هەمووی سەراب وگومڕابوون و جیهانی ناماقوڵ

بوون. ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژیایە تا ئەو دەمە بەرهەمهێن بوو كە لە بەرەی دژ بە یەك بوون، بەلاّم دەمێك بەرەی نازیەت و فاشیەت هەڕەشەیان لە شیوعییەت و دیموكراتیەت كرد، هەر یەكە لە شیوعییەت و دیموكراسییەت هاوپەیمانیەتی دژەكانیان پێكهێنا. دەمێك بەرەی دژەكان سەركەوتن، جارێكی تر ململانێی شیوعییەت و دیموكراتیەت تەقیەوە، نیو سەدە هەموو خەباتی مرۆڤ بە قوربانی شەڕی ساردی بێمانای شیوعییەت و دیموكراسییەت كرا، لەو ململانێیەدا شیوعییەت بەزی، بەلاّم وە نەبێ دیموكراسییەت هەرەسی بە شیوعییەت هێنابێ ئەویش بەدیل بێ هەروەك ئەمریكاییەكان بانگەشەی دەكەن. نەخێر، سێ بەشی فاكتەرەكانی هەرەسی شیوعییەت هەر خودی شیوعییەت بوو كە بە هیچ جۆرێك هەروەكو دەركەوت بە زەبری چەك و تۆقاندنیش لەگەلّ فیكر و دید و سایكۆلۆژیەتی مرۆڤ ناسازێ. بەلاّم بە هەر جۆرێك بێ سەرانی دیموكراسییەت بە نیازی داگیركردنی عەسكەری و سیاسیی و ئابووری دەولّەتە شیوعیەكانیش مەسەلەی هەرەسی شیوعییەت زێتر بە قازانجی خۆیان تەفسیر دەكەن بەوەش رەواجی زێتر بۆ دیموكراسییەتی خۆیان پەیدا دەكەن، زمانی هەڕەشەشیان بەسەر ناوچە ستراتیژییەكانی دنیا توندتر دەبێ. هەر لەو بارەیەوە جۆرج بوشی باوك سەرۆكی پێشووتری ئەمریكا لە هەڕەشەی نامەیەكدا بۆ دەولّەتانی (نادیموكراتی) لە دیدی ئەمریكا وتی: لەمەودوا لە هەر شوێنێك دیموكراسییەت لە خەتەردا بێ، دەبێ بە زەبری چەك شكۆی دیموكراسییەت بگەڕێنینەوە و داكۆكی لە دیموكراتیەت بكەین.

لە جەنگی دووەمی كەنداویش، كە ئەمریكا وەك تاكە زلهێزێكی جیهانی لە ژێر ئالاّی سیستمی جیهانی نوێ و گەڕانەوەی شیوعییەت و داكۆكیكردن لە دیموكراسییەت ناوچەی كەنداوی بە شێوەیەكی "شەرعی" داگیركرد.

ئێستاش پاش چەند سالێك لە حوكمی دیموكراسییەتی سیستمی نوێی جیهانی، كاتی ئەوە هاتووە پێش بینی مەرگی ئەو نیزامە چەواشەكارەش بكەین. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەو راستییە بكەین، كە راستە ئەمریكا تاكە زلهێزی عەسكەری جیهانە بەلاّم ئەورووپای رۆژئاواش لە ژێرەوە لە خۆئامادەكردن دایە بۆ

ئەوەی هەر هیچ نەبێ وەك سۆڤییەتی پێشوو جارێ شەڕێکی سارد بدا لەگەڵ ئەمریکا. لە نێو ئەو ململانێ لاوازەدا، هەرەسی دیموکراسییەتیش سەرەتاتکێ دەکا، بە واتایەکی تر بۆ ئەوەی تەواو دەرك بە ماهیەتی دیموکراسییەت بکەین، دەبێ پێشتر تەواو دیراسەی بەرژەوەندییە عەسکەری و سیاسیی و ئابوورییەکانی هەردوولا لە ناوچە ستراتیژیەکانی جیهان بکەین. هەر بۆ نموونە لە دیدی فەرەنسا دیموکراسییەت ئەوەیە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا لە جەزائیر و تونس و مەغریب پارێزراو بن. ئەگەرنا خۆ ئیسلامییەکانی جەزائیر لە روانگەی دایەلۆگی عەقڵ بە عەقڵ، فیکر بە فیکر روو بە رووی دیموکراسییەت بوونەوە، چۆکیان بە دیموکراسییەتی فەرەنسا دادا. بەڵام ئاکام چیبوو؟! حکومەتی عەسکەرتاریەتی جەزائیر دامەزرا بە تەواوی دیموکراسییەت لە گۆڕ نرا، بێ ئەوەی ئەمریکاش هیچ هەڵوێستێ وەربگرێ؟! لە لایەکی تر چیچانیەکان و بۆسنییەکانیش بە تەواوی ویستی خۆیان بۆ خۆیان و پەرلەمان و حکومەتیان دامەزراند. هەڵوێستی دیموکراسییەتی ئەورووپای رۆژئاوا و ئەمریکا چی بوو؟! بە کورتی هەر لەبەر ئەوەی ئەزموونی جەزائیر و چیچان و بۆسنا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و ئەورووپای رۆژئاوا یەکی نەدەگرتەوە، هەر بۆیە هەر خۆیان ماهیەتی دیموکراسییەتیان دەرخست؟!

بە واتای لە یۆتۆپیای دیموکراسییەت، رای ئازاد و بیری سەربەخۆ و مافی مرۆڤێتی هەر بۆ ئەو کەسانەیە کە کڕنوش بۆ دیموکراسییەت دەبەن، ئەمەش تەقلیدێکی دەقاودەقی یۆتۆپیای شیوعییەتە؟! گەر وا نەبێ، ئەی مسوڵمانەکانی جەزائیر و چیچان و بۆسنا بە چەمکی عەقڵ بە عەقڵ، فیکر بە فیکر، لە دەرگای دیموکراسییەتیان نەدا، وەڵامی دیموکراسییەتیش تیرۆر و جینۆساید نەبوو؟! جا ئەگەر ئەمە تێگەیشتنی سەرانی ئەسڵی دیموکراسییەت بێ ئەوا سەرانی دیموکراسییەتی (مزەوەر)ی رۆژهەڵات هەزاران پاساو بۆ (شیوعییەتی) دیموکراسییەتی خۆیان دەهێننەوە. هەر لەو روانگەوە پەتای (دیموکراسییەتی بەرژەوەندی) ئەمریکا و ئەورووپای رۆژئاوا ئەوە بۆ چەند ساڵێك دەچێ سەرانی (دیموکرات) و (سۆشیال دیموکراتی) کوردستانیان تووشی شەڕێکی خوێناوی کرد.

لە رێگای رەفتار و گوفتارە "دیموکراسیەکانی" هەردوو هێزەکە، رۆژانە خەڵکی کوردستان رۆژە رەشەکانی تەرحیل و تەبعیسی رژێمی "نادیموکراسی" و سۆسیالیستی عێراقیان لێ زیندوو دەبووەوە! ئەمە و دیموکراسییەت بۆتە (بەرژەوەندییەکی هێندە بە سوود) بە جۆرێك ئەو ئوستادە مارکسیانەی دوێنێ کە بە چەکوش و داس روو بە رووی (دیموکراسییەتی گەندەڵی بۆرژوا) دەبوونەوە، ئەمرۆ دیموکراسییەت بە (قۆناغێکی) گرنگی بەرەو "سۆشیالیزم" دادەنێن! ئەو بازاڕ گەرمییەی دیموکراسییەت گۆڕانێکی رادیکاڵیشی لە دید و بۆچوونی مارکسییەت دروستکردووە، بە جۆرێك ئێستا وا هەندێ کۆنە مارکسی بە موتربەکردنی مارکسییەت بە "دیموکراسییەتی بەرژەوەندی" مارکسییەتەکەی کارل مارکس لە بن و بۆتکەوە هەڵدەتەکێنن و ناوی دەنێن "مارکسییەتی نوێ". ئەمە و وە نەبێ مارکسیەکانی دوێنێ دیموکراستەکانی ئەمرۆ تەواو دەرك بەوە نەکەن کە دیموکراسییەتیش هەر جمکی "شیوعییەتە" کۆنەکەی خۆیانە و هەر ئەو یۆتۆپیا–سەرابەیە کە تەمەنی چەواشەکاری لە تەمەنی شیوعییەتەکەی خۆیان تێپەڕ نابێ، بەڵام هەروەك چۆن شیوعییەت تووشی جمودی عەقائیدی کردبوون، دیموکراسییەتیش یۆتۆپیایەکی بۆ دروستکردوون، بۆیە بە هیچ جۆرێك دەستبەرداری ئەو فیکرە مردووانە نابن. لەولاوەش، هەندێ حیزبۆکە و کەسانی دۆڕاو و بەکرێگیراو وەك بڵێت بە کردەوە دژە بەشەرتەکانی باڵی دیموکرات و سۆشیال–دیموکرات دڵیان ئاوی نەخواردبێتەوە ئەوا لە روانگەی قەولی: (ئێمەش بەشی خۆمان لە پرۆسەی تێکدانی بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردەواری دەوێ، کەواتە ئێمەش هەین!) خەریکە ئەوەی بە رژێمە ڕووخاوەکە و هەردوو هێزی شەڕکەر نەکرا، ئەوان بیکەن. ئەو بە ئاشکرا ئەتککردنەی ئیسلام لە لایەن ئەو حیزبۆکانە تەنیا بۆ پەیڕەو کردنی ئەو مەقولەی سەرەوەیە، بە حوکمی ئەوەی ئەوە چەندین ساڵە دەچێ چەکوش و داسەکەیان هەر زێتر ژەنگ دەیگرێ و فیکرەکەشیان لە روخاندایە، هەر بۆیە لە دیدی ئەوان، ئەوان هیچیان نییە لە دەستی بدەن، ئەوەشی هیچی پێنەبێ هیچ ون ناکات !. ئەمە و ئەو دیموکراتخوازانەی کورد، نەك هەر رێ بە دژە–باوەڕی خۆیان نادەن، بەڵکو هەر

بەخۆشیان دژی دیموكراسییەت دەوەستن. حكومەتە دیموكراتییەكەی هەرێمیش، دوو حكومەتی دیموكراتی لێ بۆوە كە بڕیارەكانیان زۆر لە بڕیارەكانی حكومەتی مەركەزی هەولێر بە بڕتر و قەدرتربوو. ئەمە و لە حكومەتی دیموكراتییدا، دەبوو هەموو كێشە نێوخۆییەكانی كوردستان لە پەرلەمان چارەسەر بكرابا یان هەر هیچ نەبێ لە رێگای كۆنگرەیەكی نەتەوەیی یان میللییەی ئەوە بكرابا، بەڵام لەبەر ئەوەی دیموكراسییەتی هەرێم بەشێكە لە دیموكراسییەتی گێتی، هەر بۆیە هەر یەكە بە گوێرەی بەرژەوەندی حێزبەكەی دەیەوێ چارەنووسی گەلی كورد بەو داگیركارە ببەخشی كە لەگەڵ حیزبەكەی ئەو رێككەوتن و بەرژەوەندی هاوبەشی هەیە! ئەمە ماهیەتی ماركسییەت و دیموكراسییەتی حیزبەكانی كوردستانە، شەڕ لە پێناوی سەپاندنی ماركسییەت و هاتنەكایەی نیزامی دیموكراسی دەكەن!. لە كۆتایی ئەم هەموو ململانێیەدا گۆڕینەوەی دیكتاتۆر بە دیكتاتۆر بوو، هەر گەلی كوردیش لەو نێوە رەنج بە خەسار دەرچوو، چونكە وێڕای ئەم هەموو ماڵوێرانیەش، دیموكراسییەتی بەرژەوەندی دەیەوێ موسڵمانەكانیش، هەر وەك چۆن ماركسییەكان چەند گۆڕانێكی بنەڕەتیان لە ماركسییەت كرد بۆ ئەوەی لەگەڵ دیموكراسییەت بسازێ، ئەو یاسایانەی ئیسلام بكوژن كە لەگەڵ دیموكراسییەت ناسازێ و لەمەش زیاتر ئیسلام وەك مەسیحییەت لە پەل و پۆ بخرێ و دەسەڵاتی هەر لە سنووری مزگەوت بێ! كلیلی كردنەوە و داخرانی دەرگەی مزگەوتیش لە باخەڵی ئەواندا بێت!!

هەر وەك چۆن سەرانی دیموكراسییەت دید و بۆ چوونی خۆیان هەیە لەمەڕ ئیسلام، ئەوا ئیسلامییش دید و بۆ چوونی خۆی هەیە لە هەمبەر هەر یەكەیان، لە روانگەی ئیسلامەوە، هەر یەك لە دیموكراسییەتی سەرمایەداری و سۆشیالیستی ماركسییەكان زادەی واقیعی كۆمەڵگای ئیسلامیی نین و بەڵكو هەردوكیان لە مندالّدانێك– كولتوری رۆژئاوای نادینی– لە دایكبوونە، جا ئەو دوو سیستمە، گەر هێزێكی رووخێنەر وەك فاشیەت و نازیەت یان هێزێكی رووخێنەری هەر چوار لا و بەدیلی هەموو سیستمێك –ئیسلام– هەڕەشەیان لێ بكا، ئەوا بێگوێدانە جیاوازییەكانیان، لەبەرەیەك كۆ دەبنەوە، ئەو دیاردەیەش زۆر بە زەقی هەر

لەسەرەتای ململانێیەکەوە تاکو ئەمڕۆ خاسیەتێکی ئەو نیزامانەیە، ئەمە و لەلایەکی تر هەر یەك لە دیموکراسییەت و مارکسییەتیش دوو جەمسەری دژ بە یەکن، مارکسییەکانی بەرایی بە ناوی بە سۆشیالیزم کردنی سیستم و بەرهەمهێنان و کۆمەڵگا.. هتد. لە هیچ زوڵمێکی دینی و قەومی و ئینسانی نەگەڕانەوە، لە روانگەی (لۆژیکی هێزەوە) هەرچییان لە دەست هات کردیان دەرهەق بەوانەی بانگەشەی بە دیموکراتیزەکردنی سیستم و کۆمەڵگایان دەکرد، کەسانی وەك بەرنەشیین، زیجمۆنی بۆمان، ئۆسکار لانج، کۆلاکوفسکی، ئادەم شاف، هنری لۆفیفر، کوسیاس ئاکسیلۆس، بیر فۆر جیرۆلاس، فرانسۆ شاتلیە، رۆجیە گارۆدی، جان دیڤینیۆ.. تەنها کۆمەڵێکن لەو کەسانەی کە ویستیان لە نووسینەکانیان رادەیەك بۆ ئەو رەشەکوژییە رۆحییە جەسەدییەی مارکسییەت دابنێن. ئەمە و لە جیهانی مارکسییەت، دیموکراسییەت تایبەتمەندییەکی سەرمایەدارییە، هیچ کەسێکیش بۆی نییە ئەو هێڵە سوورە ببەزێنێ، بەواتای هەڵوێست وەرگرتن لە دیموکراسییەت، دەستوورە و لادان لێی سزای تێهەڵدان و راگوازین و مەرگە، هەر لەو روانگەوە نووسەرانی جیهانی مارکسییەت لە سێ گەمارۆی کۆنکرتییدا بەند کرابوون:

**یەکەم:** گەمارۆی زمانەوانی: زمان لە ژیانی رۆژانەی حیزبی کۆمۆنیستیدا ئامرازێکی گەلێك ترسناك و ورد و گرنگە پێویستە وشەکان بە پێی رێنموونی دەستەواژە و زاراوە پەسندکراوەکان بەکار بهێنرێن ئەو وشانەی سەرکردە مەزنەکانی وەك مارکس، لینین، ستالین، بریجنیف، ئەنوەرۆڤ، ماوتسی تونگ یان سەرکردەی نوێی دەوڵەت بە کاری دەهێنێت دەبێت هەموو ئەدیب و نووسەرێك بەکاری بهێنێ. لەو روانگەیەوە ئەو داخراوییەی فیکری مارکسی گرتۆتەوە، زمانی دەربڕینیشی کلیل داوە. ئەگەر بەرهەمی ئەدیبانی پێش کۆدێتای ئۆکتۆبەر و پاش کۆدیتاکە بەراوورد بکەین بۆمان بەدەر دەکەوێت کە ئەو ئەدەبەی کۆکۆڵ و تۆلستۆی و دستۆفسکی دەیاننووسی هەر بۆ بەراوورد ناشێت لەگەڵ ئەو ئەدەبە پڕوپاگەندەییەی پاش کۆدیتاکە، کە خاڵییە لە گیانی داهێنان و جوانکاریدا.

**دووەم:** گەمارۆی فیكری: بە حوكمی ئەوەی ماركسییەت دەرگای لەسەر هەموو ئایدۆلۆژیایەك و دینێك داخستووە، دەبینین لە دەوڵەتە كۆمۆنیستەكان نووسەر و فەیلەسوف و ئەدیبان بۆیان نەبوو هیچ بەرخوردێكی رۆشنبیری و فیكرییان هەبێت لەگەڵ فیكر و رۆشنبیری وڵاتانی دەرەوەی جیهانی كۆمۆنیستی. بۆ نموونە فادییێڤ كە چواردە ساڵان دكتاتۆری نووسین و ئەدەبی سۆڤییەتی بوو گوایە سكرتێر و سەرۆكی یەكێتیی نووسەران بوو– دەربارەی نووسەرە رۆژئاواییەكان دەڵێت: "ئەگەر كەمتیارێك بیتوانیبایە لەسەر چاپخانەیەك كار بكا یان رێوییەك توانای بەكارهێنانی قەڵەمی هەبووایە دەیانتوانی ئەو شتانە بنووسن كە ئۆنێل و سارتەر و ئەندرێ مارلۆ و ی. س. ئیلیۆی و دۆسی باسۆس دەیاننووسی! !

**سێیەم:** گەمارۆی سەفەر كردن: ئەم ئابلۆقەیەش ئەگەر لەوانیتر سەخت تر نەبووبێت كەمتر نەبووە، بە درێژایی فەرمانڕەوایی كۆمۆنیستی هەتا هەرەسی شیوعییەت ئەدیبان بۆیان نەبوو سەفەری دەرەوەی وڵاتانی كۆمۆنیستی بكەن. هەر لەو بارەیەوە شاعیرێكی وەك ئەفكین ئەفنۆشنكۆ رەخنە لەو سنوورە داخراوانە دەگرێ و حەز دەكا بۆێنس ئایرنس ببینێ و لە شەقامەكانی نیۆیۆرك بسورێتەوە و لە لەندەن خەڵك ببینێ..

بیری مردوو كۆمەڵێكی مردووی دەوێ، سیستمێكی ناكامڵ و نادادگەریش، كۆمەڵ بەرە و كۆیلەیی و سەر لێشێوان دەبا. جا بۆ ئەوەی راستەڕێ بگرێتەوە، دەبێ بەر لە هەموو شتێ ماهییەتی ئەو بیرۆچكە و نیزام و مەنهەجانەی بۆ ئاشكرا بكرێ كە كۆمەڵیان بەو قەیرانە فیكری و سیاسیی و كۆمەڵایەتی و ئابوورییە بردووە. ماركسییەكان لەو جۆرانەن كە بە هیچ كلۆجێك لێناگەڕێن كۆمەڵ بیرو بۆچوونی دینی و فەلسەفی و بیرۆچكەی غەیرە ماركسی وەربگرێ. ئەوەی حەفتا ساڵ لە ئیمپڕاتۆریەتی كۆمۆنیستی لە سۆڤییەت و ئەورووپای رۆژهەڵات و بەشێكی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رووی دەدا تەواو ئەو راستییە دەسەلمێنن. هەر بۆ نموونە پاش ئەوەی گۆرباتشۆڤ لە ساڵی ١٩٩٠ز یاسای "ئازادی ویژدان"ی دەركرد ئاسیای نێوەند رابوونێكی ئیسلامیی بەهێزی بە خۆیەوە بینی بە جۆرێك ئەو

شوێنە ئیسلامییانە كە ماوەی (١٥٠) ساڵە قەیسەرییەكان و كۆمۆنیستەكان بە زەبر و زەنگ ئیسلامییان لێ قەدەغە كردبوون، پاش هەرەسی شیوعییەت لەو شوێنە ستراتیژیانە رۆژانە دەیان مزگەوت نوێ دەكرێنەوە. ئەمە و گەلانی وەك ئۆزبەك و تاجیك خەریكە زمانی سرلیكی تووڕ هەڵدەدەن و زمانی فارسی و توركی فێر دەبن. چیچانییەكانیش لە پێشەنگی ئەو گەلانە بوون كە رەفزی شیوعییەت و دیموكراسییەتی رۆژئاوایان كرد و ئیسلامیان هەڵبژارد، وەڵامی ماركسییەت و دیموكراسییەتیش بۆ وشیار بوونەوەی كۆمەڵی چیچان و ئۆزبەگی و تاجیكی وقیرقیزی و توركمانی چی بوو؟! ئەمە و پاش چەندان ساڵ لە دژایەتییكردنی ئیسلام لە جەزائیر و توركیا. گەلانی جەزائیر و توركیا چۆكیان بە دیموكراسییەتی رۆژئاوا دادا، زۆربەی كۆمەڵانی جەزائیر و توركیا ئیسلامیان هەڵبژارد. لە بۆسناش موسڵمانەكان ماهییەتی شیوعییەكانی دوێنێ و دیموكراسییەتیەكانی ئەمڕۆیان بە جیهان ناساند. لێرە دەپرسین ئایا ئێمەی ئیسلامیی داهاتووی خۆمان لە وشیار بوونەوەی كۆمەڵ نابینین؟! ئایا "یعقلون" و "یتفكرون" و "یتذكرون"ی خوا بۆ كۆمەڵ ئەنجامی خۆی نەپێكا و دەپێكێ لە هەموو جیهانی ئیسلامییدا؟!

لە دیدی ماركسییەكان دیموكراسییەت تایبەتمەندییەكی قۆناغی سەرمایەدارییە بە نەمانی ئەو قۆناغەش دیموكراسییەتیش لە بەین دەچێ، چونكە سیستم و كۆمەڵ بەرە و سۆشیالیزم دەچێ بە واتای بە سۆشیالیزم كردنی سیستمی دەوڵەت و كۆمەڵ دیموكراسییەت چوارچێوەیەكی تر وەردەگرێ و لە نێو سۆشیالیزم دەتاوێتەوە بەڵام ئەمڕۆكە، بەهۆی ئەوەی شیوعییەت هەرەسی هێناوەو لەو لاوەش دیموكراسییەت لە غیابی ماركسییەت بازاڕی بە هەڕمێن بووە، ماركسییە نوێیەكانی كوردستان دیموكراسییەت بە قۆناغێك بەرەو سۆشیالیزم دادەنێن و هەرەسی شیوعییەتیش بە دوور بوونەوە لە دیموكراسییەت شی دەكەنەوەو لەو بارەیەوە چەندان ماركسی و غەیرە ماركسی نووسینیان نووسیوە و لە كوردستانیش چەند ماركسیەكی كۆن هەر هەمان شتیان كاوێژ كردەوە بۆ ئەوەی خۆیان لەو هەرەسە حەتمییە بشارنەوە، لە دیدی ئێمەش هیچ قۆناغێكی كۆمەڵایەتی سەدا سەد نییە، بەڵكو مەسەلەی قۆناغ ئاڵۆزە و بە هەرمێن كردنی

مەسەلەی "قۆناغەکۆمەڵایەتییەکان"یش تەنها مەسەلەیەکی سیاسیی لە پاڵ بووە. لەو روانگەوە کە مارکسییە کۆنەکان دیموکراسییەت بە تایبەتمەندی سەرمایەداری بزانن و مارکسییە نوێیەکانیش بە ئازادی ئابووری و ئازادی سیاسیی و تەنانەت "قۆناغێك" بزانن ئەوا گوناهی ئێمە نییە، بەڵکو تەنها بازدانێکی داروینی رووتە لە رەوتی مارکسییەتدا! !

لە نەزەری مرۆڤی هۆشمەند هەموو جۆرە دیکتاتۆرییەکی ئادەمی هەر دیکتاتۆریەتە و بەربەستە لەبەردەم باوەڕ و ئازادی و ویستی مرۆڤدا. لە نەزەری مارکسیەکان مەسەلەی هەڵبژاردن و پەرلەمان پڕوپاگەندەی سەرمایەدارە چاو چنۆکەکانە، چونکە لە رێگای ئەو هەڵبژاردنەوە چەند کەسانێکی بازرگان و قسەلووس بە زەبری پارەو پڕوپاگەندەی ئەفسوناوی، خۆیان دەکەن بە دەمڕاستی کۆمەڵ، لەو نێوەش هەرچی رەنجی کرێکار و زەحمەتکێشان هەیە هەر بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتی ئەو کاسە لێسانە بەکار دێ، هەر بۆیە بە نەزەری مارکسییەکان: "دیموکراسییەت لە کامڵترین شێوەیدا هێشتا ناتوانێت بە تەواوی ئازادبوونی ئینسان دابین بکات"، لەو پێودانگەوە "دیکتاتۆریەتی بۆرژوا" کە لە رێگای هەڵبژاردن لە وڵاتە سەرمایەدارەکانەوە دروست دەبێ، هەر بۆ چەوساندنەوە و بەخەسارەتبردنی رەنجی کرێکار و زەحمەتکێشان دروست بووە.

هەروەها لە نەزەری مارکسییەکان "دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا" جگە لە ئیرادەی زۆربە هیچی دیکە نییە! ئەمەش خۆی لە خۆیدا دیموکراسی راستەقینەیە، دەسەڵاتی زۆربەی کۆمەڵە کە لە رێگای ئیرادەی جەماوەری رێکخراو لە ناو شوراکان حوکم بەڕێوە دەبەن، دەپرسین ئەو (زۆربەیە) چۆن دروستدەبێ ئایا لە رێگای هەڵبژاردنەوە؟! بێگومان نەخێر: ئەو (زۆربە یە) لەلایەن حیزبی دەسەڵاتدارەوە دادەنرێ، قسەی حزبیش دەستوورە دەبێ پەیڕەو بکرێ ئەو (زۆریە)ی حزب دەیکاتە "دیکتاتۆر" بەسەر "کەمینەکە" هەر هەمان دووبارە کردنەوەی پرۆسەکەی سەرمایەدارەکانە، چونکە سەرمایەداران لە وڵاتە سەرمایەدارەکان دەبنە "دیکتاتۆر" و کرێکارە شیوعییەکانیش بە هەمان شێوە لە وڵاتە شیوعییەکان حوکم بەڕێوە دەبەن. هەردوو بەرەی "دیکتاتۆر"یش

جۆرێك لە ئازادی سێکسی رەواج پێ دەدەن، هەموو ئازادی مرۆڤیش لە ئازادی سێکسی لە شیوعییەت و ئازادی سێکسی و ئابووری لە سەرمایەداری تەماشا دەکەن، بەڵام هەرچی ئازادی فیکری و دینییە، بە تایبەتی دینێکی وەك ئیسلام کە داوای حاکمیەت دەکات، ئەوا هیچ کام لە "دیکتاتۆرەکان" بە ئازادی مرۆڤی نازانن، چونکە هەر کاتێك ئیسلام فەرمانڕەوا بێ هەردوو دیکتاتۆریەتی بۆرژوا و پرۆلیتاری دامەزرا و لەسەر بنچینەی حزبایەتی و بەرژەوەندی دەڕووخێن! !

## جیهانبینی مارکسییەت:

مارکسییەکان، ئیسلام وەك دینێك، بە تلیاك دەزانن، تاکو موسوڵمانەکان دەستبەرداری نەبن رزگار نابن. ئەمەو دیموکراسییەتیش بۆ ئایندەی مرۆڤ بە جیهانێکی داواکرا و نابینن، چونکە "دیموکراسییەت لە کاملترین شێوەیدا هێشتا ناتوانێت ئازادبوونی ئینسان دابین بکات"، جا بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ئازادی رەها بگا، لە نەزەری مارکسییەکان دەبێ مرۆڤ چ بکات؟! ئەوەی لە ماهیەتی مارکسییەت بگا بۆی دەردەکەوێ کە ئەو "فەلسەفەیە ئەفسانەیە" لەسەر بنەمای ململانێ دروستبووە، بە نەزەری ئەنگلز، ئەو ململانێیە لە نێو خودی خێزانیشدا هەیە بە جۆرێك پیاو بە چەوسێنەر و ژن بە چەوساوە ناو دەبات، جا بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازادییەکی بێ قەید و شەرتی هەبێ دەبێ خۆی لە هەموو قیودێك دابڕێ، بە واتای دەبێ مرۆڤ هەم لە خەباتێکی سەختدابێ لە دژی خێزان– وەك سیستمێکی کۆمەڵایەتی بچووك– هەروەها لە خەباتێکی سەختیشدابێ لە دژی خودی مرۆڤ و باوەڕە دینییەکانی مرۆڤ، لە لایەکی تریش مارکسییەکان لە سەختترین خەباتدان بۆ گۆڕینی حکومەتی دیکتاتۆریەتی بۆرژوا بۆ حکومەتێکی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا، بەڵام دەپرسین ئاخۆ "حکومەتی کرێکار" ئازادی بێ قەید و شەرتی مرۆڤ دابین دەکات؟ لە وەڵامدا هەر خۆیان دەڵێن: "هەر چەندە ئێمە ئەمڕۆ سەخت بین لە خەباتدا دژ بە حکومەتی بۆرژوازی، لە سبەی رۆژیشدا بە هەمان شێوە سەر سەختانە خەبات دەکەین بۆ گۆڕینی حکومەتی کرێکاری (کە حکومەتی سۆشیالیستییە) بۆ کۆمەڵێك کە حکومەت و دەسەڵاتی تێدا نەمێنێ، واتە

حکومەتەکە یەکێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەی خۆی"، ئەو بۆچوونە "فەلسەفییە" گەر لە سەدەکانی بەر لە زایین لە ئەفسانەکان بۆ مرۆڤە سادەکان باسبکرابا یان لە باسی ئەفسانەکان هاتبا، لەوانە بوو مرۆڤە کۆنەکان باوەڕیان بەو فەلسەفە ئەفسانەییە بهێنایە، بەڵام پێمان سەیر نەبێ، گەر ئەو بۆ چوونە ئەفسانەییە بۆ ئایندەی مرۆڤ لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا وەك مەنهەجێکی فەلسەفی لە کوردستان پێشکەش بە گەلی کوردستان دەکرێ؟!

هەر هێندە دەڵێین: کامەیان تلیاکن، ئیسلام کە مرۆڤی ئازاد کردووەو رێی پێداوە لەوەی هەڵی دەبژێرێ یان مارکسییەت کە دەیەوێ مرۆڤ هەر بە "بەنجی مارکسیزم" لە نێو ئەفسانە و فانتازیا و یۆتۆپیا خەون بە جیهانی بێ سیستم و حوکمەوە ببینێ؟!

لێرەوە هەرەسی شیوعییەت خودی شیوعییەیت بوو، ئەوەی هەرەسیشی پێ هێنا دژەکەی نەبوو، بەڵکو خودی ئەفسانەی مارکسیزم بوو، دیموکراسییەتیش نابێتە بەدیل بۆ گەلانی موسڵمانی بە زۆر بەمارکسی کراو، لە دیدی ئێمە دیموکراسییەتیش هەر بە هەمان چارەنووسی مارکسییەت دەگات، لەوانەیە هەندێك وا زەن ببەن کە ئێمە یاسینی مەرگ بۆ دیموکراسییەت دەخوێنین مەبەستمان سەرجەم جیهانی سەرمایەداری نەبێ، لەو کەسانە دەپرسین گەر جیهانی سەرمایەداری "دیموکراسییەتی" نەمێنێ خەڵکی پێ چەواشە بکا، خۆی لەسەر چ رادەگرێ؟!

ئەمە و ئەوەی ئیمپریالیزمی سەرمایەداری بەسەر گەلان دەیسەپێنێ هەر لە رێگای دیموکراسییەتەوە نییە؟! جا چۆن شیوعییەکان سۆشیالیزمەکەیان رووخاو بە خۆشیان رووخان و هەر دەسەڵاتیشیان نەما هەر بە هەمان شێوە بە رووخانی دیموکراسییەتیش، ئیمپریالیزمی سەرمایەداریش ئەو دەسەڵاتەی نامێنێ گەلانی پێ چاوترسێن بکا.

پاش ئەو هەموو رووخانانە سەرجەم ئەو وڵاتە ئیسلامییانەی بە زۆر بە مارکسی و دیموکراسی کراون گەلانیان دەگەڕێنەوە بۆ راستەرێ و ئیسلام بە ئەلتەرناتیف دادەنێن، چونکە ئەو گەلانە تەواو دەرکیان بە ماهیەتی ئیسلام و ئەو

ڕێبازانه‌ كردووه‌، چاك ده‌زانن كه‌ وێڕای ئه‌وه‌ی ئیسلام دینێكی ڕاست و دروسته‌ ته‌واوی ئازادییه‌ شه‌رعییه‌كانی مرۆڤ دابین ده‌كات و ته‌واو ڕێز له‌ خودی مرۆڤ ده‌گرێ، هه‌روه‌ها هه‌رچی ڕێبازه‌كانی ترن هه‌ر یه‌كه‌ی به‌ جۆرێك مرۆڤ ده‌چه‌وسێنێته‌وه‌. له‌ لایه‌ك، هه‌ندێك مرۆڤ به‌ كۆیله‌ ده‌كه‌ن و هه‌ندێكی تر ته‌واو مرۆڤ له‌ مرۆڤێتی ده‌خه‌ن و به‌ره‌ و جیهانی گیانه‌وه‌ری په‌لكێشی ده‌كه‌ن.

ئیسلام دینێكه‌ به‌ هیچ جۆرێ مساوه‌مه‌ قه‌بوولناكا و هه‌ڵوێستێكی نه‌گۆڕی هه‌یه‌ له‌به‌رده‌م هه‌ر ڕێبازێكی غه‌یره‌ ئیسلامیی، كه‌چی هه‌رچی ماركسییه‌ته‌ ئه‌وه‌ له‌سه‌ر بنه‌مای دووفاقی دامه‌زراوه‌. له‌لایه‌ك، به‌ناو له‌ خه‌باتێكی سه‌ختدان له‌ دژی ئیمپریالیزم، كه‌چی ده‌مێك ئیمپریالیزم و ماركسیزم كه‌وتنه‌ خه‌ته‌ر، هه‌ردووك بێگوێدانه‌ به‌ناو جیاوازییه‌كان، له‌به‌ره‌یه‌ك كۆبوونه‌وه‌، له‌وانه‌یه‌ هه‌ندێك بڵێن ئه‌و هاوپه‌یمانێتییه‌ی "ئیمپریالیزم و ماركسیزم" به‌ قازانجی گه‌لانی سۆڤییه‌تی و ئه‌مریكی و به‌ریتانی ته‌واو بوو! هه‌ر لێره‌وه‌ ده‌پرسین: ئایا ڕژێمێكی وه‌ك به‌عس به‌ قه‌ولی ئێستای ماركسییه‌ت فاشی نه‌بوو؟! یان هه‌ر هیچ نه‌بێ ڕه‌فتار فاشی نه‌بوو؟! له‌و پێودانگه‌وه‌ هاوپه‌یمانێتی ١٩٦٨-١٩٧٠ز ماركسیزم- به‌عسی فاشیزم "و هاوپه‌یمانێتی ١٩٧٢-١٩٧٨ز كۆمۆنیستی- فاشیزمی به‌عس" به‌ قازانجی گه‌لانی عێراق ته‌واو بوو؟!

له‌ دیدی ئێمه‌ پاشهاتی هه‌ر جه‌نگێكی جیهانی زێتر ماهیه‌تی ئایدۆلۆژیا و ئامانجه‌ ستراتیژیه‌كانی زلهێزه‌كان ده‌رده‌خات، له‌و ڕوانگه‌وه‌ تیشكێك ده‌خه‌ینه‌ سه‌ر پاشهاتی هه‌ر سێ جه‌نگی یه‌كه‌م و دووه‌می جیهانی و جه‌نگی دووه‌می كه‌نداو.

پاشهاتی جه‌نگی یه‌كه‌می جیهان  ده‌وڵه‌تی ئۆكتۆبه‌ر و دیكتاتۆریه‌تی پرۆلیتاریا بوو.

له‌و نووسینه‌ باس له‌ "سه‌روه‌رییه‌كانی" كۆمۆنیستی ناكه‌ین كه‌چی به‌سه‌ر گه‌لانی یه‌كێتیی سۆڤییه‌ت و گه‌لانی ئه‌وروپای ڕۆژهه‌ڵات هێنا، به‌ڵكو به‌ كورتی باسی ئه‌و "سه‌روه‌رییانه‌" ده‌كه‌ین كه‌ بۆ كوردی هێناوه‌، لینین كه‌ یه‌كه‌م سه‌رۆكی ده‌وڵه‌تی شیوعی بووه‌ ده‌ورێكی گرنگی گێڕا له‌ سه‌پاندنی داگیركردن و

دابەشکردنی کوردستان، لە سەردەمی لینین ۱۹۱۷-۱۹۲٤ز بە دروستی لە ئازاری ۱۹۱۸ز شیوعییەکان پەیمانی برێست-یستۆفیسك-یان لەگەڵ حکومەتی ئەستەمبوڵ بەست، بەپێی ئەو پەیمانە کۆتایی بە شەڕی هەردوو لا هات لە ئاکامدا سۆڤییەتییەکان پارچەیەکی کوردستانیان لە کوردستان دابڕی کە بریتییە لە ناوچەی ئاران، هەروەها هەر لەسەردەمی لینین بەردی بناغەی راگواستنی گەلان داندرا، هەروەك نیکۆلای بۆکای دەنووسێ: "لە ساڵی ۱۹۲۱زدا، لە سەردەمی کۆنگرەی دەیەمی (ح. ك. ر). (بەلشەفی) دەستەیەکی کۆمیتەی ناوەندی بە سەرکردایەتی لینین و ستالین بابەتی ئەرکەکانی پارتیان سەبارەت بە پرسی نەتەوەیی ئامادە کرد، پۆلۆنی، جوولەکە، یۆنانی، ئەڵمانی، بولگار، کورد، هێمشین و لاز-یان کە وەکو گروپی نەتەوەیی نیشتەجێ نەبوو سەیر دەکران کە زۆریان نە پەیکەرێکی چینایەتی دیاریکراویان هەیە، نەخاك دەرەنجامی رێگەو بواری فراوانی بۆ کردبوونەوە. ئەو گروپە نەتەوەییانە خاکی مێژوویيان نییە، کەواتە بە ئاسانی دەتوانرێت رابگوێزرێن" هەر لەو روانگەوە لینین بۆ ئەوەی زەبرێکی کوشندە لە خەباتی کوردان بدا و بوارێکی لە بار بۆ کەمالییەکان برەخسێنێ جڵەوی حوکم لە تورکیا بگرنە دەست لە لایەك چەك و تەقەمەنی و پارەیەکی زۆری بە کەمالییەکان بەخشی و لینین یەکەم کەسبوو دانی بەو حکومەتە شۆڤینییەی ئەتاتورك نا، لە لایەکی تریش کوردەکانی سۆڤییەتی لە سنوورەکان دوور خستەوە و لە ناوچەیەکی بەرتەنگی کوردستانی سووری ئۆتۆنۆمیداری بۆ دروست کردن.

دروستکردنی کوردستانی سوور تاکتیکێکی مەرحەلی بوو، هەر بۆ ئەوەش بوو، کوردەکان لە سنوورەکانی دی کوردستان دوور بخاتەوەو نەهێڵێ بکەونە ژێر کاریگەری بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان بەمەش خزمەتێکی زۆری بە کەمالیەتدا و هاوپەیمانیەتێکی دوو قۆڵی مۆسکۆ- ئەنقەرەی لێ بە ئاکام گەیشت، لە لایەکی تریش دامەزراندنی کوردستانی سوور تەواو لە هەوڵە ئیمپریالییەکەی ئەحمەد حەسەن بەکر دەچێ، کە لە ساڵی ۱۹۷٤ز بەشێکی بچووکی بە کوردستان ناسی، هەندێك شوێنی ستراتیژی لێ دابڕی، بەڵام لە پاشان هەروەك چۆن ستالین ئەو

حکومەتە ئۆتۆنۆمیدارەی رووخاند، سەددامیش هەر بە هەمان شێوە کەوتە ژێر تەعریب و تەرحیلکردنی کوردستان.

کێ دەڵێ صەددامیش تەواو سوودی لە بیرۆکەی راگواستنی گەلان و سیاسەتی بە سوتماککردنی زەوی لە لینین و ستالین وەرنەگرتبوو؟ لە پاشان ستالین بە هێزی سەربازی بەشداری دامرکاندنەوەی شۆڕشی ئاگری داغی کوردستانی باکووری کردووە، یاداشتەکەی ئیحسان نوری پاشا راستییەکی حاشا هەڵنەگرە.

زۆربەی ئەوانەی ئاگاداری مێژوون دەزانن کە ستالین حکومەتی مەهابادی بەو برە قازانجە فرۆشت کە بڕیار بوو لەو کۆمپانیا نەوتییە هاوبەشەی سۆڤییەت و ئێران بە دەستی بێ. پاشهاتی جەنگی دووەمی جیهانیش دروستکردنی چەند پارتێکی مارکسی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو، ئەو پارتانەش وا گۆش کرابوون بە مارکسییەت کە هەرچی لە قازانجی ئیمپریالیزم بێ لە زەرەری مارکسییەتە، لەو روانگەوە مارکسییەکانی عێراق بەکورد و عەرەبەوە راسپاردەکانی سۆڤییەتیان کردە دەستوور هەرچی لە راژەی سۆڤییەتدابا جێبەجێیان دەکرد، تەنانەی ئامادەبوون هەڵوێستی دژانەش لەو هێزانە وەربگرن کە دەبنە خەتەر لەسەر بەرژەوەندی سۆڤییەت و ئایندەی مارکسییەت لە ناوچەکەدا، بە جۆرێك دەمێك قاسم لە رەوتە نیشتمانییەکەی لایدا و شەڕی لە دژی کورد راگەیاند، کۆمۆنیستەکان بەرەی میللەتیان هەڵنەبژارد، چونکە ئەو هەڵوێستە لە قازانجی سۆڤییەتدا نەبوو، هەروەها هەر بە پێی راسپاردەکانی سۆڤییەت کۆمۆنیستەکان لە ساڵی ١٩٧٢ تاکو ١٩٧٨ز بەرەی فاشیزمیان هەڵبژارد، لەمەش زیاتر فاشیەتی بەعسیان بە سۆشیالیزم دانا و هەرچی خەباتی گەلی کوردستانە بە دەرەبەگایەتی و "کلکی ئیمپریالیزم" نێوزەد کرد.

پاشهاتی جەنگی دووەمی کەنداویش، رووخانی شیوعییەت و ئاشکرابوونی ماهیەتی دیموکراسییەتی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا بوو.

پاش ئەو هەموو راستییانە سەیر لەوەدایە نووسەرێك لە ساڵی ١٩٩٥ز ئەو هەموو ماڵوێرانییەی مارکسییەت بەسەر گەلانی هێنا، ئەو بە سەرورییەکانی کۆمۆنیستی ناوی دەبات؟!

بە حوکمی ئەوەی مارکسییەت "ئوممەمی"یە، هەر بۆیە تەفسیرێکی ئوممەمیش بۆ قەومیەت دەکا، لە دیدگای لینین-ەوە مەسەلەی قەومییەت لە دوای مەسەلەی چینایەتی دێت، ستالین-یش لە سەردەمی حوکمی خۆیدا ۱۹۲٤-۱۹۵۳ز تێزێکی نوێی بۆ مەسەلەی قەومیەت دارشت، بە پێی ئەو تێروانینەی ستالین بۆ مەسەلەی قەومیەت، کورد "نەتەوە" نییە، چونکە "ئابووری هاوبەشی" نییە، هەر لەو پێودانگەش کاتی خۆی دەستیکرد بە قەلاچۆکردنی کورد لە کوردستانی سوور و ئازەربایجان، ئەمە و ئەو تێروانینەی ستالین بۆ مەسەلەی قەومیەت لە لایەن مارکسیەکان بوو بە دەستوور، مارکسییەکانی عێراق لە کۆتایی سییەکان تاکو کۆتایی چلەکان باوەڕیان وابوو کە کورد "ئوممە" نییە، هەر بۆیە کوردەکان بۆیان نییە حزبێکی کۆمۆنیستی سەربەخۆش دروست بکەن.

ئەمەو پاش ئەوەی حزبێکی تەیار قەومی لە نێو کورددا دروستبوو، هێڵەکانی ئینشیقاق و ململانێ لە نێوان تەیاری مارکسیی و قەومی سەریانهەلدا، تۆوی ئەو ململانێ و ئینشیقاقەش رۆژ بە رۆژ لە چەکەرە کردندا بوو، لەو نێوەش هەر میللەت باجی ئەو ململانێ ناشەرعییانەی دایەوە، لە لایەکی تریش مارکسییەکان بۆ عێراقی کردنی بزاڤی رزگاریخوازی کورد و بە شەرعیکردنی داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان دروشمی "لا مەرکەزی" و "ئۆتۆنۆمی"یان کردە ئامانجی ستراتیژی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان.

بە قەولی مارکسییەت رزگاری کوردستان لە ئیمپریالیزم و دەسەلاتی عەلمانی عەرەب واتای لەت لەت کردنی پرۆلیتاریای عێراق دەگەیەنێت، هەر بۆیە کەوتنە دژایەتی شۆڕشەکانی کورد و ناوزەد کردنیان بە شۆڕشی ئاغا و دەرەبەگ و شێخەکان، هەروەها ناوو ناتۆرە دروستکردن بۆ ئەوانەی دەیانویست کورد لە ئیستعمار و نۆکەرەکانی رزگار بکەن، لە پاشان دەپرسین ئایا ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە کوردستانی بندەستی عێراق خۆی لە خۆیدا بە شەرعیکردنی داگیرکردنی کوردستان ناگەیەنێ؟! ئایا ئەو حزبەی "ئۆتۆنۆمی" بکا بە ئامانجی ستراتیژی لە بەرەی "رزگاریخوازی" دەرناهێنرێ؟!

ئەمه و پاش ئەوەی عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف و عەبدوڕرەحمان عارف و بەعسییەکان شەڕیان بەسەر کورددا سەپاند، مارکسییەکانی کوردستان به جیاوازی حزبەکانیانەوه بەرەی داگیرکاری عێراقیان هەڵبژارد! ئەو ئینشیقاقەی له شەستەکان له بزاڤی کوردایەتی روویدا هەر به نێوی مارکسییەت نەبوو؟ ئایا ئەو هاوپەیمانێتییەی ١٩٧٢ تاکو ١٩٧٨ز هەر مارکسییەت نەبوو سەلماندی که دەتوانێ لەگەڵ فاشییەتی بەعسیش له دژی گەلانی عێراق به گشتی و کوردستان به تایبەتی بسازێ؟!

مارکسییەکان به هەموو گرووپەکانەوه له سەردەمی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان کەوتنه خەباتێکی سەخت له دژی ئیسلام و بیرۆکەی میللەت، چونکه له روانگەی مارکسییەکانەوه سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول دینی و خێڵەکی و میللی بووه، هەر بۆیه نەیتوانیوه شۆڕشێکی فیکریی و رۆشنبیریی له کوردستان بەرپا بکا، به واتایەکی تر هەرەسی شۆڕشی ئەیلوول هەرەسی دامودەزگای دینی و عەشایەری و میللی بوو، شۆڕشی نوێش وەرچەرخانێکی مەزن بوو له رەوتی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستاندا، ئەو بۆ چوونه زۆر مۆتیڤی تریشی بۆ تەیار کرا بۆ ئەوەی له نێو کۆمەڵدا رەواج پەیدا بکا و شۆڕشی نوێ گۆڕانێکی رادیکاڵی نەك هەر له بواری سیاسیی بکا، بەڵکو گۆڕانێکی بنەڕەتیش له عەقڵییەت و تێڕوانین و تەنانەت باری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و ئابووریش بکات، بەڵام پاش چەند ساڵێك له رەشەکوژی کورد به دەست رژێمه داگیرکەرەکان و خودی گرووپه مارکسییەکان، دەردەکەوێ که ئەو بۆچوونه نامۆیه به خودی ئایدۆلۆژیا و سایکۆلۆژیاو سۆسیۆلۆژیای کورد و کۆمەڵی کوردەواری، جارێکی تر لەو نێوه مارکسییەت تۆوی ئینشقاقی له نێو بزاڤەکەدا دروستکرد، ئەو بەرەیەی به نێوی (ی. ن. ك). دروستبوو بوو لەبەریەك هەڵوەشایەوە، جارێك بزووتنەوەی سۆشیالیستیی له (ی.ن.ك) جیابۆوه، جارێکیش ئاڵای شۆڕش له (ی.ن.ك). جیا بۆوه، لەو لاوەش کۆمەڵێك به ناوی پارتی گەل له سەرکردایەتی کاتێ (پ. د. ك) جیابوونەوه، هەروەها کۆمەڵێکیش به ناوی زەحمەتکێشان له (ح.س.ك). جیابوونەوه. ئەو هەموو ئینشیقاقەی که مارکسییەت خولقاندی له نێو بزاڤی

رزگاریخوازی کوردستاندا هیچ کاتێك بۆ "بەرە و باشتر" نەبووە بەڵکو تەنها بۆ لاوازکردنی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان و بەهێز کردنی بەرەی داگیرکاران بووە؟ ئەگەر وا نەبێ ئەو هەموو ئینشیقاقە لەسەر بنەمایەکی فیکری بوو بێ مەبەستی لە چاکسازی بزاڤی رزگاریخوازی کوردی بوو بێ لە هەندێك تەیاری راسترەو یاخود کۆنەپەرست، ئەدی بۆچی دوایی ئەو هەموو رێکخراوانە زۆربەی چوونەوە نێو یەك؟

لە سەردەمێکدا کە پڕوپاگەندەی "مارکسییەت" بە هەرمێن بوو، یەکێکیان تەواو تەبەنناى مارکسییەتی دەکرد و کردبوویە مەنهەجی فیکریی و تەنزیمی و سیاسیی، تەنانەت رۆشنبیریش، هەرچی باڵەکەی تر بوو هەر چەند نەفی مارکسییەتی نەدەکرد، بەڵام بەقەد باڵەکەی تریش جورئەتی ئەوەی نەدەکرد جاڕی مارکسییەتی خۆی بدا، بەڵام لەسەردەمی پاش رووخانی شیوعییەت مارکسییەت بازاڕی نەما و دیموکراسییەت بە بازاڕ کەوت، بە جۆرێك ئێستا لە هەموو بەیاننامەیەك مەسەلەی دیموکراسییەت و شەرعییەتی دیموکراسییەت زوڕنای بۆ دەژەندرێ.

بە نەزەری هەندێك، شۆڕشی کۆن ١٩٦١-١٩٧٥ز، عەقڵییەتێکی عەسکەری و تاکە حزبی و سەرکردایەتی تاکڕە و بەڕێوەی دەبرد. هەر بۆیە لەو نێوە چارەنووسی کورد جارێکی تر وەکو جارانی سەردەمی شێخ مەحمود و شێخ سەعیدی پیران و قازی روو بە رووی داهاتوویەکی نادیار و واقعێکی تاڵ بۆوە، بە نەزەری من شۆڕشە کۆنەکانی کورد، وێڕای ئەو هەموو کەموو کورتیەی لە رووی رێکخستنی عەسکەری و سیاسییەوە هەیبوو، بەڵام نێوەندێکی رۆحی لە نێوان جەماوەر و سەرکردایەتیدا خەسڵەتێکی پیرۆزی ئەو شۆڕشانە بوو. شتە پیرۆزەکان هەر لە رەوشتی ئیسلامیی گشتییەوە بگرە تاکو سادەترین مافە گشتییەکانی مرۆڤ رەچاو دەکران. ئەو خاکە لە دیدگای ئیسلامەوە گەلێك بە گرنگ وەرگیراوە، چونکە بە راشکاوی دەڵێین هەر شۆڕشگێڕێك وئازادیخوازێك ئەگەر رەوشتی کۆمەڵایەتی نەبێ و رێکخستنەکەی بەو بەها پیرۆزە گۆش نەکا، بێگومان ئەو سەرکردایەتی و رێکخستنە رەوشتی سیاسییشی نابێ و رەوت و

تێڕوانینی حزبەكەش دوو زەبری كوشندە له جوڵانەوەی ئازادیخوازی كوردستان دەدات، لەلایەك جۆرە ناتەباییەك و ناكۆكییەكی ئایدۆلۆژی و سایكۆلۆژی له نێوان سەركردایەتی و كۆمەڵ دەخولقێنێ، له لایەكی تریش شۆڕشەكە دەبێتە شۆڕشێكی چەواشە و له هەردوو باردا تەنیا هێزی داگیركاری كوردستان سوودمەند دەبێ. ئەو خەسڵەتەی سەرەوە تا رادەیەك له نێو شۆڕشە كۆنەكان كەم دەردەكەوتن، هەر بۆیە لەگەڵ هەموو كەم و كورتییەكان هێشتا جێگای رێزی زۆربەی كۆمەڵانی خەڵكن و له كایەی و سیاسیی هەڵگیرسانی شۆڕشەكاندا یاد دەكرێنەوە، به جۆرێك ئەگەر ناوی سەركردەكانی به سووكی بهێنرێن شەڕی لەسەر دەكرێت!

به هەرەسی دوا شۆڕشی كلاسیكی كورد وەرچەرخانێكی كۆمەلایەتی و سیاسییی له رەوتی جووڵانەوەی ئازادیخوازی كوردستاندا روویدا، له بریی ئەوەی قامك لەسەر هەڵەو كەموكورتییەكان دابنرێ و چارەسەری ژیرانەی بۆ بدۆزرێتەوە، به قەولی خودای مەزن بیر بكەنەوە، تێ بفكرن بۆ ئەوەی ئەوانیش به دەردی ئەوان نەچن به بیانووی ئەوەی سەركردایەتی كۆن عەشایەری و دینی بووە، هەرچی شتە پیرۆزەكان هەن له روانگەی دین و كۆمەلایەتییەوە نەك هەر رەتكرانەوە، بەڵكو ئەوان شۆڕشێكی نوێیان له دژدا كردن هەر بۆ ئەوەی له "رابردوو"دابېرێن تاكو حزبە قەومی و پارێزكارەكانیش بوونە هەڵگری "سۆشیالیزم" و به دینی سۆشیالیزم زیاد له دە ساڵی رەبەق رەوت و ئاراستەی تفەنگەكانیان لەبەرەی داگیركارەوە بۆ سنگی یەكترەوە گواستەوە، لەو لاوەش به ناوی ئەوەی دین تریاكی گەلانە، نەوەیەكی سەر لێشێوا و گومڕا و بەدبینیان ئاوا پەروەردە كرد و له هەموو خەسڵەتێكی پیرۆزیان داشۆری: لێرەدا به راشكاوی دەتوانین بڵێین شۆڕشی نوێی كوردی باشوور بناغەی شەڕی نێو خۆی داڕشت له ڕاابردوودا، بەمەش دەرفەتێكی مێژوویی له كیس كورد چوو، چونكه له ماوەی ئەو دە ساڵەدا ١٩٧٦-١٩٨٦ز هەر چوار داگیركاری كوردستان له شەڕێكی سەختی یەكتر دابوون.

لە ساڵی ١٩٨٨ز دوای ئەوەی ئێران بە بڕیاری (٥٩٨)ی ئەنجوومەنی ئاسایش رازیبوو، شەڕی عێراق و ئێران (کە لە راگەیاندنی رۆژئاوا بە شەڕی کەنداوی یەکەم نێو دەبرێ) کۆتایی پێهات، هێزی داگیرکاران پشت ئەستور بە "هەڵوێست"و چەکی کوشندەی کۆکوژی رۆژئاوا کەوتنە قڕانی کورد، لێدانی سەرکردایەتی شۆڕشی نوێی کوردستان، لەو نێوە لە ترسی لە نێو چوون و پووکانەوە "دژەکان" لە (بەرەیەکی نیشتمانیدا) کۆبوونەوە. بەرە هەر هێندەی پێکرا ئاگربەست جاڕبدا، نەك بتوانێ رێککەوتنامەیەکی نیشتمانی مۆر بکاو بە هۆی نەمانی هێزی حزبەکان، لە زۆربەی بەشی باشووری وڵات ئاگر بەسەکەی دژەکان چەند ساڵێکی خایاند. بەمجۆرە هەرەسی ١٩٨٨ز، زۆر لە هەرەسی ١٩٧٥ز گەورەتر بەسەر شانی کۆمەڵانی خەڵکی کورددا کەوتەوە، بەڵام ئەو ئەزموونەش دەرسێکی تری بە مرۆی هۆشمەند بەخشی کە هۆی پاشاگەردانی و هۆی هەرەسی شۆڕشەکانی کورد پابەند نییە بە دیاردەی تاکە حزبی و فرە حزبی، بەڵکو پابەندە بە ئایدیۆلۆژییەت و ستراتیژییەتی واقیعانە کە لەو ئایدیۆلۆژیەتەدا هەیە، ئەوەتا شۆڕشی نوێ، "مارکسیزم" و هەموو "تێزەکانی" دی بە نەزەری وعەمەلی بەسەر گەلی کورد تاقیکردەوە، بەمەش نەك هەر هیچی باشی بۆ کورد نەکرد، بەڵکو عەقڵییەتێکی دوگمایی و عەسکەرتاری دروستکرد، کە بێجگە لە ئەمنی حزب، نە "ئاسایشی نەتەوەیی" و "نەئاسایشی هەرێمیش لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە" دەپارێزێ. شەڕی کەنداوی دووەم ١٩٩١ز، جارێکی تر دژەکانی بە خەسڵەتە کۆنەکانەوە ژیاندەوە، بەڵام هەر بۆ ئەوەی لە پەراوێز دابن و هیچ دەورێکی گرنگ لە هەرێمەکەدا نەگێڕن، جارێکی تر پشت ئەستور بە رۆژئاوا لە پێناوی بەرژەوەندیی عەسکەری و سیاسییەکانی حکومەتێکی "دیفاکتۆی" دامەزراند، بەڵام چ حکومەتێك؟ هەموو پۆستەکانی گرنگی: عەسکەری و مەدەنی، ژیاری ...هتد، هەر ئەو عەقڵییەتە رەقەی عەسکەری بەڕێوەی دەبرد کە لە ئەلف و بێی بەڕێوە بردنی دەوڵەتان بێئاگایە.

لە جیاتی هەموو شتەکان یەك بخرێن و بیر لە ئاییندەی کورد بکرێتەوە، هەموو شتە پیرۆزەکانی گەل بە قوربانی بەرژەوەندی دژەکان کران، بەمەش

بەرەی دەسەلآتدار و بێ دەسەلآت دروستبوو، ئاوا بەرژەوەندی هەردوو حزبی فەرمانڕەوا بوو بە سنووری پیرۆز و هەر یەك بیبەزێنێ بە قانوونی كۆنی كلێسا مەحكوم دەكرێ و لە نێو دەبرێ.

ئەمە وەنەبێ "ئاگر بەست"ی دژەكان بووبێ بەرێككەوتننامەو شەڕی نێو خۆی ١٩٧٦-١٩٨٦ز لە بیر كرابێ، لەو نێوەدا حزبە بچووكە -عەلمانییەكان- بەرە بەرە لە دەسەلآت دەكەوتن، كەچی بزووتنەوەی ئیسلامیی كە لە چاو حزبە ماركسییەكانی كوردستان دوێنێ لە دایك ببوو، لە رووی عەسكەرییەوە "نەك رێكخستنەوە" هەر لە گەشە سەندندا بوو بە جۆرێك لە هەڵبژاردندا سێیەمی هێنا و خەریكبوو دەبووە بەدیلی هەردوو حزبی فەرمانڕەوا، ئەمەش بە نەزەری دەسەلآتی نێوخۆ و هەرێمی و نێونەتەوەیی "خەتەرێكی ترسناك" بوو، دەبوو سنووری بۆ دابنرێ، هەر لەبەر ئەوە لە كۆیایی ١٩٩٣ز بە دەستپێشخەری هێزی عەسكەری یەكێتیی و چەك و تەقەمەنی وەزارەتی پێشمەرگەی حكومەتی "دی فاكتۆی" هەرێم، شەڕ بە بزووتنەوە فرۆشرا، جارێكی تر شەڕی نێو خۆی دەستكەوتی شۆڕشی نوێی كوردستان بووژایەوە! ئاكامەكانی ئەو خولەی شەڕی نێوخۆش خەریكبوو ناهاوسەنگی هێزی عەسكەری و سیاسیی لە نێوان هەردوو حزبی حكومەت دروست دەكرد، هەر بۆیە لە ئایاری ١٩٩٤، ئاگر بەستەكەی ١٩٨٨ز بەزێندرا و بوركانی رقە كۆنەكان لە بونیادی عەقڵییەتە عەسكەرتارییەتەكەوە، فوارەی بەست و خەریكبوو چارەنووسی حكومەت بە دەردی حكومەتەكانی شێخ مەحموود و قازی موحەممەد بەرێ.

ئەزموونی شۆڕشی نوێی كورد، هاوكێشەیەكی واقیعی لە مێشكی تاكی كوردەوە دروستكرد، ئەویش شۆڕشی نوێ یەكسانە بە شەڕی نێوخۆ. ئەمە و هەروەك لە بەرایی وتمان، دەستكەوتێكی تری شۆڕشی نوێی حزبە عەسكەرییەكانی كورد دروستكردنی نەوەیەكی بێ دین و بەدبین بوو. كاریگەری شەڕی نێو خۆی شاخ لە زۆر لایەنەوە گەمارۆ درابوو، هەر روو بەڕووی حزبەكان دەبۆوە، بەلآم لە شەڕی نێو خۆی شارەكاندا، ئەو پەتا نەگریسە تەواو لە گوفتار و كرداری زۆربەی لایەنگرانی حزبەكانیشەوە، رەنگیدایەوە، ئەوانە تەواو شەڕێكی

شارستانییەت و حەزارەی دەکەن ئەو کردارانەش لە نەزەری مرۆی موسڵمانەوە سەیرو نویٚ نین، چونکە ئەو ئایدیۆلۆژیەت و دەسەڵاتە عەسکەرتارییەت چارەنووسی کورد بەو دەردە دەبات هەر لەو ئایدیۆلۆژیەت و دەسەڵاتەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەمڕۆ لە چیچان و بۆسنە پیادە دەکرێن.

**+ ئەمانە تۆ باسیان دەکەی بریتین لە هۆکارە خودی و دەرەکییەکان، بۆچی کورد لە هیچ قۆناغە مێژوییەکاندا نەیتوانیوە سوود لە ئەزموونە تاڵەکان وەرگریٚ و لە بری ئەمانە لەفکری بونیادنانی دۆزێکی سیاسیدا بێت ؟**

سەلام ناوخۆش: هۆکارە خودییو بابەتییەکان وەك زنجیرەیەکی لێکدراوو پەیوەست بەیەك کاریگەری نێگەتیڤیان هەبووەو هەیە، بەسەر دەوڵەتی کوردییەوە. هۆکارە خودییەکان، وەك پێکهاتەیی سروشتی کەسایەتی تاکی کوردی هەتا بیرکردنەوەی تاکی کورد بنەماو شەنگستی شکستی کورد بوونە، لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی میرییەوە لە سەردەمە یەك لەدوایەکەکانی ئەخمینی، ئەشکانی، ساسانی، ئیسلامیی—یش کورد نەیتوانیوە جارێکی تر ئەو شکۆیە بۆ خۆی بگەڕێنێتەوە، سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە کورد لە دوای ئەو قۆناغەوە جگە لە پەرتەوازەییو ونکردنی ناسنامە، زیاتر خوویداوەتە کۆچەری بە جۆریٚ وەك دکتۆر جەمال نەبەز دەڵیٚ: کورد نەك هەر باوەڕی بە زەردەشتو باوەڕەکەی - دینەکەی - نەکردووە، بەڵکو لە وڵات دەریانپەڕاندووە، چونکە ئەوەی زەردەشت لەوانی داوا دەکرد وەك دەستبەرداربوون لە ژیانی کۆچەریو خۆخەریککردن بە ژیانی کشتوکاڵی، ژیانی کشتوکاڵیش نیشتەجێبوون و مەدەنییەتو شارستانییەتی دەوێت، ئەو کۆچەرییەو بیرکردنەوە کۆچەرییە، کۆمەڵگایەکی داخراوو دوورە سیاسەتەی کورد، کوردی لە بیرۆکەی "یەکێتی نەتەوەیی" و وڵاتپارێزی هەتا یەك ئایینیش دوورخستەوە.

هۆکارە بابەتییەکانیش، فاکتەری لاوەکی نەبوونە لە مامەڵەکردن لەگەڵ کوردو دۆزی کورد، هەریەك لە ئەخمینییەکان، ئەشکانییەکانو ساسانییەکان لە ژیانی حوکمڕانییاندا لە چەوساندنەوەی کوردو شێواندنی مێژوو و رەگەزو هەتا زمانی کوردیی درێغییان نەکردووە.

له سهردهمی ئیسلامییهكانیش چ سهردهمی ئومهوی و عهباسی، یان سهردهمی عوسمانی ههتا سوڵتانو خهلیفه ههوڵی ئهوهیانداوه كه ڕۆڵی كورد بهركهنار بكهن، ههندێ ههتا ههوڵیانداوه زاراوهی "مهوالی" و "زهندیق" بهسهر كورددا ساغ بكهنهوه، ئهمهو خودی دهسهلاتی حوكمڕانی كوردیش بهشێك بووه له دروستبوونی ئهو ههموو ههڤدژیو ناكۆكییانه.

ڕهوتی مێژوو زۆر دهرفهتی بۆ كورد ڕهخساندووه، بهلام دهسهلاتی سیاسیی كورد لهو ئاستهدا نهبووه بتوانێ دهرفهت بقۆزێتهوهو مهسهلهی كورد له قاوغی عهشیرهتو هۆز رزگار بكات.

له سهردهمی عهباسییهكانهوه بگره ههتا سهردهمی ئێستا به دهیان جار ڕهوتی مێژوو بواری ئهوهای بۆ كورد ڕهخساندووه نهك دهوڵهتێك بهڵكو وهك عهرهبهكان چهند دهوڵهتێك بۆ خۆی دابمهزرێنێ، ئهوه وتمان له سهردهمی ئیسلامییهكان دهوڵهت لهسهر بنهمای بنهماڵهكان دامهزرا، ههرچهند ئهو بنهمالانهی ئهوسا ههر خهریكی دامهزراندنی میرنشینی ناوچهگهریی بوون، نهك ههنگاوی نهتهوهیی بهاوێژن بۆ دامهزراندنی دهوڵهتێك له قهڵهمڕهوی عهشیرهتو هۆز گهورهتر خۆی لهدوای ههرهسی دهوڵهتی عوسمانییهوه چهندان جار ڕهوتی مێژوو بواری بۆ كورد ڕهخساندووه، بهلام فاكتهره زاتییهكان به پله یهك ڕێگربوون لهو پێكۆڵو ههولانهدا، ههروهها تهبایی هاوسێ هاوئایینهكانی كورد له پێناو بهرژهوهندییهكانی خۆیان چهندهها ئاستهنگیان دروستكردووه، ههرچی ڕۆژئاوایه، ئهوه مانهوهی كورد به بێ دهوڵهت هۆكارێكه بۆ مانهوهی "ئارێشهو كێشه" ههروهها كهناڵێكی ههڕهشهیه له دژی دهوڵهتی دهوروبهری كورد.

**+ زۆرێك له ناسیۆنالیستە كوردەكان پێیانوایه ئیسلام، ڕۆحیهتی نههێشتن و كوشتنی ههستی نهتهوایهتی و فیكریی بووه، به بهردهوامی له بهردهم تاكی كورددا كه ههرگیز له بیری دروستكردنی دهوڵهتی نهتهوهییدا نهبێت ؟**

سهلام ناوخۆش: ئهوهی پێی دهوترێ "ناسیۆنالیستی كوردیی" زێتر ئهو ورده بۆرژوایانه دهگرێتهوه كه له مێژووی سیاسیی خۆیاندا نهیانتوانیوه "بهخۆیان" هیچ جۆره ستهمێك لهسهر تاكی كورد رابكهن، بهشێك لهو "ناسیۆنالیستانه" هیچ

هێزێکی سیاسیی ئاراستەی نەکردوون تەنیا وەك لاساییکەرەوەی ناسیۆنالیستی عەرەبیو تورکیو فارسی "بیریان کردۆتەوە" نەك کاریان کردبێت، بەشێکی تریش پاشخانە سیاسییەکەی مارکسییەتی ستالینی بووە هەتا سەردەمانێك نەتەوەو "مافی نەتەوە" هەتا چەمکی ناسیۆنالیزمی پێ شەرمەزار بووە !

مارکسیزمیش وەك هزر لەگەڵ دین دۆست نییە، هەروەها قەبووڵی ناسیۆنالیزمیش نییە، چونکە پێی وایە ئەمە دیاردەیەکەو دەرهاویشتەی کۆمەڵگەی سەرمادارییە! ئەوەش لە بیرنەکەین ناسیۆنالیستە لاساییکەرەوەکان ئەوانەی پاشخانێکی مارکسیان هەیە لە ئەرزی واقیعدا نەیانتوانیوە شۆڕش بەو بیرۆکانە بکەن، بۆیە هەر لە بەرایی شۆڕشەکانی کوردەوە لە سەرکردەی "کلاسیکی" گەڕاون بۆ ئەوەی سەرکردایەتی شۆڕش بکەن، ئەوانیش هەر بە سیاسەتەوە خەریکبن، هەر لە (کۆمەڵەی ئازادی کوردستان)ەوە بگرە هەتا (حزبی ئازادیی کوردستانی رۆژهەڵات) هەر بەو ئاراستەیە کاریانکردووە، ئەو نیفاقە سیاسییە بەشێك لە پاشاگەردانی هزری حزبی کوردی عەلمانی تەنیوە لە ژێرەوە مارکسی بوون یان هەر هیچ نەبێ پەیوەست نەبوونە بە (دین)، بەڵام لە سەرکردەی دین گەڕاون بۆ ئەوەی حزوری لەرزۆکی خۆیان گووم نەبێت، هەر لە بەرایی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانیش ئەو مۆرانەیە خەباتی خەڵکی کوردستانی تووشی نسکۆ کرد، بە قەناعەتی خۆم پاشاگەردانی شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١ ـ ١٩٧٥ز) ئەوەندەی پەیوەست بووە بەو دیاردەوە هێندە فاکتەرە دەرەکییەکان ئەو رۆڵەیان نەبووە، هەر ئەو نیفاقە سیاسییە بەشێك بووە هەتا لە خولقاندنی فاکتەری دەرەکیدا!

مرۆڤ بە سروشتی خۆی کائینێکی پاساوهێنەرە هەتا بۆ دزێوترین کردەوەکانی! زۆرانێك لە مرۆڤان خەسڵەت شەیتانین، بەڵام هەتا گەورە شەیتانەکانی ناو سیاسەت جورئەتی ئەوە ناکەن ئەو شەیتانییەتەی خۆیان ئاشکرا بکەن، بێگومان ناسیۆنالیستی کورد دەبێ لە پاساوێك بگەڕێ بۆ ئەوەی ئەو مێژووە پڕ پاشاگەردانیو نسکۆو هەرەسەی خۆی دابپۆشێ! !

ئیسلام لە هەموو دینەکانی تر جودایە، ئیسلام هەم شەریعەتە، عەقیدەیە، هزرە، بە واتای ئیسلام هەموو لایەنە ئەکتیڤەکانی تاك و كۆمەڵگا ئاڕاستە دەكات، نەك شەریعەت بێ، عەقیدە نەبێ یان تەنیا هزرێك بێ یاخوو پێناسەیەکی رووتی ئایدیۆلۆژی بۆ بکرێ.

ئامادەگیی ئیسلام جۆرێك بووە لە هاندان و ئاكتیڤ كردنی بزاڤی سیاسیی و كولتووری لە كوردستاندا، جگە لەوە ئەوە تێنەگەیشتنی خەڵكی ئێمەیە هەم لە ئیسلام و هەم لە ناسیۆنالیزم، خەڵكە عەوامەكەی ئێمە دینی لە (خانەقا)و (تەكیە)و (مزگەوت) وەرگرتووە، ئەو دینەی لەو سێ شوێنە حزووری هەیە زیاتر ڕوحانییە، عیبادەتە، نەك عەقیدەی سیاسیی و هزری سیاسیی (مەلا)و (شێخ)و (سەیید) فیگەرە پیرۆزەكانی زەینی خەڵكی عەوامی كورد بووە، قسەی ئەوانە دین بووە بۆ خەڵكی عەوام!

ئەو لەقەبە دینیانە هێندە "كاریگەر"و "پۆزەتیڤ"ن، بۆیە زۆرانێك لە ناسیۆنالیست و ماركسی كورد ئەو لەقەبانەیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە!

ئەو فیگەرە دینیانەی كورد نەیتوانیوە بزاڤێكی ریفۆرمی لە كوردستان دروست بكەن، واتە وەك ئەو فیگەرانەی جیهانی عەرەبی و ئیسلامیی، بە واتای لەناو كۆمەڵگای كوردی (عەبدوڕڕەحمان كەواكبی)، (جەمالەدینی ئەفغانی)، (موحەممەد عەبدە)یەك دروست نەبوون، بە واتای كەسایەتییەكانی كورد ئیشكردنیان لەسەر ئیسلام زیاتر "تەریقەت" بووە، نەك ئیسلامێكی شامل كە لایەنی "سیاسیش" بەشێك بێ لە تێڕوانین و جیهانبینی و كاركردنیان، هەریەكە لەو كەسایەتییە دینیانە بە سەدان هەزاران دەروێش و مورید و پیاوی عەشیرەتی خۆیان هەبووە، هەر بۆیە بەو پاڵپشتە رۆحیی و كەسییەوە ستەمی داگیركارانیان قەبووڵ نەكردووە، لەم روانگەوە، زۆر بە ڕاشكاوی دەتوانین ئەو وەهمەی ناسیۆنالیزمی كوردی بێدەسەڵات هەڵوەشێنینەوە بەوەی حزوری ئیسلام لە ژیانی كورددا نەك نێگەتیڤ نەبووە، بەڵكو هۆكارێكی ئاكتیڤ بووە لە ئاڕاستەكردنی كورد بۆ ئەوەی بە ستەمی داگیركاران رازی نەبێ و داكۆكی لە بوون و ناسنامە و زمان و كولتووری خۆی بكات، داواكارییەكانی سەركردە ئاینییەكانی وەك شێخ

عوبێدوڵڵای شەمزینیو شێخ عەبدولسەلام بارزانیو شێخ سەعیدی پیرانو سەیید رەزای دەرسیمی، بەڵگەی کۆنکرێتین لەسەر کاریگەریی ئیسلام لە وەلامدانەوەی هەر هەڕەشەیەك لەسەر موقەدەساتی کورد !

کێ دەوڵەتی کوردی دروست بکات؟! گریمان (مەلا)و (شێخ)ی کورد کاریان بۆ دەوڵەتی کوردی نەکردووە، ئەدی ئەوانەی بانگەشەی ناسیۆنالیزم دەکەن لە مێژووی سیاسیی خۆیان هەتا بە دروشمیش نەك پێکۆڵیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی نەکردووە بەڵکو هەر باسیشیان نەکردووە! ئەوە (مەلا)و (شێخ)ی کورد بەڵگەی کۆنکرێتییان هەیە لەسەر داکۆکیکردن لەسەر مافە نەتەوەییەکانی کورد لەو پێناوەش چەندانی وەك شێخ سەعیدی پیران، سەیید ڕەزای دەرسیمیو قازی موحەممەد سەری خۆیان لە پێناودا دانا، ئەدی ناسیۆنالیزمی کورد لە چ بڕگەیەك لە بڕگەکانی پلاتفۆڕمی حیزبەکاندا باسیان لە دەوڵەتی کوردیی کردووە؟!

ئەوە جگە لە مێژوو شێواندن، لێڵکردنی مێژوو و ئێستا لە بەردەم نەوەی نوێ هیچی تر نییە، ئەگەرنا ئەوە مێژوو ئەگەر حزوری ئیسلام لە ژیانی کورد نەبوایە، ئێستا کورد هیچ مێژوویێکی ئەوتۆی نەدەبوو کارەکتەرە زانستیو ئاینییەکانی لە دنیای رۆژهەلاتی نەدەناسران! !

**+ بۆچی کورد بەر لەوەی ئاینی ئیسلام پەیدا ببێ لە هیچ شوێنەوارێکی مێژووییدا شتێکی ئەوتۆی لەبەردەستدا نییە کە هەوڵی دروستکردنی قەوارەیەکی بۆ خۆی دابێت؟ بەتایبەتی لە پاش رووخانی دەوڵەتی (ماد) تاوەکو هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ کوردستان؟**

سەلام ناوخۆش: وەك لە وەلامی پرسیاری پێشوودا وتمان، نەك ئیسلام هەر رێگر نەبووە، بەڵکو هاندەر بووەو کەسانی ئاینیش ئیشیان بۆ کردووەو چەندەها شۆڕشیان بەرپا کردووە.

ئیسلام کە خۆی گوتارەکەی گوتارێکی خۆڕسکە، بە واتای ئاڕاستەی گوتارەکەو خودی گوتارەکە لەسەر بنەماو شەنگستی سروشتی مرۆڤەوە داڕێژراوە، جا چۆن دژ بە خۆی دەوەستێتەوە ململانێ لەگەڵ هەستێکی خۆڕسکی

وەك نەتەوەپەروەری نەك نەتەوەپەسەندی دەكات؟! وەك وتمان ئەوە وەهمێكە ناسیۆنالیستی كورد هەر بۆ چەواشەكردن، دەیوروژێنێ.

دەوڵەتی (ماد) لە ساڵی (٥٥٠)ی پ. ز رووخا، كوردیش لە ساڵی (١٦)ی كۆچی بە واتای ساڵی (٦٣٨ز) ئیسلامی ناسی بە واتای كورد زیاتر لە هەزار ساڵ بێدەوڵەت بووە!!

لە دوای میدیاكان، ئەخمینی، ساسانییەكان حوكمی ناوچەكەیان كردووە، لە كاتی هاتنی ئیسلام كورد زیاتر لە هەزار ساڵ بوو دەوڵەتی رووخابوو وڵاتەكەی بەشێكی بەشێكبوو لە دەوڵەتی ساسانی بەشەكەی تریشی لە ژێر دەستی رۆمەكان (بێزەنتییەكان) بوو، كوردی نێو ئەو دوو قەڵەمڕەوییە هێندە پەرتەوازە ببوون هەتا لە دینیش لە یەكتر جودا بوون، كوردەكانی ناو دەوڵەتی ساسانی زۆربەی (زەردەشتی)و (ئاگرپەرست) بوون، بەشێكی كەمی چەوساوەش (مەسیحی) بوون، هەرچی كوردەكانی ناو ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی بوو ئەوە زۆربەی (مەسیحی) بوون. بە واتای لە رووخانی دەوڵەتی ماددەوە كورد نەك "یەكێتیی"یەكی نەتەوەیی نەبوو، بەڵكو "یەكێتیی"یەكی دینیشی نەبووە، هەتا خوانەخواستە ئیسلام رووخاندبێتی، كورد زیاتر لە هەزار ساڵ لە دەرەوەی مێژوو بووە، زۆربەی لە دەزگاكانی دەوڵەتو دەوڵەتكاری دووركەوتنەوە جارێكی تر گەڕاونەتەوە سەر ژیانی كۆچەریو دوور لە شارستانییەت، ئەوانەی كە لە داوو دەزگای ئەخمینییو ساسانی مابوون ببوونە بەشێكی ملكەچ بە سیاسەتی دەوڵەت، هەتا نەیاندەتوانی داكۆكی لە (زمان)و (ناسنامە)و (ئایینی) خۆیان بكەن!

ئەو رەوشەی كورد چاوەڕێی رزگاركەرێكی لێدەكردن راستە بزاڤی "ناسیۆنالیزم" وەك بزاڤێكی عەقڵگەرایی دەبێ ئاڕاستەی گوتارەكەی بەرەو دەسەڵاتو فەرمانڕەوای وڵاتی خۆی بێت، بەڵام هەزار ساڵ كورد نەیتوانی ئەو ئاڕاستەو گوتارە دروست بكاتو دەوڵەتێكی هاوشێوەی دەوڵەتی میدیا بە (هزر)و (عەقیدە)و (تێكۆشان)ی خۆی بنیات بنێتەوە، وەك وتمان كورد لەو هەزار ساڵە، تەواوی ناسنامەی خۆی گوم كردبوو، خۆیشی بەشێك بوو لەو پرۆسەی گومكردنو

خۆشاردنەوە له دەركەوتنێكی مێژوویدا عەقڵی رەوەندیو كۆچەری ژیانێكی دوور له شارستانییەتو له بەرژەوەندی نەیارانی كورددا بووە، بەزەرەری كوردیش تەواو بووە، له لایەكی تریش هەتا ئەو كوردانەی ناو دەوڵەتی ساسانی له ژێر گوشارو كاریگەریی دەوڵەتی ساسانیدا نەك هەر نەیانتوانیوە سوود له (مەسیحیەت) وەربگرن، بەڵكو له زۆر شوێن و كاتدا مەسیحییەكان كوردەكانیشیان چەوساندۆتەوە! !

لەو پێودانگەوە كورد چاورەێی رزگاركەرێكی دەكرد، چونكە (بوون)و (دین)و (زمان)و (كولتووری)ی له خەتەردا بوو، هەر لەسەر ئەو بنەمایەش كورد له عەرەب زووترو بێ كێشەتر موسڵمان بوو، عەرەب له جەزیرەی عەرەبیدا دەسەڵاتی سیاسییو دینی هەبوو، بە هاتنی ئیسلام ئەو دەسەڵاتە سیاسییو دینییە نەما، چونكە ئەو دوو دەسەڵاتە دوو دەسەڵاتی (نائینسانی) بوو، هەموو وڵات گەندەڵ بوو، سیاسەت هەر بۆ بنەماڵە ناسراوەكان بوو، دینیش بۆ ئەو بنەماڵە دەسەڵاتدارانە ژێدەرێكی ئابووری نەبڕاوە بوو! هەرچی كوردەكان بوون زیاتر له هەزار ساڵ بوو مومارەسەی دینو زمانو مافی نەتەوەیی خۆیان نەكردبوو!

لێرەش ناسیۆنالیستی كورد درێغی نەكردووە له شێواندنی مێژووی کورددان هەتا هەندێ باوەڕیان وایەو بانگەشەش بۆ ئەو رایەیان دەكەن كە ساسانییەكان كورد بوون! !

ئەمەش هەر بۆ ئەوە دەڵێن تا بڵێن ئیسلام هاتووە كوردستانی داگیر كردووەو دینو كولتووری سوتاندووە، هەندێك دەڵێن موسڵمانە عەرەبەكان ئاوێستایان سووتاندووە بۆ ئەوەی جارێكی تر كورد نەگەڕێتەوە سەر دینی خۆی، هەندێكی تر ئێزیدییەكان بە نەوەی میسرانییەكان دادەنێن، بەو واتایەی دەیانەوێ بڵێن مێژووی ئێزیدییەكان دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی ئیسلام!

ئەو "گریمان و را"یانە، جگە لەوەهم هیچی تر نینو هیچ بنەمایەكی زانستییان نییە، جاریّ هەر خودی "ئاوێستا" بە كوردی نەبووە، بە زمانێك بووە هەر تەنیا زەردەشت خۆی تێیگەیشتووە، هەر زەردەشت ئاوێستای بۆ كوردی ـ فارسی

وەرگێڕاوە، لە مێژوودا ئەو دوو دەقە بە "زەند"و "پازەند" ناسراون، لە پاش ئەوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی لە شەڕی ئەربێلا لە (٣٣١)ی پێش زایین بەسەر (دارا) زاڵ دەبێ بەرە بەرە بەرەو وڵاتی فارس‌و رۆژهەڵاتی کوردستان دەکشێ، لەو هەڵمەتەی جگە لە کوشتن‌و بڕین‌و سوتماککردن هەرچی کولتووری فارسی - کوردی هەیە دەیسووتێنێ، هەر سوپاکەی ئەسکەندەری مەکدۆنی نزیکەی هەزار ساڵێك پێش هاتنی سوپای ئیسلام بۆ کوردستان ئاوێستا دەسووتێنن! ئەو دەقەی ئاوێستا کە لەسەردەمی ساسانییەکان هەبوو ئەوە دەقێك بوو بە گوێرەی بەرژەوەندیی ساسانییەکان نووسرابووەوە، بە واتای نە دەقی ئاسمانی بوو نە زەندو پازەندەکەی سەردەمی زەردەشت بوو!

بە هیچ شێوەیەك ئێزیدییەکان پاشماوەی میسرانی‌و زەردەشتییەکان نین، بەڵکو ئەوانە لە ئاکامی ململانێکانی ئومەوی‌و عەبباسی پەیدا بوون لە بنەڕەتدا موسڵمان بوون، هەتا رابەری رۆحییان کە (عودی بن مسافر) بوو، یەکێك لە وەلییەکانی سەردەمی خۆی بووە، دەرکەوتنی ئەمانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دوازدەهەمی زایینی، ئەو تەقدیسکردنەی (عودی)و (حەسەنی کوڕی) بەرەو ئاقاری پەرستنی تری بردن، هەرچەندە هەر خۆیان خۆیان بە "خوداپەرست" دادەنێن! ئەمانە "ئێزیدیی" بن یان "یەزیدی" دینێکی نوێیە، ئەگەر هەندێ تقووس‌و داب‌و نەریتی کۆنی گەلانی ئاریش پەیڕەو بکەن، ئەوە هیچ لەو راستییە ناگۆڕێ، چونکە ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەندێ لەو دیاردانە لەناو کوردانی موسڵمانیش هەر ماوە وەك سوێندخواردن بە "ئاگر" بە "ئاو" بە "خاك" ئەو کوردەی سوێند بە "ئاگر" دەخوات وەك سۆزێك بۆ زەردەشتییەت ئەمە ناکات، بەڵکو تەنیا کولتوورێکە لە باوکانی بۆی ماوەتەوە!

بە کورتی ناسیۆنالیزمی کوردیی لە پێناو ناشیرینکردنی ئیسلام لە هیچ نەگەڕاوەتەوە، ئەوەتە هەر لەبەر ئەوەی سروودی "ئەی رەقیب" بۆنی "کوفر"ی لێدێ بە کورتی‌و زۆرەملێ خەریکە بەسەر کورددا دەیکەنە ماڵ، نووسەری ئەو شیعرە خۆیشی "مارکسی" بووە ئەوسا پارتەکەی دڵدار باوەڕی وابوو کە کورد ئوممە نییە هەروەها دژی دامەزراندنی پارتی بوو ، ئەوساش پارتی واتای

کوردایەتی دەگەیاند، لەو ڕوانگەوە زۆربەی (کۆیی)کان ببوونە پارتی جگە لە دڵدار کە تا مردیش هەر شیوعی بوو، نەك ناسیۆنالیست! ئەوەی پەیوەستە بە مێژووەوە کورد بە هیچ جۆرێ نەوەی "کەیخەسرەو" نین، چونکە کەیخەسرەو کورد نەبووە، هەروەها بە تەنیا نەوەی میدییەکان نین، چونکە ئەگەر کورد هەر تەنیا نەوەی میدیاکان بن، ئەوە بەشێك لە کوردان لە ڕووی رەگەزەوە کورد نین!! میدییەکان رەگەزێکی پاك نین، بەڵکو لە ئاکامی چەند رەگەزێکەوە پەیدا بوون؟!

ئەمەو بە حوکمی ئەوەی "مەلا مستەفای بارزانی" سۆزێکی دینی هەبووە هەروەها زۆربەی مەلاو شێخە شۆڕشگێڕەکان بە سەرۆکی خۆیانی دەزانن ئەوە هەر کە شۆڕشی ئەیلوول تووشی نسکۆو هەرەس بوو، سیاسەتمەدارەکانی کورد هەموو بوونە مارکسی هەتا "پارتی"یش لە پلاتفۆرمی خۆیدا دانی بە فەلسەفەی "مارکسی و لینین" ناوە!!

بە کورتی لەدوای نەمانی سەرکردە کلاسیکییەکانی ناسیۆنالیستی کورد بەرەیەکی لە "دین" کرێوتەوە، بە (هزر)و (شەڕ)، جگە لە مزگەوت لە هەندێ شوێنی شۆڕش ئەوەندەشیان بۆ دین نەهێشتووەتەوەو هیچ شوێنێکیان بۆ ئیسلام نەهێشتووەتەوە.

لە قۆناغی ئێستاش بەدوای دروستبوونی حزبی ئیسلامیی کوردستانی لە هەموو تەیارەکانیەوە، دەعەوی، تەربەوی ئیسلامیی یان جیهادیی! بەشێك لە تەیاری عەلمانی کوردی کە خۆی بە ناسیۆنالیست دادەنێ بە جۆرێکی تر دەیەوێ حزوری ئیسلام لە ژیانی سیاسییو رۆشنبیریی و کۆمەڵایەتیی کورددا بشێوێنێ، دەڵێن کورد هەمووی موسڵمانە، حزبی ئیسلامیی بۆ چییە؟! بەڵام لە خۆیان ناپرسن ئەگەر کورد هەمووی موسڵمان بێ حزبی عەلمانی، رێکتر، نادینی بۆ چییە؟! ئایا بۆ ئەوەیە لە دین وەریانگێڕنەوە وەك ئێستا هەندێ "جاش دین"یان دروستکردووە، هەر بۆ ئەوەی ئاژاوەو پەشێوی بخەنە ناو کۆمەڵگای کوردییەوە.

داوا له كوردان دەكەن كه ئەوانه وەك دیاردەی لێبوردەیی دینی وەربگرن، خۆشیان چاك دەزانن كەس بەقەد كورد لێبوردەی دیینی نییه، ئەوه چوارده سەدەیه (موسڵمان و مەسیحی) له كوردستان پێكەوه دەژین تا ئێستا كوردێكی موسڵمان لەسەر دین مەسیحییەكی نەكوشتووه! كەچی له ئەوروپا به هەزاران موسڵمان له (كۆسۆڤۆ)و (بۆسنەو هەرسك) لەبەردەم چاوی كامێراكان سەربڕان! !

ئەو ناسیۆنالیستانه وەك نەعامه وان مێژوو له ژێرەوه دەخوێننەوه، ئەگەرنا چاك دەزانن كورد له پاش روخانی ئیمپراتۆریەتی میدیا هەتا هاتنی ئیسلام تاقەتی ئەوەی نەبووەو دەرفەتی ئەوەشی نەبووه كورد له پەرتەوازەی رزگار بكاو له دەوڵەتێكی تردا كۆی بكاتەوه، ئەوه كورد خۆی! هەروەها ئەوانەی به هزری بێژمۆتو نەزۆك خەڵك تەلقین دەدەن، هۆكار بوونەو هۆكارن له بەردەم دروستنەبوونی دەوڵەتی كوردیدا نەك ئیسلام! !

**+ تا چەند كورد شتێكی هەبووه به ناوی (كێشەی نەتەوایەتی) له مێژەوه؟ یا ئەم مەسەلەیه لەم دواییانەدا سەریهەڵداوه؟**

سەلام ناوخۆش: هەبوونی "كێشەی نەتەوایەتی" له ناو گەلانی هاوئایین به تایبەتی لەناو گەلانی موسڵماندا مێژوویەكی كۆنی نییه، له كۆندا هەتا سەرەتای جەنگی یەكەمی جیهانیدا سیستمی وڵات یاخود فەرمانڕەوایی زیاتر له شێوەی "ئیمپراتۆریەت"دا بووه، ئەگەر گەلێكیش هێنده زێده ماف و جیاوكی له گەلێكی تر هەبووبێ، ئەگەرنا حوكم زیاتر دەستەجەمعی بووه.

كێشەی نەتەوایەتی زیاتر دیاردەیەكی رۆژئاواییه، له كۆمەڵگای سەرمایەداری سەریهەڵدا، هەروەها كۆلۆنیالیزم فاكتەری خولقاندنی ئەو ئارێشەیه بووه، ئەو وڵاتانەی له تێڕوانینی ناسیۆنالیزمی كولتووری و رەگەزی مامەڵه لەگەڵ گەلی تر دەكەن، ئامانجی ستراتیژیان له بزاڤەكەیاندا تواندنەوەی نەتەوایەتی ئەو گەلانەیه یان رەتكردنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی ئەو گەلانەیه، كورد له مێژووی خۆیدا تووشی بەو جۆره ناسیۆنالیزمه بووه به تایبەتی له سەدەی (١٩)و (٢٠)ەوه، له سەردەمی میدییەكان بەرەو خوارەوه ناسیۆنالیزم و كێشەی نەتەوایەتی هیچ سنورێكی سیستماتیكی وەرنەگرتبوو، چونكه گردبوونەوەكه لەسەر بنەماو

شەنگستی نەتەوە نەبووە، بەڵكو ئەوسا هەر گردبوونەوەیەكو دەسەلآتێك لەسەر بنەمای هۆزایەتیو ژێدەری ئابووریو دەسەلآت بووە، كوردو فارس هێندە لەیەك نزیك بوونە، لە رووی رەگەزیو زمانو جوگرافیاوە، بۆیە ئەستەم بووە بە بڕیارێكی یەكلاكەرەوە بڕیاری ئەوە بدەن (میدی) كورد بوونە، (ئەخمینی)و (پارس) فارسی ئەمڕۆ بوونە! هەر بۆیە ئەوسا هەر ئیمپراتۆریەتێك دەڕووخا تەواوی (نەتەوە)كە لە هەموو روێكەوە نەدەڕووخا، بەشێكی زۆر لە میدیایەكان لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی میدیادا هەر لە ولآتی خۆیان مانەوە.

بە ڕاشكاوی دەكرێ بڵێین، كێشەی نەتەوایەتی هێلكەیەكی تروكاوی ئیستعمار بوو، ئیستیعماری رۆژئاوا كە دەستی بەسەر رۆژهەلآتدا گرت، هەرچی خێرو بێری ئەو ولآتانە هەیە لە تەكنەلۆژیاو مانەوەی خۆی بەكاری دەهێنا، گەر ئەم دەوڵەتانەی ئێستای رۆژئاوا بە ئیستعمار نەبووبن، ئەو هەردوو دەوڵەتی بەریتانیاو فەرەنسا لەم پرۆسەیە بەشی شێریان وەبەردەكەوێ، بەلآم بە حوكمی ئەوەی ئەو رۆژئاواییانە بە قەولی كوردی "غەیرە دین" بوون، هەر بۆیە كاردانەوەی میللەتانی ژێر ركێفی ئیستعمار سەرەتا بە وەلآمێكی "دینی" ئەو پرۆسەی داگیركردنیانداوەتەوە، لێرەش ئیسلام وەك دینێك، كە هیچ جۆرە زوڵمێك قەبووڵنا كات، هاندەری رۆحیو سیاسییو دیینی ئەو گەلانە بووە لە دژی داگیركەر سەبارەت بە عەرەبەكات ئەوانە هەتا قەومییەكانیشیان ئیسلامیان كردبووە پۆشەرێك وەك بڵێی داگیركەر (شەڕی قەومی) لەگەڵ ئەوانە دەكات نەك (شەڕێكی دینی)، كەچی لە بنەڕەتدا هێندەی داگیركەر مەبەستی (دین)و (سەروەتو سامان)ی خەڵكەكە بوو، هێندە لەلای گرنگ نەبوو ئەو ولآتەی داگیری كردووە، ولآتی چ نەتەوەیەكە؟!

دەرئەنجامەكانی شەڕی یەكەمی جیهانی رەوتی ململانێی داگیركەرو رۆژهەلآتی ئیسلامیی بە ئاقارێكی تردا برد. هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی كە جەماعەتی (ئیتیحاد و تەرەقی) لەدوای كودێتای تەممووزی (١٩٠٨ز)ەوە حوكمی دەوڵەتیان دەكرد، رێخۆشكەرێك بوو بۆ ئەوەی داگیركەر لەمەودوا شەڕی ناڕاستەوخۆ بكات،

هەروەها حوكمی ناڕاستەوخۆ لەو وڵاتانه بكات، وێڕای هەموو ئەمانەش داگیركەر بە نەزەر هەندێ قەومەوە له بری "داگیركار" بووە "رزگاركەر!".

ئەو شەڕە نەك هەر خولقێنەری "كێشەی نەتەوایەتی" بوو، بەڵكو داڕێژەری نەخشەیەكی سیاسیی نوێ بوو له رۆژهەڵات، ئەو نەخشە سیاسییە هێندە وردەكاریی تێدا كراوە بە جۆرێ قەت ئەو گەلانەی رۆژهەڵات بەتایبەتی عەرەبو تورك‌و فارس تەبا نەبن ،چونكه له كۆندا ئیمپراتۆریەتیان هەبووە سنووری قەلەمڕەوی ئەو سێ ئیمپراتۆریەتە هێندە فراوان بووە، ئیمپراتۆریەتەكانی ئەوروپاو رۆژئاوا سەدان حسێبیان بۆ كردوون!!

خەونی تورك و عەرەب و فارس تەواو هەرەسی هێنا، یەك كیانی عەرەبی كرا بەزیاترله (٢٠) كیانی بەناو قەومی‌و له نێوان هەردوو وڵاتێك كێشەیەك چاندرا، كێشەی سنووری عێراق ـ كوێت، سعودیە ـ یەمەن، تونس ـ جەزائیر، لیبیا ـ چاد.. هتد، هەروەها ئەو مەسەلە دینی‌و مەزهەبیانەی تۆزی مێژوویان لێ نیشتبوو، له ژێرەوە ژیلەمۆیەكیان گڕدان ئەو ژیلەمۆیە عێراق‌و لوبنان‌و سودان باجێكی زۆری بۆ دەدەن، كەچی هەر له چارەسەر نزیك نابنەوە!!

دوو دەوڵەتی عەرەبی كه لەوانەیە له ڕووی ئایدۆلۆژیشەوە لەیەك نزیك بووبن وەك (عێراق)و (سوریا) نابنه یەك، جا (٢٠) دەوڵەتی عەرەبی چۆن دەبنە یەك.. ئەو هەموو دەوڵەتەش بانگەشەی عەلمانییەت دەكەن، هەروەها "یەكێتی عەرەبی" یەكێ له دروشمه سەرەكییەكانیانن.

سەبارەت بە كورد هەر لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتە ناسیۆنالیستەكان كێشەی نەتەوایەتی لەگەڵ "هاوسێ هاودینەكانی" بۆ دروستكراوە، دەڵێم بۆ دروستكراوە؟ چونكه كورد "دۆزێكی نەتەوایەتیی" هەیە، هەرچی ئەو هاوسێ هاودینانەن ئەوانە كێشەی نەتەوایەتییان لەگەڵ كورد هەیە.

كورد لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا كاری بۆ پان عوسمانیزم دەكرد، ئەمە راستییەكه هەتا زۆربەی ڕووناكبیرو سیاسەتمەدارەكانی كورد ئاوا بیریان دەكردەوە، دكتۆر عەبدوڵلا جەودەت، ئیسحاق سكوتی، ئەمین عالی بەدرخان، شێخ قادری شەمزینی، شێخ سەعیدی پیران، شێخ مەحموودی حەفید، هەتا

مێژوونووسێكی وهك موحهممهد ئهمین زهكی–یش ئهو راستییه له "خلاصه"كهی بهیان دهكات.

كهسێكی وهك دكتۆر عهبدوڵلا جهودهت له كهسه یهكهمهكانی "ئیتیحادو تهرهقی" بووه، هێندهی عوسمانی بووه، هێنده كوردستانی نهبووه، ئهو ملكهچی ماركسیهتێكی ئومهمی بووه، كهچی هاوڕێ توركهكانی له ئیتیحادو تهرهقی كاریان بۆ پان ـ توركیزم دهكرد، تورك حوكمی لهسێدارهدانیان بۆ شێخ مهحموود دهركردبوو، كهچی ئهو (لهپاش حوكمهكهش!) ههر هاوپهیمانی تورك بوو!

له دوای توندبوونی پێگهی ناسیۆنالیزمی عهرهبیو توركیو فارسی هیچ خوێندنهوهیهكی پۆزهتیڤ بۆ (هاودینی)و (هاوسێیی) و (هاومێژوویی) كورد نهكرا، ئهو ناسیۆنالیزمهش وهك ناسیۆنالیزمی رۆژئاوایی بوونه "ناسیۆنالیزمی داگیركهر"، ئهو سێ هاوسێیه له ماوهی سهدهی رابردوودا، چهندان نهوهیان لهسهر چهواشهكردنی مێژوو تهلقینداوه، ئهوانه زۆربهی ههره زۆریان به ههموو مهزههبێكی دینیو سیاسییانهوه له ئاست كورد وهك یهك بیر دهكهنهوه، وهك یهكیش كار دهكهن!!

له ماوهی ئهو سهد ساڵهی رابردوودا لهو سێ وڵاتهدا زۆرجار سیستهمهكان گۆڕدران ـ پاشایهتی، كۆماریی، عهلمانی، ئیسلامیی، شیوعیی، كهچی هیچیان جورئهتی ئهوهیان نهكرد، ئهو كێشهیه لهسهر بنهمایهكی "ئینسانی" چارهسهر بكهن، ئهوانه خۆ ئاغا نین ئاگایان له دنیا نهبێ، زۆربهی ئهو وڵاتانه پهرلهمان، حكومهت، قهزایان ههیه، كهچی له مامهڵهكردن لهگهڵ دۆزی نهتهوایهتیی كورد له ههموو شت بچن له مرۆڤ ناچن!

**+ له پاش دهركهوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام له كوردستان، كورد توانی چهندین ئهمارهتی سهربهخۆو نیمچه سهربهخۆ پێك بهێنێو ههوڵی زۆریدا له سهردهمی دهسهڵاتی ئیسلامدا دهوڵهتی میدیا به شێوازێكی دی زیندوو بكاتهوه، بهڵام پیلانی دوژمنانو دووبهرهكیو شهڕی ئیمارهتهكان وایانكرد یهك لهدوای یهك ئهو ئیمارهتانه لهناو بچن، دهتوانیت چۆن به شێوازێكی زانستیانه ئهمهمان بۆ شرۆڤه بكهیت؟**

سەلام ناوخۆش: کورد لە سەردەمی خیلافەتی راشیدی بە ئیسلام ئاشنا بوون، گۆڕینی شێوازی دەسەڵاتو دین هەموو تاکێك بە ئاسانی هەرسی ناکات، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ دەسەڵاتی نوێو دینی نوێ نەسازێ.، کورد ژێردەسەلاتی رۆمی بێزەنتی کە زۆربەی "مەسیحی" بوون، زۆر بێ کێشە بوون، لەگەڵ دەسەڵاتو دینی نوێ، لەناو دەوڵەتی ساسانیش چەندان سەرکردی سەربازیی رۆڵی سەرەکییان بینی لە نوشست پێهێنانی دەوڵەتی ساسانیدا، ئەوانە لەژێرەوە موسڵمان ببوون.

لە هەرسێ دەسەلاتو فەرمانڕەوایی "ئومەوی"و "عەبباسی"و "عوسمانی"دا کورد نەك هەر دەسەڵاتی لەناو ئەو داموو دەزگایانەی دەوڵەت هەبووە، زۆرێك لە میرانی کوردیش لەناوچەی خۆیان میری ناوچەی خۆیان بوون، هەتا ئەو سێ دەسەڵاتە کاریان بە "ئیسلام" کردووە، کوردو غەیرە کورد لە هەرێمی خۆی حوکمداری خەڵکی دەڤەری خۆی بووە، بوونی ئەو هەموو میرنشینە کوردییە لەو سێ قۆناغەی دەسەڵاتی "ئیسلامیی"دا ئەوە دەرخەن کە هیچ ناکۆکیو هەڤدژییەکی نەتەوایەتی لە نێوان دەسەڵاتی "خەلیفە"و میرنشینی کوردیی نەبووە، ئەوەتە لە سەردەمی دەسەڵاتی عەبباسیدا کورد نەك هەر میرنشینی هەبووە، بەڵکو دەسەڵاتی بەسەر شام و میسرو ئەرمەنیا.. هەبووە، حکومەتەکەی سەلاحەددینی ئەیوبی لە زۆر ژێدەر هەر بەناوی "حکومەتی ئەیوبی کوردیی" هاتووە، حوکمی دەسەڵاتی سەلاحەددین هێندە دادگەر بووە بە جۆرێ هەتا "عەرەب"و "تورك"ی ئەوسا بە دەسەڵاتی ئەو رازیبوون، کەچی عەرەبو تورکی ئێستا بە ناسنامەی قەومی کوردیش رازی نین!!

ئەو کوردانەی ئێستا لە میسرو ئوردنو فەلەستین هەن ئەوە پاشماوەی ئەو کوردانەن کە لە سەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبی چوونەتە ئەو شوێنانە، عەرەبی ئەوساش بوونی کورد لە ئوردنو میسرو فەلەستین بە پرۆسەی بەکوردی کردنی وڵاتی عەرەبی تێنەگەیشتوون، هۆکاری سەرەکیش ئەوەیە ئەوسا عەرەبو تورك تووشی پەتای نەتەوە پەسەندی ناسیۆنالیزم نەبووبوون!

به کورتی هەتا خیلافەت خیلافەتی ئیسلامیی بوو هیچ کێشەیەکی نەتەوەیی و ئەتنیکی لەناو خیلافەت نەبووە ئەگەر هەر هەڵگەڕانەوەیەك و یاخیبوونێك لە دژی ئەو دەسەڵاتە کرابێ، هۆکارەکەی نەتەوایەتی نەبووە، کێشەکە کێشەی دەسەڵات و ستەمی هەندێ والی و هەندێ کێشەی ئابووریی بووە.

سروشتی مرۆڤ وایە، کە ناکرێ دنیا هەر ئارامیی و تەهی بێ، ئەمە فەلسەفەی مێژووی مرۆڤە، هەبوونی ململانێ و یەکتر قەبووڵ نەکردن و شەڕ بەیەکتر کردن، راڤەی دەروونی مرۆڤ دەکەن، لەولاش دوژمنانی ئیسلام ئەمەیان پێ هەزم ناکرێ، هەربۆیە ئەوەیان پێیان کرا لە رێگای شەڕی خاچپەرستی کردیان، هەرچەندە لەو شەڕانە نەیانتوانی تەواو ئاکامە ستراتیژییەکانی خۆیان بپێکن، لە پاشان تاکتیکی وروژاندنی نەتەوایەتی، ئایینی و مەزهەبی کاریگەریی خۆی کرد، شتەکان هێندە ئاڵۆزبوون هەتا برایەکانیش یەکتریان نەخوێندەوە، شەڕی "مەئمون"و "ئەمین" لەسەر چی بوو؟! ئەو هەموو بنەماڵە میرانەی کورد لەسەر چی یەکتریان تیرۆر دەکرد؟! رووخانی هەر میرنشینێکی کوردی هێندە زاتی بووە، فاکتەری دەرەکی ئەو کاریگەرییەی لەسەر رووخانی نەبووە.

لەناو خودی یەك بنەماڵەدا چەندەها کێشە لەسەر دەسەڵات و سەروەت و سامانی میرنشینەکە هەبووە! هەر لە ناو خودی میرنشینەکەش چەندەها کێشەی جەرگبڕی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەبووە، هەروەها هیچ تاکێکی کورد جگە لە ئەندامانی بنەماڵە بۆیان نەبووە ببنە "میر"! میرو میرزادەکانی کورد زۆربەی هەرە زۆری دەرەبەگ و موڵکدار بوونە، ئەو دەسەڵاتە سیاسیی و مادییە وایلێکردوون خەڵکی عەوام تەنها مافی رەعیەتی هەبێ نەك دەسەڵاتی سیاسیی! ! لەناو عەوامی خەڵکدا رێژەی خوێندەواری هێندە کەم بووە، وێنا ناکرێت، کەچی میرزادەکان وەك خەڵکی عەوامی خۆیان نەبوون، چ لە رێگای مەلاو شێخی خۆیان چ لەو مەدرەسانەی لە بەغداو ئەستەمبوڵ و تەبرێزو تەهران هەبوون خوێندوویانە، لەناو کورددا چەند میری رووناکبیری وەك میر شەرەفخانی بەدلیسی هەبووە دەسبەرداری میرایەتی بێت وخەریکی نووسینەوەی مێژووی کوردو کوردستان بە گشتی و میرانی کورد بێت؟! ئەو کێشەی ناو ئەندامانی بنەماڵەی میر، میرو

خەڵکی عەوامو میر لەگەڵ میری دی ، فاکتەری لاوازیو روخاندنی ئەو میرنشینانەی هەر سێ سەردەمی ئومەوی و عەبباسی و عوسمانی بوونە . هۆکارێکی تر خیانەتی ئەندامانی بنەماڵەیەك (باوك)و (کوڕ)، (مام) یان (ئامۆزا) لە دەسەڵاتی کوردیو پەیوەندیکردن بە دەسەڵاتی بەغدا یان ئەستەمبوڵ وایکردووە ئەو میرنشینە بڕوخێ! لەولاوەش بە حوکمی ئەوەی ناوچەی کوردی بە بەرهەمتر بووە لە هەندێ ناوچەی دی دەوڵەت کورد ئەوەندەی ئەرکی لەسەر بووە، هێندە مافی نەبووە ،بە شێوازێکی تر، تاکی کور بەدەست (ئاغا)و (دەرەبەگ)و (میر)ی کورد دەچەوسایەوە، چونکە دەبوو سەرانە بدات، لەولاشەوە دەسەڵاتی بەغدا یان ئەستەمبوڵ باجی دەوڵەتی دەویست، ئەو باجەش هەر خەڵك دەیدا ! !

لەو پێودانگەوە عەقڵی میری کورد هێندە گەورە نەبوو بیر لەوە بکاتەوە کە ئەویش "دەوڵەتی" هەبێ و لەسەر بنەمای دابی کۆچەری هەر خەریکی فراوانکردنی قەلەمڕەوییەکەی بوو، نەك لەگەڵ میرێکی تر یەکبگرێ و ببێتە هێزێكو دەسەڵاتی بەغدا یان ئەستەمبوڵ حسێبێکی بۆ بکەن، هەتا لە سەردەمی ورووژاندنی هەستی نەتەوایەتی سەدەی نۆزدەهەم هەرسێ میرنشینی (سۆران)، (بابان)، (بادینان) ئەوەندە مژۆڵی ململانێو شەڕی یەکتر بوون، هەرگیز کاریان بۆ ئەوە نەکردووە دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنن، میری سۆران میر موحەممەدی ڕەواندزی هەر کە هاتە سەر حوکم کوشتاری لەناو بنەماڵەی خۆی دەستپێکردو ململانێو شەڕی میری بادینانی دەکرد، کەوتە قڕانی ئێزیدییەکان، هەرچەندە ئەمە لە ئاکامی ستەمی میری بەزیدیان لە بنەماڵەکەی مەلا یەحیای مزوری بوو، میر عەقڵی دامو دەزگای نەبوو، لۆژیکی میر لۆژیکی هێزی چەکداریی بوو، ئەو لۆژیکەش لەگەڵ لۆژیکی دەوڵەتکاریو سوپای نیزامی جگە لە هەرەشەو نوشست هیچی تری لێ پەیدا نابێت ! کارەساتەکە لەوەدایە رووخانی هەر میرنشینێکی کوردی دەروازەیەك بووە بۆ رووخانی ئەویتر !

**+مێژووی دوورو درێژی کورد وابووە سەرکردە و دەسەڵاتدارەکانی میرنشین و شۆڕش و راپەڕینەکان کەسایەتی ئایینی بوون، ئایا بۆچی ئەمانە نەیانتوانیوە**

**تەنانەت لە ژێر کاریگەریی ئایینیشدا بێت، بیر لە پرۆژەیەکی سەربەخۆ خوازیی بۆ نەتەوەکەیان بکەنەوە؟**

سەلام ناوخۆش: کەمێك لە میرانی کورد کەسانی ئایینی بوون، بەڵام زۆربەی زۆری سەرکردەکانی شۆڕش‌و راپەڕینەکان شێخ و مەلاو سەیید بوون.

زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەی ئەو شۆڕشانە تەنیا لە چوارچێوەیەك‌و رەهەندێکی ئایینەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئایین کردووە، کەمێك لەو سەرکردانە خاوەنی حزب یان کۆمەڵە بوونە، ئەوانەی رووی دەرەوەی شۆڕشەکە بوون‌و ناسراوی‌و کاریگەرو باکگراوندی بنەماڵەیی‌و هەبوونی موریدو سۆفی‌و پیاوانی عەشیرەت هۆکاری دروستبوونی ئەو جۆرە سەرکردانە بوون!

هیچ یەکێك لە عوبێدوڵڵای نەهری، مەلا سەلیم، شێخ سەعیدی پیران، سەید رەزای دەرسیمی، عەبدولسەلامی بارزانی، شێخ مەحموودی حەفیدو قازی موحەممەد، جگە لە تێگەیشتنێکی تەریقەتی بۆ ئیسلام تێگەیشتنێکی تریان بۆی نەبووە، بەواتای ئەوانە بە مەنهەجی ئیسلامیی، ئیسلام نەبۆتە پلاتفۆرم بۆیان! ئیسلام وەك هاندەرێکی رۆحی بۆ هاندان‌و وروژاندنی خەڵك بۆ شۆڕش بەکار هاتووە، لە لایەکی تریش ئەوانە دەسەڵاتێکی دینی سەد لەسەدیشیان نەبووە، ئیسلام هیچ تێکەڵ بە سیاسەت نەکراوە، دین هێندە کاریگەری لێکردوون کە شەڕی (ئینگلیز)و (رووس)ی پێ بکەن، یان هەر کە دەسەڵاتی دەوڵەت لە دین هەڵگەرابێتەوە وەك ئەوەی مستەفا کەمال لە تورکیا کردی!

لەوەدا دەردەکەوێ کە ئیسلام تەوزیف نەکراوە وەك "دینێکی سیاسیی، کۆمەڵایەتی"، هەروەها ئەو حاڵەتە نەخوێندەوارییەی کە زۆربەی ناوچە کوردییەکانی گرتبووە، فاکتەرێکی تر بوو بۆ ئەوەی دین هەر ئەوەندەبێ کە لە لای مەلایەك، شێخێك، یان کۆلکە مەلایەکی گوند بێت، خۆم بەدووری نازانم کە دووری رووناکبیری دینداری کورد لە شارەکان‌و پایتەختەکانی بەغدا، ئەستەمبووڵ، تەهران، هۆکاری تر بێت، دین هەڵنەقۆزرێتەوە بۆ ئاراستەکردنی خەڵك‌و کۆکردنەوەی خەڵك لە کیانێکی کوردیدا.

كورد هەموو شتی لە قەیراندا بووە، ناسیۆنالیزمی كوردیش هەر لە قەیراندا بووە، هەروەك چۆن دەسەڵاتی دینی كوردو كەسایەتییە ئاینییەكان وەك تورك‌و عەرەب‌و فارس كاریان لەسەر دین نەكردووە، ناسیۆنالیزمەكەش هەر ئەوها هەژار بووە بە جۆرێ ئەگەر فاكتەری دین نەبووایە، ئەوانە نەیاندەتوانی هەر ئەو چوارچێوەیەش وەربگرن، هەروەك چۆن میرانی كورد، هەرگیز یەككگرتوو نەبوون، بەڵكو هەوڵیشیانداوە دەسەڵاتی یەكتر لاواز بكەن، كام لەو شێخ‌و مەلایانەی سەركردایەتی شۆڕشیان كردووە هاوكاری یەكترییان كردووە ؟!

ئەدگارێكی بنەڕەتی ئەو شۆڕشانەی كورد بێ مەنهەجی بووە، ئەوەی رێكخستن بووە كورد نەیبووە لایەنە عەسكەرییەكە زۆربەی بە دەست (ئاغا)و (دەرەبەگ)ەكان بووە، ئەوانەشی بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆیان هێندەی بیریان لە بەرژەوەندیی بنەماڵەو عەشیرەتی خۆیان كردووە، هێندە پەرۆش نەبوونە بە دۆزی كوردەوە، كاریگەریی شێخ‌و مەلا شۆڕشگێڕەكان بەسەر ئەو عەسكەریانە سنووردار بووە ، بە واتای هیچ یەكێ لەو سەركردانە نەیتوانیوە هەتا ئاغایەك یان دەرەبەگێك بگۆڕی! ئەمەو دەسەڵاتی ئەو شێخ‌و مەلایانە بەقەد دەسەڵاتی ئاغاو دەرەبەگ‌و سەرۆك عەشیرەتەكانەوە نەبووە، هەر بۆیە ئەو سەركردە دیینیانە هەر ئەوەندەیان پێكراوە، هەڵگیرسێنەری شۆڕش بن‌و بەشێك لە خەڵكی دەوروبەریان ئاڕاستە بكەن! هەر كە شۆڕش بەرەو لاوازی چووە زۆرێك لەو سەركردە عەسكەرییانە كە بە زۆری سەرۆك عەشیرەت‌و هۆز بوونە، لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیان خیانەتیان لە شۆڕش كردووە، شۆڕشەكەیان بە هەرەس بردووە.

لە لایەكی تریش هەندێ لەو شێخ و مەلایانە لەكاتی دەسەڵاتی مەدەنی وڵاتیشدا بە هیچ جۆرێ هێندە تەكنۆكرات نەبوونە كەسانی شایەن لە دام‌و دەزگاكان دابنێن، نزیكترین شۆڕشی كورد، شۆڕشەكانی شێخ مەحموودە، كە كەسانێكی زۆر لە بنەماڵەكەی شێخ دەسەڵاتدار بوون، هەتا حكومەتەكەی، حكومەتی شێخ مەحموود نەبووە، بەڵكو حكومەتی شێخ قادری برای بووە !

**+ بۆچی کورد لە مێژوویدا نەیتوانی ئایین بکاتە هۆکارێك بۆ دروستکردنی کیانێکی ئایینی مەزهەبی کوردی وەك عەرەب و فارس و تورك کردیان؟**

سەلام ناوخۆش: ئایین لە کن کورد زیاتر شەریعەتو دینداریی بوو، نەك مەزهەبێکی سیاسیی، فارسەکان هەر لەگەڵ ئیسلامبوونیشیان بۆ پاراستنی کولتووری خۆیان شێوازێکیان لە دین لەناو یسلام داهێنا بۆ ئەوەی لە غەیری خۆیان جودا بن، سەفەوییەکان لە ژێر سایەی ئەو دینەیان کەوتنە قەلاچۆکردنی سوننی مەزهەبەکانی ئێران و قاجاریو بنەماڵەی شاو هەتا دەسەڵاتی ئێستا داکۆکی لەو دینە دەکەن، دینەکەشیان تەواو لەگەڵ بیرکردنەوەو هزری کۆنی فارس سازاندووە، مەزهەبگەری لە لای فارس بۆتە (دین)و (نەتەوە)، لەو پرۆسەیەدا توانیویانە خۆیان لە غەیری خۆیان جودا بکەنەوە، ئەو مەزهەبگەراییە ئینتیمای ئایدۆلۆژیشی بەزاندووە، عەرەبەکانیش خۆیان بە میراتگری ئیسلام دەزانن، لە مێژووی سیاسیی خۆیاندا زۆر سوودیان لە ئیسلام وەرگرتووە، بەڵام لە زۆربەی قۆناغەکانی مێژووی سیاسیان زەرەریان بە ئیسلام گەیاندووە، بە تایبەتی لە سەردەمی "ئومەوی"و سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم، لە نەزەر سیاسەتمەدارو بیریاری عەرەبیدا عەرەبایەتیو ئیسلام هاڤدژ نین خەڵکیان وا تەڵقین داوە کە عەرەب لە خەتەر بێ، ئیسلام لە خەتەرە! ئەمەو بە حوکمی ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام (ص) لەناو نەتەوەی عەرەبدا سەریهەڵداوە، ئەوانە باشو خراپیان خۆیان بە (سەیید)و (ئەولادی رەسوڵ) دادەناوە، ئەو تێروانینە قەومییە بۆ دین لە ئاست کوردو گەلانی دی هەر بە بەرژەوەندیی ئەوان بووە! ئەوان نازانن، خەڵك دەزانێ نە پێغەمبەری ئیسلام خۆی عەرەب بووە نە لە پاش خۆیشی هیچ کوڕی لە پاش بەجێماوە تاکو نەوەی لەدوا بەجی بمێنێ، لە نەزەر منەوە ئەو نەزەریە بۆ دین وامان لێدەکات کە ئەو جۆرە ناسیۆنالیستانە بەنەوەی (أبو جهل)و (ابو لهب) دابنێین!

تورکیش لە رێگای ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە توانی بە شێوازیك بێتە ناو مێژووەوە ئەوان دوور لە دین کەسێکی دڕەندەی ئاسیایی بوون، زۆرێك لە خەلیفەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کاریان بۆ ئیسلام کرد، توانییان ئیسلام

بگەیەننە ئەوروپا، ئەو شکۆیەی هەندێ لە خەلیفەکان بووە کولتوورێکی پڕ دەوڵەمەند بۆ تورکەکان.

کورد بەشی هەرە زۆری سوننە مەزهەبن، ئەوانیتر شیعە، کاکەیی، سابیئە، یەزیدی، مەسیحی، هەتا جوولەکەن، کورد لەدوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی میدی نەیتوانیوە جارێکی تر دەوڵەت دروست بکاتەوە، ئەوە لەسەردەمی پێش ئیسلام دەرفەتی مێژوویی بۆ نەڕەخساوە، خۆ لە سەردەمی ئیسلامیدا ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساوە بە هۆی ئەو فاکتەرانەی باسمانکرد نەیتوانیوە میرنشینەکە بکاتە دەوڵەت!

کورد لە خیلافەتی (ئومەوی و عەباسی)و (سەفەوی‌و قاجاری)و (عوسمانی) بەشداربووە لە دەسەڵات، بەڵام، دەسەڵاتدار نەبووە! هەردوو خیلافەتی ئومەوی‌و عەباسی سوننە مەزهەب بوون، هیچ چەوسانەوەیەکی ئایینی‌و نەتەوەیی لە ئارا نەبوو، ئەو ستەم‌و ململانێیەی هەبووە لە سەر بنەمای تر بووە، لەو دوو دەسەڵاتە کورد خۆی بە بەشێك لە دەسەڵاتی دینی‌و سیاسیی دەوڵەت دەزانی، ئاریشەی دەوڵەت‌و هەندێ میر زیاتر لەسەر دەسەڵات بووە نەك دین‌و نەتەوە، لە هەردوو ئیمپراتۆریەتی سەفەوی‌و قاجاریدا کورد باجی مەزهەبیداوە، چونکە بەشێکی زۆری کوردی ناو ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە سوننە بوون، دەوڵەتیش شیعە مەزهەب بوو! لە ئاکامی ئەو ململانێیەدا بەشێکی کوردی ئەو دەڤەرە لە پێناو مانەوەی خۆیان بوونە شیعە!

لەسەدەی نۆزدەو بیست دەرفەتی زۆر هەبوو کورد بتوانێ سوود لە دین وەربگرێ‌و بیکاتە هۆکارێك بۆ دروستکردنی کیانێك، بەڵام لە لایەك کورد کێشەی لەگەڵ سێ نەتەوە هەبوو، هەرسێکیشیان موسڵمان بوون! ئەو سێ نەتەوەیەش مێژوویەکی پڕ سەروەری ئاینییان هەبوو، جگە لەو باکگراوندەی دەوڵەتکاری ئەو سێ نەتەوەیە، هەرسێك لە رووی ژمارەوەش لە کورد زیاتر بوون، سەرانی کوردیش زیاتر لەگەل هاوژیانیدا بوونە، لەگەڵ ئەو نەتەوانە ئەو کاتە کورد لەسەر دین کاریکردووە کە ئەو دەسەڵاتانە لە دین هەڵگەراونەتەوە، شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران ئەوەندەی لە دژی هەڵوەشاندنەوەی خیلافەت بووە هێندە لە

نەزەر ئەوو موریدەکانی هێندە لە دژی ستەمی نەتەوەیی نەبووە، هەروەها هەتا شێخ مەحمود کە ئینگلیز کردبوویە حوکمداری سلێمانی، کەچی نەیتوانی دەستبەرداری کەمالیەکان بێ یان شەڕی ئەوان بکات!

ئەو فاکتەرە مێژووییانەی لە لای تورك و عەرەب و فارس هەبووەو هەیە لە لای کورد نییە! ئەو داگیرکارانە کە شەڕی کورد دەکەن شەڕێکی قەومیی دەکەن، نەك شەڕێکی دینی، هەروەها ئەوە سەد ساڵە حزبی کوردیی حزبی عەلمانییە نەك دینی ـ بە واتای کاردانەوەی کورد بەرامبەر داگیرکاران قەومیی بووە، چونکە دەسەڵاتەکە قەومیی بووەو بەشێك لە پیاوانی دینی لە (مەلا) و (شێخ) لە دواوەی شۆڕشەکەوە بوون نەك دەسەڵاتدار بن لەو روانگەوە، فیگەری ئیسلامیی کوردی دروست نەبووە، بە واتای هەم داگیرکاران (کە موسڵمان) بوون، هەم حزبی کوردیی کە عەلمانی بوون رێگربوون لە بەرامبەر ئیستغلال نەکردنی دین لە لایەن کوردەوە وەك عەرەب و تورك و فارس.

**+لە چ قۆناغێکدا رۆحی کوردایەتی و نەتەوەیی لای کورد بووەتە ئایدۆلۆژیا تاوەکو سوودی لێوەرگرتبێ بۆ هەستانەوە؟**

سەلام ناوخۆش: لە دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی میدیا چەند دەوڵەتێك لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی میدیاکان دروست بوون، وەك هەخامەنشینی (ئەخمینی)، ئەشکانییەکان، ساسانی، بوونی ئەو هەموو دەوڵەتە بەو هەموو هێزە شارستانیی و عەسکەرییەوە کوردەکانی بەرەو ئاقارێك برد کە بە ئاسانی بە ئاگا نەیەنەوە، ئەو وشیارنەبوونەوە یاخود قەیرانی وشیاری نەتەوەیی کورد، لە رووێکەوە پەیوەستە بە خودی کورد خۆیەوە، چونکە کورد خۆی کۆچەری و رەوەندی بووە هەتا لە بەراییدا قەبووڵی ئایینی زەردەشتی نەکردووە، خۆی دین دیاردەیەکی حەزاری دەخولقێنێ و خەڵکانی بەرەو کۆمەڵگەیەکی مەدەنی ئاراستە دەکات.

غیابی دین و ژیانی کۆچەریی و رەوەندی کوردیی فاکتەرێك بووە لەو قۆناغەی پێش ئیسلام کورد نەیتوانی کیانێکی تر وەك ئەوەی میدیا دابمەزرێنێتەوە .

لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامییدا میرانی کورد چەندەها میرنشینی کوردیان دامەزراندووە، هەندێ لەو میرنشینانە ناوچەگەریی بوون تەنها تایبەت بوون بە

ناوچەیەکی جوگرافی وەك میرنشینی سۆران، بۆتان، بادینان.. هەندێکی تر،هەروەها هەندێکیان

بنەماڵەیی بوونە وەك شەدادی، مەروانی، دۆستەکی، ئەو گیانی "ناوچەگەریی"و "بنەماڵەیی"ە بەشێك بووە لە سیستمی ژیانی حوکمداریی کورد، بە نەزەری خۆم لە سەردەمی میرانی کوردیش رۆحی کوردایەتیو نەتەوەیی نەبۆتە ئایدیۆلۆژیاو بیرکردنەوەو بەرنامە، هەر شاعیرێکی وەك ئەحمەدی خانی لە "مەمو زین"دا ئەو راستییە ئاشکرا دەکات کە دەسەڵاتی حوکمداریی کورد ـ میرانی کورد ـ هێندە بە پەرۆشی خەمی کوردیی "دۆزی کوردی" نەبوون، ئەوەندە عەشایەرو ناوچەگەر بوونە، نیو هەندە بە ئاقاری مەسەلە نەتەوەییەکاندا نەچوونە، هەتا لە سەردەمی بەرەو هەرەسی دەوڵەتی عوسمانی (ئیتیحادوتەرەقی) ئەو رۆحە کوردییو کوردەوارییە وەك دۆزی نەتەوەیەك لە ئەدەبیاتی رووناکبیرانی کورددا نەبووە، ئەوەتە کەسێکی وەك موحەممەد ئەمین زەکی مێژوونووس دەنووسێ"هەتا تورکو عەرەب نەیانگوت تورکو عەرەبین، ئێمە هەر دەمانوت "عوسمانین"! بەواتای رۆحە کوردایەتییەکە وەك "کاردانەوەیەك" دروست بووە! نەك وەك پێویستییەکی مێژوو، رۆحە تورکایەتییەکەی تورك تورکەکانی بە ئاقارێکدا برد کە دەستبەرداری بەشێکی زۆری دەوڵەتی عوسمانی بین، ئەو دەستبەردارییە راستە وای لە تورك کرد تەنیا لە وڵاتی خۆی و بەشێك لە خاکی کورد بگیرسێتەوە، رۆحە عەرەبایەتییەکەی عەرەب هەتا "شۆڕشی گەورەی عەرەبی" لە ژێر ئاڵای ئینگلیز لە دژی دەسەڵاتی خەلیفە بەرپا کرد، بەڵام عەرەب بەو شۆڕشە لە وڵاتی خۆی و بەشێك لە خاکی کورد لە سوریاو عێراق کیانی عروبەی خۆی دامەزراند! !

لەو روانگەوە، بەرای من تەنها ئەو کاتە دەسەڵاتی حوکمداریی کوردو رووناکبیری کورد کوردایەتی کردە ئایدۆلۆژیا بۆ هەستانەوە کە هەموو برا هاودینەکانی بە پاڵپشتی رۆژئاوا فێڵیان لێکردو خۆیشیان وەك "یەکەیەکی یەکگرتوو" لە حزبو رێکخراوێکدا کۆ نەبوونەوە بۆ ئەوەی وەك تورکو عەرەب بتوانن بەو گیانە پارێزی لەو گیانە کوردەوارییە بەرنامەیەك بۆ داگیرکارو دژەکانی

خۆیان دابڕێژن، ئەوەتە ئەو هەموو شۆڕش و ڕاپەڕینەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان بەرپا بوو، هەست بەو وجودە مەعنەوییەی کوردایەتی ناکرێ!

ئەو شۆڕشانە بە "شۆڕشێکی میللی" و "هاکەزایی" دەچن، ئەو پەرتەوازەییە هەر لەسەر جۆری بیرکردنەوەی تاکی کوردو دەسەلاتی حوکمڕانی کورد لە میرو ئاغاو دەرەبەگ سەرچاوەی گرتبوو، گومانی تێدا نییە کە ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە دژی چەوساندنەوەی نەتەوەیی لە قەدەغەکردنی زمانی کوردیی و ناسنامەی کوردیی و خوێندنی کوردیی هەتا "قرانی" کوردیی بووە، بەلام هەر هەستانەوەیەك مەحکوم بووە بە نسکۆیەك و پاشاگەردانییەك، چونکە نە هەستانەوە قەومییەکە خەتی یەکلاکەرەوەی کورد لەگەڵ غەیری کورد بووە، نە ئەو شۆڕشانەش ڕێکخراوو ئامانجی دیار بوون، لە هەمووشی کارەساتتر ئەوە بوو دەسەلاتی حوکمڕانی کورد لە ناوچەگەریی و ڤیگەری عەشایەری ڕزگاری نەببوو. هەرئەو دوو فاکتەرەش وایکردبوو شۆڕشەکان هەر بەناوی کەسەکان یان ناوچەکان بێت وەك شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، شۆڕشی ئاگری داغ، سەید ڕەزای دەرسیمی، شێخ مەحموود، مەلا مستەفای بارزانی ...هتد.

### لە سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی

ئایدیۆلۆژیا لە ڕێگای بزاڤی شیوعیەت لەئێران و عێراق کەوتە ناو کوردەوە. دەرکەوتنی شیوعیەت لەناو کورد لایەنێکی نێگەتیڤ و لایەنێکی پۆزەتیڤی هەبوو. هەر بۆ نموونە، بەحوکمی ئەوەی شیوعیەت ئومەمییە لەسەر "ململانێی چینەکان" دامەزراوە و ناسیۆنالیزم بەجۆرێك لەپاشکەوتوویی دادەنێ، ئەو بزاڤە وایکرد دابەشکردنی کوردستان حەتمی بێت، ئەوان لەسەر یەکێتی خاکی عێراق کاریان دەکردو لەمەلیکی عێراقی مەلیك تربوون. مەلیك سیاسەتی دەکرد و هەرچی شیوعیەت بوو وەك عەقیدەو تەنزیرکردن بۆ فەلسەفەی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و ئابووریی شتی بۆ عێراق دەکرد، ئەوان هەتا لەسەر ئەو باوەڕە کاریان دەکرد کە لە عێراقدا یەك گەل و یەك وڵات هەیە، هەر بۆیە "بلد حر، شعب سعید" شیعاری مەرکەزی ئەو فیکرەیە بوو، زۆرێك لە کوردانیش کەوتنە ناو ئەو گەمەوە هەتا ناویان بە "عێراقچی" چوو بوو، ئەو عێراقچییەتییە لە هەشتاکان

گەورەترین ئینشیقاقی لەناو بزاڤی مارکسیەت لە کوردستان دروستکرد لایەنی پۆزەتیڤی شیوعییەت بوو، کوردی فێری رێکخستنی حزبی دەکرد، ئەوە جۆرە رێکخستنە پێشتر لەناو کورددا هەرگیز بەو جۆرە نەبووە، لەناو ئەو شیوعیانەی کورد کەسانێ دروست بوون کە رۆحی کوردایەتی بکەنە فاکتەری هەستانەوە، ئەمەو کە شیوعییەکان بینییان ئەوە خەریکە شیوعییەت لەناو کورددا رەوتێکی تر وەردەگرێ، کەوتنە هەزار ناوو ناتۆرە لە بزاڤی کوردایەتی، ئەو بزاڤە کوردایەتییەی ناو پارتیو هەستانی شۆڕشی ئەیلوول ئەوەی ساغ کردەوە کە کورد کێشەیەکی قەومی لەگەڵ دەسەڵاتی بەغدا هەیە نەك کێشەیەکی دینی، فیکریی، یاخود تەبەقی، هەر بۆیە لە شۆڕشی ئەیلوول خەڵك ئەوەندەی کوردایەتی دەکرد حزبایەتی نەدەکرد، ئەمەو هەبوونی دوو گروپی هاڤدژ لەناو هەناوی پارتیو (شۆڕش)دا چارەنووسی کوردایەتیی شۆڕشی بە چارەنووسی شۆڕشەکانی دی کورد برد.

وەك تیۆریزەکردنو تەنزیکردن بۆ کوردایەتیی، بە قەناعەتی (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد)و (کاژیك)و لە پاشان (پاسۆك) توانییان کوردایەتی بکەنە ئایدۆلۆژیا، بەڵام ئەو ئایدۆلۆژیایە، چونکە هەڵگرانی لەناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا جێگەیان نەبووەوە سەرکردایەتیی کلاسیکی کوردیش رابەرایەتی رەوتەکەی نەکردن، بۆیە نەیانتوانی ببنە رابەری هەستانەوە، ئەمەو پاشان لەدوای هەرەسی ١٩٧٥ز لە ژێر کاریگەری بەرنامەی "کاژیك"دا لە هەموو حزبێکی تر زووتر هەستانەوە، بەڵام نەیانتوانی ببنە بەدیلی ئەو کوردایەتیەی (پارتی)و (کۆمەڵە)و (سۆشیالیست) کاریان لەسەر دەکرد.

**+ بە وردبوونەوە لە ئەزموونی مێژوویی و بەپێی دەرکەوتە سیاسییە نوێیەکان هەریەك لە دەوڵەتە سەردەستەکانی ئەمڕۆو دوێنێ لە (عەرەب، تورك، فارس) کامیان بە شێوەیەکی رێژەیی ئامادەیی تیایە لە هاتنە پێشەوە بۆ چارەسەری قەزیەی سیاسیی کورد؟**

سەلام ناوخۆش: پەیوەندیی (کوردو عەرەب) و (کوردو فارس) ئەدگارێکی تایبەتی هەیە، لەگەڵ عەرەب مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە، پەیوەندییەکی

دینیو مەزهەبی بە عەرەبی دەبەستێتەوە، لەگەڵ فارس، پەیوەندییەكی (خزمایەتی)و (زمان)یی بەیەكیەوە دەبەستێتەوە، هەرچی لەگەڵ توركە ئاكامی دەوڵەتكاری دروست بووە، هەروەها دەسەڵاتی بەرایی دەوڵەتی عوسمانی هۆكارێكی تر بووە لە دروستكردنی ئەو پەیوەندییەدا، رێككەوتننامەی سوڵتان سەلیمو مەولانا ئیدریسی بەدلیسیو میرانی كورد سەرەتایەكی باش بوو بۆ تەناهی دەوڵەتی عوسمانیو لابردنی هەڕەشەی شیعەگەریی!

كورد لە (عێراق!) ژمارەی زۆر كەمترە لە توركیاو ئێران، كەچی كوردی ئەو بەشەی وڵات توانیویەتی رێژەیەك لە مافەكانی زیاتر بەدەست بێنێ.

عەرەبی عێراق ئامادەگی زیاتری تێدایە، ئەمەش پەیوەست نییە بە نیازپاكی دەسەڵاتی عەرەبی بەرانبەر كورد، بەڵكو پەیوەستە بەو كێشە مەزهەبییەی لەناو عەرەبی عێراقدا هەیە، هەروەها بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی عێراق كورد بەشدارییەكی سیاسیی لەو كیانەی بەغدا كردووە، هەتا لە سییەكانو چلەكانی سەدەی بیستەم كوردی دەرەوەی دەسەڵاتی بزاڤی رزگاریخوازی كورد رۆڵی بەرچاویان لە سیاسەتی عێراقیدا هەبووە، هەتا (بەكر سدقی) توانی بۆ ماوەیەك ببێتە كەسی یەكەمی عێراق لە رووی عەسكەرییەوە، هەتا توانی حكومەتی عێراقی دابمەزرێنێ، ئەفسەرە ئازادیخوازەكانی چلەكانیش لەناو سوپای عێراقدا كاریگەریی خۆیان هەبووە، هەر ئەمەش وایكرد عەبدولكەریم قاسم لە بەرایی شۆڕشدا دان بە مافی نەتەوەی كورد لە عێراقدا بنێو كورد بە برابەش لەگەڵ عەرەب دابنێ!

لەلایەكی تریش هەر لە بیستەكانەوە كورد لە شۆڕشكردن سارد نەبۆتەوە بە جۆرێ هەندێ شوێنی كوردستان هەیە لە مێژووی سیاسیی دەوڵەتی عێراقیدا سەربازی عێراق نەیگەیشتۆتێ لە شەستەكان بەسەرەوە، كوردی بەشەكانی دی كوردستانیش هاوكاریی بزاڤی سیاسیی كوردستانیان كردووە، بۆیە عەرەب لە رووی عەسكەرییەوە دەرەقەتی كورد نەهاتووە، حكومەتە یەك لەدوایەكەكانی عێراق هەموو هۆكارێكیان بەكارهێناوە بۆ دەمكوتكردنی شۆڕشی كوردییو

سڕینەوەی ناسنامەی قەومی کورد، سێکوچکەی "بەعسی کردن، عەرەبکردن، کۆچ پێکردن" نەیتوانی ستراتیژیەتی عروبە جێبەجێ بکات.

وێڕای ئەمانەش عێراق لە ڕواڵەتدا هەر دژی ئیسرائیل بووەو هەروەها ناوەندی ململانێی هەردوو کامپی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی بووە، کێشەی فارس و عەرەبیش لە عێراقدا، ڕەگێکی قووڵی هەیە، عەرەبی سوننە هەر بە گومانەوە لە عەرەبی شیعەی ڕوانیوە، بە جۆرێ لە ساڵی ١٩٢١ ـ ٢٠٠٣ز سەرۆك حکومەتێکی شیعە لە عێراقدا حکومەتی دانەمەزراندووە کە ببێتە سەروەرییەك بۆ شیعەکان ! !

لە بیستەکان بەریتانیا باشووری کوردستانی کردە بەشێك لە عێراقی عەرەبی هەر بۆ ئەوەی ڕێژەی شیعە لە عێراقدا نەبێتە خەتەرێك لەسەر بەرژەوەندییەکانی بەریتانیا !

ئەو هۆکارانە وای لە عەرەبی عێراق کردووە (چ سوننە بە ناچاریی، چ شیعە لە رقی سوننەکان) دان بە بەشێکی مافی کورددا بنێن و چارەسەرێکی سیاسیی مامناوەند بۆ دۆزی کورد بکەن.. هەرچی فارسە چونکە لەگەڵ بەشێکی زۆری کورد دژ مەزهەبە، ئەوە خوێندنەویەکی مەزهەبی بۆ کورد دەکەن، نەك خوێندنەوەیەکی نەتەوەیی، هەرچی تورکەکانن ئەوە لە ئایندەیەکی نزیکدا چاوەڕێی ئەوەیان لێناکرێ ئەو ئامادەگییەیان تێدابێ بۆ چارەسەری سیاسیی دۆزی کورد.

**+ کورد لەم قۆناغەی ئێستایدا دەتوانێت لە کام لە ڕووکانی (ئایین، نەتەوایەتی، عەلمانییەت) بە چارەسەری دۆزی ڕەوای بگات؟ لەلایەکی دیکەوە ئایا ئەم سیانە کامیان زۆرترینی بەشدارییان هەبووە لە نەهامەتییەکانی کورددا؟**

سەلام ناوخۆش: ئەم سێ چەمکە، هەرسێ فرە ڕەهەندن، هەر سێ بە هەندێ تارمایی و لێڵییەوە دەورە دراون، ئایین چی دەگەیەنێ؟ ئایین لە لایەن بابایەکی عەوام پەیوەندییەکی ڕۆحی نێوان خالق و مەخلوقە ! ئەو پەیوەندییە زاتییە لەوەی بابەتی و هەمەلایەن بێت، ئەو تێڕوانینەی شێخ و سەیید و سۆفی و دەروێش بۆ ئایین زۆر جودایە لە بیریار یان لێکۆڵیارێکی ئیسلامیی لەناو کورد، هەتا هەشتاکان کۆمەڵێکی زۆر کەم نەبێ هەر وەك شێخێك یان مەلایەکی کلاسیکی لە ئایین

گه‌یشتبوو، له كوردستان ئایین ئه‌وه‌نده‌ی ته‌ریقه‌ت بووه ئایدۆلۆژیای سیاسیی یان هزری سیاسیی نه‌بووه، ئه‌م دیارده‌یه هه‌تا له نێوان بزاڤی رزگاریخوازی كوردیشدا هه‌ر وابووه، كورد ئه‌وه‌نده‌ی خاوه‌ن ته‌ریقه‌تی هه‌بووه هزرڤانێكی ئیسلامیی نه‌بووه! ئه‌و خاوه‌ن ته‌ریقه‌تانه چ قادریی یان نه‌قشبه‌ندیی یان "ره‌فاعی"، "قه‌ول"، یان دین بووه، موریدو ده‌روێشه‌كانیان ئه‌وه‌نده‌ی پابه‌ندی "قه‌ولی"ی ئه‌وانه بوونه ئه‌وه‌نده پابه‌ندی بنه‌ماو شه‌نگسته‌كانی دین نه‌بوون ! ئه‌و جۆره "دین"ه خێوێكی له‌زه‌ینی تاكی گوندیی كورد دروستكردووه، بۆیه به پێچه‌وانه‌ی چه‌ندان ئایه‌تی "یتفكرون، یعلمون، یدبرون.."، بیركردنه‌وه‌یان له ده‌ره‌وه‌ی ئه‌و بازنه پڕ ته‌لیسمه‌ی دینی شێخ یان سه‌یید بڕی نه‌كردووه !

ئه‌و جۆره "دین"ه شۆڕشی كردووه‌و تاقه‌تی شۆڕشیشی هه‌بووه، به‌ڵام به‌و میكانیزم و عه‌قڵیه‌ته‌وه به‌شی هه‌ر نشوستی بووه، چونكه ئه‌وی به‌رامبه‌ر (دین)و (چه‌مك)و (هێز)و (تاكتیك)ی له‌و به‌هێزتر بووه، ئه‌و جۆره تێڕوانینه بۆ دین هه‌ر "دینداریيه‌كی ته‌قلیدیی" پێده‌كرێ‌و چاره‌سه‌ری دۆزێكی نه‌ته‌وه‌یی پێناكرێ، ئێستا زه‌مه‌ن زه‌مه‌نی ئه‌و شێوازه‌ی دین نییه، دین ئێستا وه‌ك به‌راییه‌كه‌ی شه‌ریعه‌ت، دینداریی، ده‌وڵه‌ت، فیكری سیاسییه، به‌هاو بنه‌ما ره‌سه‌نه‌كانی دینی شامیل راڤه‌و ته‌ئویلی زۆری بۆ كراوه له‌مه‌ش زیاتر، هه‌ر ته‌نیا ته‌یاری عه‌لمانی تاوانبار نییه، به‌ڵكو ئه‌وانه‌ی ئه‌مڕۆ له‌ناو كۆمه‌ڵدا به "ئیسلامیی"یش ناسراون، به‌شێكن له‌و ئاریشته‌و قه‌یرانه‌ی بۆ "دین"یان دروستكردووه ! ! جا ئه‌گه‌ر دین له‌و قه‌یرانه‌ی بۆی دروستكراوه به ده‌ست عه‌لمانیی‌و ئیسلامییه‌كانه‌وه ناتوانێ به ئاسانی چاره‌سه‌ری دۆزێكی وه‌ك دۆزی ره‌وای كورد بكات، ئه‌وه‌ته حزبی ئیسلامیی عێراقی له پێناو پاراستنی رێژه‌ی لایه‌نگرانیان هه‌موو بنه‌ما ئینسانییه‌كانی ئیسلام پێشێل ده‌كه‌ن، بڕیار له‌سه‌ر مادده‌ی (٢٤)ی یاسای هه‌ڵبژاردنی پارێزگاكان ده‌ده‌ن!

ئه‌وان چۆن ده‌توانن چاره‌سه‌ری دۆزی ره‌وای كورد بكه‌ن؟! لێره كێشه‌كه له "دین"دا نییه، به‌ڵكو راڤه‌و ته‌ئویلی ناسیۆنالیستانه‌ی ئه‌و حیزبانه‌یه !

نەتەوایەتی یاخود بیری نەتەوایەتی یان كورد واتەنی كوردایەتی ئەوەندەی دروشمە، ئەوەندە ئامانجێكی ستراتیژی بزووتنەوەی سیاسیی و عەلمانی كورد نییە، هەموو شۆڕشەكانی كورد بە ناوی "كوردایەتی" دەكران، هیچ شۆڕشێكیش سەرنەكەوت! دەبێ كێشەكە لەچیدا بێ؟! كوردایەتی لە لایەن عەلمانییەك یاخود ناسیۆنالیستێك شتێكە زۆر جودایە لەو كوردایەتییەی لە زەینی خەڵكی عەوامی کورددایە!

نەتەوایەتیی لە رۆژئاوا وەك ئەلتەرناتیڤێك بۆ (دین)و (كەنیسە) دروست بوو! هەر كە نەتەوایەتیی هەبوو ئەوا (نەتەوەی باڵا دەست)و (نەتەوەی ژێر دەستە) بوونی هەیە! كورد خۆی لە هەموو بەشە داگیركراوەكانی وڵاتەكەیدا تووشی بە تووشی ناسیۆنالیزمێكی مەدەنی نەبووە هەتا بتوانن بە كەمترین كێشە لەگەڵ یەكتر بژین، بەڵكو بە نەتەوەی باڵادەست هەردەم هەڵگری ناسیۆنالیزمی كولتووریو رەگەزی بووە، كە كوردی لەسەر كوردستان پێ قەبووڵ نەبووەو نییە!

لە جیهانی عەرەبیدا نەتەوایەتیی هێندەی فاكتەری ئاڵۆزكردنی "یەكێتیی عەرەبی" بووە، هێندە هۆكاری تەبایيو تەناهی تاكی عەرەب نەبووە، ناسیۆنالیستەكانی وەك (جەمال عەبدولناسر، حافز ئەسەد، صەددام.. هتد) جگە لە غافڵكوژی رۆحی تاكی عەرەب چی تریان بۆ عەرەب كردووە؟!

عەرەبایەتی لە جیهانی عەرەبیدا چەندەها تەئویلی بۆ كراوە، بە جۆرێ ماركسییەك، دیموكراسیخوازێكو ئیسلامییەك لە بەرامبەر كەمایەتییە دینيو قەومییەكانی ناو وڵاتە زۆرە ملێكانی جیهانی عەرەب خاوەن یەك بۆچوونن، بەڵام بۆ خۆیان هەریەكێ بە جۆرێ تەئویلی بۆ دەكات، لەمەدا زۆر ئاسایی بوو میشیل عەفلەقو خەیروڵڵا توفاح وەك یەك بیر بكەنەوە!

توركەكان زیاتر لە سەد ساڵ مژۆڵی ناسیۆنالیزمی رەش بوون لە ئاكام بە خۆیانو تیۆرەكانیانەوە كەوتنە ناو زبڵدانی مێژوو!

عەلمانییەت، كام عەلمانییەت؟! عەلمانییەت هەتا لە ئەمریكاو بەریتانیا وەك یەك ناخوێنرێتەوە، ئەدی دەبێ لەو دەوڵەتانەی بە زۆرەملێ بەسەر

هاووڵاتییەکانیانەوە سەپێندراون چۆن بێت؟ لە رۆژئاوا کە دین جەوهەرو ئەرك و بوونی خۆی لەدەستداوە بووە بە ئالیەتێك بۆ چەوساندنەوەی مرۆڤەکان لە بەرامبەردا سیاسییو رووناکبیرانیان بیریان لە سیستمێك کردەوە کە هیچ پەیوەندیی بە "دین"ەوە نەبێت، ئەو خۆبەریکردنە لە دین لە هەردوو ئەوروپادا تەئویلی جودای بۆ کرا، ئەو دەوڵەتانەی کە ناسرابوون بە ئەوروپای رۆوژهەلات وەك ولاتانی یەکێتیی سۆڤیەت تەواو لە دین جودا بوونەوە، تەواو بە پێچەوانەی فیترەتی ئینسانیی خۆیان خودایەکی وەهمییان بۆ خۆیان دروستکرد، ئەو ولاتانە لە بەرامبەر ئیستیعماری رۆژئاوای سەرمایەدار وەك گەلای پاییز یەك لەدوای یەك رووخان !

لە غیابی دینو ئیلحادی شیوعییەتدا عەلمانییەت لە ئەوروپای رۆژئاوادا جۆرە تەناهیەکی سیاسییو مالّی لەو ولاتانە بەرپا کردووە، بەلام ئەو "تەناهییە رۆحی"یەی مرۆڤ هەر کات پێویستی پێیەتی لەوێ بەدەست ناکەوێ! !

بە تێڕوانینی من ئیسلامی راستو دروست دەتوانێ چارەسسەری هەر کێشەو دۆزێکی سیاسییو کۆمەلایەتیو ئابووریی بکات، بەلام ئەوەی گرنگە کێ ئەو ئیسلامە هەلّدەگرێ، ئەو "ئیسلامە" عیملاقە بە قەزەم هەلّناگیرێ ئەوەی گرنگە هەیبەتو قودسیەتی مرۆڤ پارێزراو بێت وەك چۆن خودا مرۆڤی ئازاد کردووە لەوەی چ بیروباوەڕێك هەلّدەبژێرێ، ئەوەهاش هەڵگرانی ئیسلام مرۆڤ ئازاد بکەن جیهانێکی پڕ رەفاهیەتو تەناهی رۆحی بەرپا دەبێ!

هەرسێك لەوانەی تۆ دەیلێیت بەدەست هەڵگرانی نەهامەتیی بوونە بۆ کورد، بەلام عەلمانییەت زۆرترین بەشداریی هەبووە لە نەهامەتییەکانی کورد لێرەش هەر تەنها عەلمانییەتی داگیرکار بەشدار نییە لەو نەهامەتییە، بەڵکو عەلمانییەتی کوردیش بەشێك لەو نەهامەتیانەی بەردەکەوێ!

**سەرچاوەكان**

أ- پەرتووكەكان:

١- ئازاد مستەفا، نەتەوە و نەتەوایەتی. چاپخانەی شەهید ئازاد، ج٢، ١٩٩٢ز.

٢- ئیحسان نوری پاشا، راپەڕینی ئاگری داغ، كوردستان، ١٩٩١ز، چاپی یەكەم.

٣- حیكمەت محمد كریم، شۆڕشی نەگۆڕو جیهانی گۆڕاو، ١٩٩٠ز.

٤- د. عبد الرحمن قاسملو، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، چاپی دووەم، ١٩٨٠.

٥- درك كینانی كورد و كوردستان، لەندەن، ١٩٧٠ز چاپی ئینگلیزی.

٦- سەلام، دۆزی كورد لە نێوان داچوون و هەڵچوونێكی ناكۆك دا ١٩٢٣- ١٩٩٠ز.

ب- گۆڤار و رۆژنامەكان

١- گۆڤاری پەیامی راستی، ژ-٨- سلێمانی ، ١٩٩٢ز.

٢- گۆڤاری رابوون، ژ-٢-سوید، ١٩٩١ز.

٣- گۆڤاری كادیر، ژ-٢٧- كوردستان، ١٩٩٢ز.

٤- گۆڤاری شەفەق، ژ-١٠- بەرگی یەك، كەركووك-١٩٥٨ز.

٥- رۆژنامەی خەبات، پ. د. ك.

٦- رۆژنامەی كوردستانی نوێ، ی. ن. ك.

٧- رۆژنامەی ئالآی ئازادی، ح. ز. ك. ع.

٨- رۆژنامەی بیری نوێ، ژ-١٠-٦، ساڵی ١٩٧٢ز.

٩- رۆژنامەی هاوكاری.

**سەرچاوەكان**

١- جۆرج بالۆش هۆرقای كێشەی ئەدەب و سیاسەت لە وڵاتە سۆشیالیستەكان. هەولێر، ١٩٩٣ز ئەو كتێبە خۆی ناوی (الأدیب و مفوضي

الشرطة)، محمد حريرى، لە ١٩٩٣ تەرجومەی کردووە و چەند دانەیەکی لێ بڵاو کردۆتەوە.

٢– گۆڤاری المنار، ژ:٦٣، ئازاری ١٩٩٠، ئەو ژمارەیە زۆر بابەتی گرنگی لە خۆ گرتووە وەك: نهايه اللينينيه، المشكله الديمقراگيه فى الدول الَشيراكيه .

٣– گۆڤاری التوحيد، ژ:٧٦، حزيران ١٩٩٥، – الاسلام و الديمقراگيه و الغرب روبن رايى ٧٨–٩٢.

– صراع الليبراليه مع الاسلام، ص ٣٦–٤٣.

٤– سەلام، دۆزی کورد لە نێوان داچوون و هەڵچوونێکی ناکۆکدا، هەولێر ١٩٩٢ز.

٥– ئەنکلز: أصل العائله .

٦– لينين : دەوڵەت.

٧– رۆژنامەی رێگای کوردستان، ژ: ١٨٥، رۆژی ١٩٩٥/١٢/١٢ز.

**پەراوێزەکان**

١ـ رۆژنامەی هاوکاری، د.کمال مەزهەر، پیریسترویکا و کورد.

٢ـ گۆڤاری رابوون، ژمارە ٢، لا١١١.

٣ـ پەراوێزی ژمارە –١–.

٤ـ لێرەدا ئەوە دێنێت بەراوردێکی ئەو بۆچوونە لەگەڵ هەڵوێستی بەعسییەکان سەبارەت بە کوردستانی بوونی شاری کەرکوك بکەین، لە دەفتەری بەعسییەکان کەرکوك شارێکی عێراقییە یاخود روونتر بڵێین عەرەبییە، بەڵام لە راستیدا کوردی نییە؟!، بە کوردی زانینیشی سەبارەت بە بەعس تاوانێکی گەورە نییە؟ بە هەمانشێوە نەخچەوان لە راسیتدا شارێکی کوردییە با هەر سۆڤییەت و سۆڤییەتییەکان بە کوردی بوونی بە تاوان بزانن.

٥ـ رۆژنامەی بیری نوێ، ساڵی ١٩٧٢ز.

٦ـ کورد لە یەکێتیی سۆڤییەتدا، نووسینی کەنداڵ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە سەلام عەبدوڵلا.

٧ـ رۆژنامەی خەبات، نووسینەکەی د. کەمال سەیدۆ قەرەداغی.

٨- سەرچاوەی پێشوو.

٩- درك كینان، كورد و كوردستان ،چاپی ئینگلیزی، لا٤٥.

١٠- گۆڤاری شەفەق ، ژ–١٠– بەرگی یەك، لا:١.

١١- رۆژنامەی بیری نوێ.

١٢- ئازاد مستەفا نەتەوە و نەتەوایەتی.

١٣- گۆڤاری شەفەق، ژ–١٠–لا:٤.

١٤- شۆڕشی نەگۆڕ و جیهانی گۆڕاو.

١٥- شێخ مەحموود لە ٢٠ی كانوونی دووەمی ١٩٢٣ و "٧"ی حوزەیرانی ١٩٢٣ و ٢٧ی تەموزی ١٩٢٣ز سێ نامە بۆ لینین دەنێرێت سەبارەت بە باری كورد و هەڵوێستی كورد سەبارەت بە یەكێتیی سۆڤییەت.

١٦- گۆڤاری (كادیر)ی پارتی دیموكراتی كوردستان.

١٧- تەماشای هەڵوێستی بوكشبان بكە سەبارەت بەوانەی دوو قسەی خێریان بۆ كورد كردووە لە سۆڤیەت "پیرۆسترویكە و كورد".

١٨- لەوانەیە هەندێك بڵێن جۆزیف ستالین جۆرجی بووە، چۆن دەبێت ئەمەی كردبێت. ئێمەش هەر هێندە دەڵێین زیا ئالب كوك كورد بوو، دژی ئەوە بوو پێی بڵێن كورد، هەروەها كوردیشی بە تورك دەزانی یاخود ئایا تەها یاسین رەمەزان و تەها محێدین مەعروف كورد نین و كورد بە عەرەب دەكەن!.

١٩- رۆژنامەی ئاڵای ئازادی، زەحمەتكێشانی كوردستان.

٢٠- سۆڤییەت بە مەرج سوپای سووری لە كوردستانی ئێراندا كشاندەوە. ئەو مەرجەش ئەو رێكەوتنەس ستالین/ قەوام سەڵتەنە بوو. هەروەك لە دەقی رێكەوتنامەكەدا هاتووە:

١- لەشكری سووری سۆڤییەت لە رۆژی ١٩٤٦/٣/٢٣ز تا مانگ و نیوێك خاكی ئێران بە جێ دەهێڵێت.

٢- شیركەتێكی تێكەڵی نەوتی ئێران و سۆڤییەت پێكدێ لە ١٩٤٦/٣/٢٣ز هەتا ١٩٤٦/١٠/٢٣ز.

رێكەوتنامەكە لەسەر ئەم شیركەتە بۆ پەسەندكردنی دەدرێ بە مەجلیسی پازدە. بە پێی ئەم رێككەوتنامەیە دانرا بوو شیركەتێكی تێكەڵ بۆ ئەم مەبەستە پێك بێ كە ماوەی (٥٠) ساڵ لە ناوچەكانی شیمالی ئێران نەوت دەربێنێ. لە ٢٥ ساڵی یەكەمدا بەشی ئێران ٤٩٪ قازانج و بەشی دەوڵەتی سۆڤییەت (٥١٪) بوو. لە پاش (٢٥) ساڵ قازانجی هەردوو لا دەبوو بە (٥٠٪). بە دوای تەواو بوونی (٥٠) ساڵەكە ئێران دەیتوانی بەشی سۆڤیەت بكڕێ و هەموو شیركەتەكە بكا بە هی خۆی. "لە ئاكامدا لە (١١)ی كانوونی یەكەمی (١٩٤٦ز) حكومەتی ئازەری ئاشبەتاڵی لێكرد و حكومەتەكەی كوردستانیش لە ١٢ی هەمان مانگدا بڕیاری شەڕنەكردنی راگەیاند. دوای ئەوەی ئەرتەشی شۆڤێنی ئێران هەردوو كۆمارەكەی رووخاند. ئێران لە (٢٣)ی ئۆكتۆبەری (١٩٤٧ز) رێكەوتنامەكەی پێشووی، ستالین—قەوام سەڵتەنە،"بەشتێكی هەروا بزانە نەبووە"دانا .

٢١ـ گۆڤاری رابوون، ژ—٢—لا:٣٢.

٢٢ـ گۆڤاری پەیامی راستی، ژ—٨—لا ٣٨،٣٦.

٢٣ـ لازاریف، وەرگێڕانی سەعد عەبدوڵڵا، ئەو هۆكارانەی مەسەلەی كورد پێك دێنن، هەولێر، ١٩٩٢ز.

٢٤ـ دكتۆر جرجیس حسن، تركیا في الأستراتجیة الأمریكیة بعد سقوط الشاه، ١٩٩٠.

٢٥ـ كرۆنۆلۆجی مەسەلەی مووسڵ، نووسنی كمال ئۆقە، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە سەلام ، هەولێر ١٩٩٣ز.

٢٦ـ جەمال نەبەز، دۆزی ناسیۆنال كورد، سوید، ١٩٨٥.

٢٧ـ Kurdistan News No ٨ Nov. ١٩٩٣.

٢٨ـ رابوون، ژمارە —٦—.

٢٩ـ د.عبدالرحمن قاسملوا، چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی، ج٢—١٩٨٨ز.

٣٠ـ سەرچاوەی پێشوو.

٣١ـ سەلام، دۆزی كورد لە نێوان داچوون و هەڵچوونێكی ناكۆكدا، هەولێر، ١٩٩٢ز.

٣٢- لازاریف ئەو هۆکارانەی.

٣٣- د.جرجیس حسن، ترکیا ڤی...

٣٤- گۆڤاری رابوون، ژمارە -٢-.

٣٥- کتێبی العراق دوله منقمه السریه.

٣٦- Kurdistan News No. ٢ May ١٩٩٢

٣٧- کتێبەکەی ئاسمی رەباتی.

٣٨- ئەو بڕیارەی ئەنجوومەنی ئاسایش زێتر تایبەتە بە لایەنی مرۆڤایەتی نەك سیاسیی، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردستان وڵاتێکی داگیرکراوە هەر بڕیارێکی لەو بابەتە دەکرێ لە داهاتوودا مەسەلەی سیاسییش بگرێتەوە. ئەگەر بێتو سۆڤییەت نەرووخابا، ئەو بڕیارە بێ ڤیتۆی سۆڤییەت نەدەبوو! ئەوەی شایەنی باس بێ، لە پازدە ئەندامی ئەنجوومەن دە دەنگ رازیبوونی خۆیان دەربڕی، فەرەنسا، بەریتانیا، ئەمریکا، سۆڤییەت، سێ دەنگیش دژی بوون: کوبا، یەمەن، زمبابۆی، هەردوو دەوڵەتی چین و هیندیش هیچ دەنگێکیان نەدا.

٣٩- هاوکات لەگەڵ بڕیاری (٦٨٨) سەرانی بەرەی کوردستانی عێراق بەرەو بەغدا کەوتنە رێ بەو نیازەی ئەمجارە سەددام چەندی وەرگرتبێ و چۆنە حوکمی زاتی بە کورد بدات.. لە پاشان هەندێك لە سەرانی رۆژئاوا کەوتنە نەقدکردنی سەرانی کورد، دەیانووت ئەگەر ئێوە نەچوونایەتە بەغدا ئەوا لەوانە بوو هەڵوێستی رۆژئاوا سەبارەت بە کورد باشتر بووایە، بەڵام لە راستیدا ئەمە هەر وەك ئەحمەد بەگی جاف واتەنی هەر "قسەت رووت" بوو ئەگەر نا مەسەلەی گفتووگۆ کردن یەکێك لە خاڵەکانی بڕیاری (٦٨٨) بوو.

٤٠- کوردستانی بندەستی ئێران لە پەیمانی زەهاوی (١٦٣٩ز)ەوە لە ژێر دەستی ئێراندایە. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی تەنیا کوردستانی عوسمانلی: کوردستانی باکوور و باشوور و رۆژئاوا دابەشکرا!

٤١- لەبەرایی راپەڕینی ١٩٩١ز سەرانی شیعەی باشوور بە ئاشکرا دەیانووت دەبێ حوکمی ئایندەی عێراق لە ژێر دەسەڵاتی شیعەکانی باشوور بێ، چونکە ئەوان زۆربەی دانیشتوان پێکدێنن. بە دیدی من هەر ئەو هۆیە بوو عەرەبە

سوننەکانی عێراق، کە لە ساڵی (١٩٢١)ەوە حوکمی عێراق دەکەن دژ بە زوڵمی سەددام رانەپەڕین، چونکە چاك دەیانزانی دەسەڵاتی ئایندەی عێراق لە دەست شیعەکان دەبێ لەوانەیە، ئەوانیش لە سەددام خراپتر بن و دووچاری ململانێی مەزهەبیش ببن.

# نووسەرو لێكۆڵەری ئێرانی ـ عەبدوڵڵا ئەبریشەمی



ئایین و نەتەوەخوازی بۆ گەلی كورد دوو ئامرازی بەهێزی ڕزگارین، بەڵام كورد لە بنەماكانی ڕەوتی یەكگرتوویی دوور كەوتۆتەوە، ئەم باسانەش ئەو ڕاستییە تاڵە دەردەخەن، ئەگەر نەتەوەخواز لەسەر وەلانانی ئایین (ئیسلام) پێ دابگرێ، دیارە ڕزگاری گەلەكەی ناوێ. بەڵكو دەیەوێ بە چەشنێكی دی مافی گەلەكەی پێشێل بكات.

**بەڕێز کاک ئارام عەلی سەعید/ سلێمانی**

لەسـەر پرسـیارەکانی بـەڕێزتان، وەڵامـەکانم ئامـادە کـردووەو بـە ئیمـەیل دەینێرمە خزمەتتان

هیوادارم لەم بارەوە مافی هەر دوولا لە بەرچاو بگیرێ، هەر چۆن بۆ خۆتـان بـە سەلاح دەزانن، دەست بەکارین، ئارەزووی سەرکەوتنتان دەکەم

چاوخشاندنێك بە نووسراوەکە زۆر پێویستە تا هەڵـەی شـێوازی نووسـین ڕاسـت بکرێنـەوە، ئەگـەر دوای ئـەوکارە وێنەیـەکم بـە ئیمـەیل بـۆ بەڕێکەنـەوە زۆر جێـی سوپاسە دیسان بە ڕێزەوە، ئەگەر تـوانیم بەسـەر وەڵامەکانـدا بێمـەوەو هەڵەیـەکم وەبەر چاو هات، سەر لە نوێ تەواوی بابەتەکە دەنێرمەوە.

**عەبدوڵڵا ئەبریشەمی ـ تاران**
**٢٥ جولای ٢٠٠٨**

## ئەبریشەمی لە چەند دێڕێکدا

ـ عەبدوڵڵا ئەبریشەمی لەسەرەتای ساڵی ١٩٣٢ز لە شاری مەهاباد (ساباڵغ) لە بنەماڵەیەکی ناوەندی دانیشتووی شار لە دایکبووە.

ـ قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە مەهاباد و ئامادەیی لە تاران و کۆلێژی دەرمانسازی لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٧ز لە تەورێز تەواو کردووە، (ماوەی ٣٥ ساڵ لەم ڕشتەیەدا کاری کردووە، کە هەشت ساڵی لە کارخانەی دەرمانسازی لە تاران بووە).

ـ لە مێرد منداڵییەوە لەگەڵ گرفتە دڵتەزێنەکانی دەستبەسەری گەلی کورد ئاشنا بووە، هەر بۆیەش لەسەرەتای خوێندن لە زانکۆ لێ وردبوونەوەی لەسەر ئەو بابەتە دەستپێکرد. ئەگەرچی لە سەردەمی ڕژێمی شایەتیدا بە دەگمەن دەیتوانی بابەتێك لەمەر کورد بنووسێ، بەڵام لە سەرەتای دەستپێکی شۆرشی گەلانی ئێرانەوە بێ وچان دەستی لە نووسین بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتانەی پێوەندیان بە کێشەی کوردەوە هەیە نەکێشاوەتەوەو تا ئێستا چوار کتێبی بە زمانی فارسی نووسیوە:

١- مبانی فرهنگی دولت، ١٣٧٠، بنەمای کولتوری دەوڵەت، (چاپی تاران)، ١٩٩١.

٢- نقد و بررسی ناسیونالیسم، ١٣٧٤، نەتەوەخوازیی (چاپی تاران)، ١٩٩٤ (ئەو کتێبە لەلایەن کاك سەلاحی ئاشتی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی)/

٣- مسألەی کرد درخاورمیانە. نشر توکلی ١٣٧٨، تاران، پرسی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێرانی عەبدوڵڵا ئۆجالان، چاپی تاران، ١٩٩٩.

٤- هویت تاریخی و مشکلات کنونی مردم کرد، تاران، ١٣٨٥ نشر آنا، هەویەتی(ناسنامەی) مێژوویی و گرفتەکانی ئێستای گەلی کورد، (چاپی تاران)، ٢٠٠٦ (ئەو کتیبە لە ڕەدی نووسراوە هەڵخەڵەتێنەکانی نووسەرانی ئێرانی سەبارەت بە کورد دایە).

ـ پتر لە (٣٠٠) وتاریشی بە زمانی فارسی هەیە و پتریان لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان دا بڵاو بوونەوە. لە چەند ساڵی دواییدا وتارگەلێکی بە زمانی کوردی لە سایت، رۆژنامە و بڵاڤۆکە کوردییەکاندا بڵاو کردۆتەوە.

**+ بە بۆچوونی تۆ دروستکردنی دەوڵەت لە سەر کام لەم بنەمایانە: نەتەوەیی یان ئایینی یان لە سەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەشی کۆمەڵێك نەتەوە لە چوارچێوەی وڵاتێکدا دروستە بونیاد بنرێت؟**

ئەبریشەمی: بەشی دوایی پرسیارە کە دروستە کە بنەمای دێموکراسی بۆ دامەزراندنی دەوڵەت دەگرێتەوە. لە وڵاتە دواکەوتۆکان، بە پێکهاتنی دروشم و سەمبولی دێموکراسی وەك دەوڵەتی دامەزراو لەسەر بنەمای دەنگدان و پارلەمان، وا نیشان دەدرێ کە لەم وڵاتانە دێموکراسی وەگەڕ کەوتووە. بەڵام بەکردەوە دەردەکەوێ کە سەمبولەکانی دێموکراسی وەك عەبایەك بەسەر ڕەوتی نادێموکراتیك کێشراون. دەنگدان و پارلەمان، هۆکارێکن بۆ شەرعییەتدان بە کردەوەی نادێموکراتیك و داگیرکردنی دەوڵەت و سامانی وڵات. ئەو ڕەوتە بۆتە هۆی بێباوەڕی زۆرتری چین و توێژەکانی خەڵك بە شێوازی دێموکراسی. ئەنجامی ئەو بێباوەڕییە، ڕێگای بۆ ڕاستبوونەوەی دیکتاتۆرانی بە نێو "ڕزگاریدەر" خۆشکردووە، لەم وڵاتانە کە خەڵك باوەڕو ناساوێکی ئەوتۆیان لە چەمکی دێمۆکراسی نییە، کێشەو مشت و مڕ لە سەر چلۆنایەتی پێکهاتەی دەوڵەت ڕەوتێکی ئاسایی دەژمێردرێ. ڕوانگەیەك لەسەر بابەتگەلی باسەکە:

دەوڵەت دەسەڵاتی گشتی و سەربەخۆی وڵات بە دەوڵەت دەناسرێ. لە چەمکی دێموکراتیکی هاوچەرخدا، گشت خەڵکی وڵات (هاونیشتمان، شاروەند) مافی دنگدان و هاوبەشی لە پێکهاتن و دەستگۆڕی کەسایەتێکانی دەوڵەتیان هەیە بۆ پاراستنی ئەو پێکهاتەیە لە گەندەڵی و سەرەڕۆیی کاربەدەستان، چەند هۆکار لە گەڕدان وەك بەرپرسی بەڕێوەبەرانی دەسەڵات، ماوەی دیاریکراو بۆ تەمەنی دەوڵەت، ئازادی لێکۆڵینەوە لە کردەوەی کاربەدەستان و ئاراستەکردنی ڕەخنەو تاوان سەبارەت بە ئەوان. بەڵام لە وڵاتە وە دواکەوتۆکان دەوڵەت وەك دەسەڵاتێکی داسەپاو خۆدەنوێنێ‌و بەویستی خەڵك گۆڕانی بەسەر دانایە. ئەو دەوڵەتانە سەرەڕۆن و لە گەندەڵی ئاخندراون. ڕەخنەگرتن و تاوانبارکردنی دەوڵەت و دەسەڵاتدارەکان، مەترسیدارە.

وڵات (Country)، مەڵبەندی دەسەڵاتی دەوڵەت وڵاتە. قەوارەی وڵات لە ئەساسدا دەبێ بە ویست و بەرژەوەندی دانیشتوانی ناوچەکە پێکبێ. لە حاڵێکدا قەوارەی بەشێك لە وڵاتان، لە ڕابردوو دا بە ملهۆڕی پێکهاتووە، قەوارەی داتاشراوی ئەم وڵاتانە، کێشەگەلی زۆر ئاڵۆزو خوێناوی لێکەوتۆتەوە. بەڵام بەوحاڵەش ئەگەر لەم وڵاتانەدا بنەمای پێکهاتەی دەوڵەت بە هاوبەشی دێموکراتیکی گشت خەڵکی وڵات پێکبێ، دانیشتوانی ئەم وڵاتانە دەتوانن بەیەکەوە بژین و پێکەوە سازگار بن. ڕەوتێکی ئەوتۆ دەتوانێ بەرژەوەندی سیاسیی، کولتوری و ئابووری گشت دانیشتوانی وڵات (هاونیشتمانان) دابین بکات.

ئایین، ئایین وەك دیاردەیەکی "مێژوویی – کۆمەلایەتی" پیرۆزو نەگۆڕ، بریتییە لە چەشنێك بیروباوەڕ سەبارەت بە ناسیاوی مرۆڤ لە خۆی و کۆمەڵگە، گەردوون و بوونەوەر. ئایین بە پێچەوانەی دەوڵەت و سیاسەت، سنوور بەزێنە، بەڵام دەوڵەت لە جەغزی سنووردا قەتیس کراوە. ئایین لە گۆڕان، ڕەخنەو تاوان، پارێزراوە. بەڵام دەوڵەتی هاوچەرخ هەڵگری گۆڕان و ڕەخنەو تاوانە. هەڵبەت ئایین هاوکات لەگەل سەرهەڵدانی وەك دەسەڵاتێك لەسەر تاك و کۆ خۆی نواندووە. لایەنی هەرەبەرزی ئایین لەسەر چلۆنایەتی ڕەفتارو هەڵسووکەوتی بەرەی مرۆڤ سەبارەت بە یەك وەك نەریت و یاسای کۆمەڵایەتی و مافی هەر مرۆڤێك خۆ دەنوێنێ، لەو ڕوانگەوە دەکرێ بڵێین زۆرتری ئایینەکان بە پەیڕەوانی خۆیان دەڵێن: "چیان بۆ خۆیان دەوێ، ئەوەشیان بۆ خەڵکی تر بوێ"، یان هەرکەس پێی خۆشە خەڵك چۆن لەگەڵ وی ڕەفتار بکەن، ئەویش بەو شێوازە لەگەڵ خەڵك ببزوێتەوە، لە دەمارگرژی ئایینی و ڕەدکردنەوەی ئەوانی دی خۆ بپارێزێ. باوەڕو تێگەیشتنێکی ئەوتۆ لە ئایین، باشترین نەریتی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییە. دیارە بڕوای ئایینی بە ئاشکرایی و بە نەهێنی، بەرەی مرۆڤ لە کردەوەی دژ بە یەك دەپارێزێ. بەڵام ئەو چەمکە بەدەگمەن لە ئاییندارەکان دیتراوەو دەبیندرێ. پێویستە ئەوەش بڵێین: بەشێك لە بەرەی مرۆڤ بە پێی پەروەردەبوون، بەبێ بڕوایەکی ئەوتۆ بە شەرع و ئایین، بە نهێنی و بە ئاشکرایی خۆیان لە کردەوەی دژ بە مرۆڤایەتی دەپارێزن[1].

ئایین جیا لەوەی وەك دەسەڵاتێکی نەدیار لەسەر تاك و کۆ خۆ دەنوێنێ، لە گەڵ نەریت، ئەخلاق و مرۆڤایەتی تێکەڵاوی هەیە. "تێگەیشتن و لێکدانەوەی مەبەستەکانی ئایینی" بە درێژایی مێژوو ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووەو بەسەری دێ. دیارە دەوڵەتی هاوچەخ دەبێ ئازادی بیرو ئایین بۆ تاك و کۆ پێك بێنێ. دەسەڵاتی دەوڵەت پێرۆز نییەو بە ویستی خەڵك گرێدراوە، بەڵام دەسەڵاتی ئایین پیرۆزەو لە دەرەوەی ویست و دەسەڵاتی خەڵکە.

بەشێك لە ئایینەکان (وەك سێ ئایینی تەوحیدی - مووسایی، عیسایی و ئیسلام)، خودا بە تاکە دانەرو تاکە خاوەنی بوونەوەری دنیاو گەردوون دەناسن، بەڵام بڕوایەکی ئەوتۆ بە خودا لە بازنەی ئایینەکانی ناوبراو تێدەپەڕێ. مێژوو نیشان دەدا لە سەرەتاوە دەوڵەت و دەسەڵاتدارەکان خۆیان بە ئایینەوە گرێداوە، تا لە پێناوی پیرۆز بوونی ئاییندا دەسەڵاتی خۆیان بە پیرۆز دابنێن (تا بەو چەشنە لە ڕەخنەو تاوانبارکردنی خۆیان بەرگری بکەن).

نەتەوە، بە دیاردەیەکی "سیاسیی– کۆمەڵایەتی" دەناسرێ، نەتەوە وەك شاروەند، بە خەڵکی وڵاتێك دەگوترێ کە خاوەنی تایبەتمەندی هاوبەش بن، دەسەڵاتی وڵاتی خۆیان بە دەستەوە بێ، یان بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات، بەیەکەوە هەوڵبدەن. ئەو بابەتانە: نەتەوایەتی، نەتەوەیی، نەتەوەگەری و نەتەوەخوازی، کەڵکی سیاسیان لێ وەردەگیرێ.

(دەوڵەت– نەتەوە)، لەو چەمکەدا، نەتەوە، لەسەر تایبەتمەندێکانی خۆی بە چەشنێك پێدادەگرێ کە دەیەوێ تەواوی دانیشتوانی وڵات (هاونیشتمانان) خاوەنی ئەو "پێناسە"یە بن کە بناغەی (دەوڵەت– نەتەوە)ی لەسەر دامەزراوە، بەڵام لە چوارچێوەی وڵاتێکدا، گشت هاونیشتمانان، ناتوانن خاوەنی ئەو پێناسەو تایبەتمەندیانە بن کە دەکرێتە بنەمای "دەوڵەت– نەتەوە". مێژووی سەد ساڵی ڕابردووی ئەو شێوازە (لە دەوڵەت) نیشانیداوە لە پێکهاتەی (دەوڵەت– نەتەوە)، هاوبەشێکی ئەوتۆی گشت دانیشتوانی وڵات نەدیتراوە، زۆرجار مافی گەلانی جیاواز پێشێلکراوە، هەر بۆیەش زۆرتری (دەوڵەت– نەتەوەکان)، کێشەی خوێناویان لێکەوتۆتەوە. (هانا ئارنێت)، ئەو چەمکەی لە ناوەڕۆکی بیری فەلسەفی خۆیدا

جێكردۆتەوه كه دەڵێ " رابطه دولت– ملت، بدیل غاصب دولت– شهروند شدەاست"[٢]، له دەوڵەت– نەتەوەدا مەبەست له بابەتگەلی وەك هەستی نەتەوایەتی، نەتەوەیی، نەتەوەگەری و نەتەوەخوازی، تایبەت به پێناسەی نەتەوەی باڵادەستە. ڕژێمێكی ئەوتۆ گشت هاونیشتمانانی وڵات له ڕێزی نەتەوەی باڵادەست دانانێ، هاوبەشی تەواوی هاونیشتمانان له دەسەڵات وەرناگرێ. بەڵام (دەوڵەت– شاروەند)، گشت هاونیشتمانان له ڕێزی نەتەوەی باڵادەست وەردەگرێ.

(دەوڵەت– شاروەند، یان دەوڵەتی نیشتمانی)، زۆرتری دەوڵەتانی دێموكراتی هاوچەرخ داكۆكی لەسەر ڕەگەزو نەتەوەی تایبەت ناكەن. تەواوی هاونیشتمانان بێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەزو ڕەچەڵەك، بەیەك نەتەوە دەناسرێن و له پێكهاتەی دەوڵەتدا بەشدارن، دەسەڵاتی بەشێك له ئەو چەشنە دەوڵەتانە له كۆمەڵێك دەسەلاتی ناوچەیی پێكدێ (فیدرالی). وڵات بەویستی دانیشتوان و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندێكانی هاوبەش به ناوچەگەلی تا ڕادەیەك لێك جیا دابەشكراوە، یان دەوڵەتی ناوەندی له یەككگرتنی چەند دەوڵەتی ناوچەیی لێك جیا پێكهاتووە.

دەوڵەتی دامەزراو لەسەر بنەمای ئیدیۆلۆژیك، دەوڵەتی كۆمۆنیستی، بەرچاوترین وێنەی ئەو چەمكەیە، كه به لەبەرچاوگرتنی ڕێبازی ئابووری– كۆمەڵایەتی بۆ گشت دانیشتوانی وڵات دەیەوێ نالەباری و ناكۆكێكانی كۆمەڵگه لەناو بەرێ، ئەو بیرە له ناوەڕۆكی خۆیدا زۆر عادڵانەو یۆتۆپیایی دەنوێنێ، بەڵام كۆمۆنیستەكان و بەشێك له ڕێكخراوەكانی ترو لایەنگرانیان له مەودای هەڵسووڕاندا خۆیان و ڕێكخراوەكانیان به باوكی خەڵك و تەنیا ڕێنوێنی جەماوەر دادەنێن، ئەوان مافی بیركردنەوە له ڕێبازی جووڵانەوەو بنەمای پێكهاتەی دەوڵەت و بەڕێوەبەری كۆمەڵگه بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لەپاوانی خۆیان دەگرن، مێژووی یەكێتی سۆڤێتی ڕابردوو(هەروەها دەوروبەرەكەی) ئەو ڕووانگەیە دەسەلمێنێ، ئەو ڕەوتە له ئازادی بیرو بۆچوون بەرگری دەكات، ڕێزو بەرژەوەندی تاك و كۆ لەبەرچاو ناگرێ، دژ به دێموكراسی و چەمكی هاوچەرخی دەوڵەت و كۆمەڵگه خۆ دەنوێنێ.

دهوڵهتی هاوچهرخ لهسهر ویست و بهرژهوهندی خهڵك بهڕێوه دهچێ، دهسهڵاتی كاربهدهستان كاتی و دهسهڵاتدارهكان له ڕهخنهو تاوان ناپارێزرێن، دهسهڵاتدارهكان به ویستی خهڵك دهگۆڕدرێن. بهڵام ڕابردوو نیشانیداوه كۆمۆنیستهكان و ڕێكخراوه پاوانخوازهكان كاتێك دهسهڵاتیان بهدهستهوه گرت به ویستی خهڵك ناگۆڕدرێن، له پهلاماری ڕهخنهو تاوان دوور دهخرێنهوه، (وهك ئایین، خۆ به پیرۆز دادهنێن.)

وهك ئاماژهی پێكرا دهوڵهتی دامهزراو لهسهر بنهمای (ئایینی، نهتهوهگهری و ئیدیۆلۆژیك) ناتوانێ تایبهتمهندێكانی دهوڵهتی دامهزراو لهسهر بنهمای دێموكراسی هاوچهرخی ههبێ. له دهوڵهتی نیشتمانی دا گشت دانیشتوان له یهك ڕێز دان، كهس به پێی ڕهگهز و ئایین وهلاناندرێ، مهگهر بیروڕای دژ به ئازادی و لایهنگری ڕهگهزپهرستی بێ. مێژووی هاوچهرخ نیشانیداوه: دهوڵهتی دامهزراو له سهر بنهمای تایبهت به ویستی خهڵك دهسهڵاتداهركان ناگۆڕدرێن و به ئاسانییش ڕهخنهیان لێناگیرێ وتاوانبار ناكرێن، ڕێزو بهرژهوهندی گشت گهلان و دانیشتوانی وڵات لهبهرچاو ناگیرێ.

دهوڵهتی دامهزراو لهسهر بنهمای تایبهت ئهگهر خۆی به دێموكراتیش دابنێ، ناتوانێ تهواو دێموكرات بێ. زۆرتری ئهو دهوڵهتانه (بهتایبهت له وڵاته دواكهوتووهكان)، بهرهو پاوانخوازی دهسهڵات دهڕۆن. ئهوان له دوو كۆڵانهوه دهڕواننه خهڵكی وڵات: ئهوانهی كه خاوهنی پێناسهی تایبهت به بنهمای دهوڵهتن و ئهوانی دی.

جیاوازێكانی پێكهاتهیی دهوڵهت له قهوارهی دێموكراتیك و پێشكهوتووی هاوچهرخدا پیرۆز و ئاسمانی نییه، بهڵكو دنیایی و دهستگۆڕه، ههڵگری ڕهخنهو تاوانه، ئهو جیاوازییه بنهڕهتیانهی ئایین و پێكهاتهی دهوڵهتی هاوچهرخ لهسهر لێك جیابوونیان پێدادهگرێ. سیاسهت و سیاسهتمهدار له بازنهی كات و دهستگۆڕدان. لهحاڵێكدا ئایین درێژخایهن و نهگۆڕه. بهشێك لهو جیاوازیانه دهوڵهتانی دامهزراو لهسهر بنهمای نهتهوهخوازی و كۆمۆنیسم-یش دهگرنهوه. ههڵبهت جیابوونی بنهماو پێكهاتهی دهوڵهت و ئایین، نهتهوهگهری و كۆمۆنیسم

بەو مانایە نییە کە دەوڵەتی دامەزراو لەسەر بنەمای دێموکراتیکی هاوچەرخ دژ بە ئایین، نەتەوەخوازی و کۆمۆنیسم بێ، بەڵام ناکرێ ئەو جیاوازیانە لەبەرچاو نەگیرێن.

دیارە دەوڵەت وەك دانراوەیەکی (سیاسیی– کۆمەڵایەتی) (پێویست بۆ پێشکەوتن و ڕاگرتنی دەسەڵات و بەرژەوەندی گشت هاونیشتمانان) دەبێ ماف و ڕێزی ئایین بەرژەوەندی نەتەوەکان و جیابیران ڕابگرێ، بەڵام ئەگەر دەوڵەت لەسەر بنەمای تایبەت دابمەزرێ، پرۆسەی ڕەخنەو تاوان و کاتی بوون و دەستگۆڕی دەزگای بەڕێوەبەری دەوڵەت، تووشی کۆسپ و تێگیراوی دەبێ. ئەوەش حاشای لێناکرێ ئایین وەك بەشێکی جیا نەکراوە وە لە "بیرو باوەڕ"ی بەرەی مرۆڤ، بە تەواوی لە بنەمای دەوڵەت دەرناهاوێژرێ، بەڵام گشت خەڵکی وڵاتێك هاوئایین نین، یان تێگەیشتن و لێکدانەوەی جیاوازیان لە بابەتگەلی ئایینی هەیە، بۆیە ناکرێ بنەمای دامەزراندنی دەوڵەتی هاوچەرخ لەسەر ئایین بێ. بەکورتی:

١– ئایین لە دەرەوەی دەسەڵاتی کۆمەڵگەیە (پیرۆزو ئاسمانییەو پارێزراو لە گۆڕان، ڕەخنەو تاوانە)، تێگەیشتن و لێکدانەوەی جۆراو جۆر لەسەر بابەتگەلی ئایینی لە ئارادایە.

٢– نەتەوە، گشت دانیشتوانێ وڵاتێك ناتوانن خاوەنی ئەو پێناسە نەتەوایەتیە بن کە دەکرێتە بنەمای دروستکردنی "دەوڵەت– نەتەوە"، هەر بۆیەش دەوڵەتێکی ئەوتۆ ناتوانێ ویست و بەرژەوەندی گشت هاونیشتمانان دابین بکات. بۆ نموونە دەوڵەتی تورکیا وێنەیەك لە دەوڵەت– نەتەوەی "تایبەت" بە گەلی تورکە، ئەو دەوڵەتە تا ئەو دواییانە حاشای لە بوونی گەلی کورد لەو ناوچەیە دەکرد کە نیشتمانی مێژوویی گەلی کوردە، ئاسیای بچووك بەناهەق ناوی تورکیای لەسەر داندراوە وەك دەبینین دەوڵەتی تایبەت بە گەلی تورك کورد بە تورکی کوێستانی دەناسێنێ و مافێك بۆ گەلی کورد قایل نابێ.

٣– ئیدیۆلۆژی، ئەو دەوڵەتانە تەنیا ڕێبازو تێگەیشتنی خۆیان لە بابەتەکان بە خاوەن هەق دادەنێن، خەڵك وەك هۆکارێك بۆ بەجێهێنانی مەبەستەکانی دەسەڵات

بەکار دەبەن. دەوڵەتی دامەزراو لەسەر بنەمای ئیدیۆلۆژیك، جیا لە بەرەی دەسەلاتدار، ماف و کەرامەتی تاك و کۆ ناپارێزێ.

خۆکوژی شێوازێك لە تێگەیشتنی بابەتگەلی زۆرتر ئایینییە. بەلام بابزانین خۆکوژی و ڕەشەکوژی بۆ کام ئامانج وەگەڕ کەوتووە؟ توندوو تیژی و پێداگرتن لەسەر لێکدانەوەی بابەتە ئیدیۆلۆژێکان بە تایبەت ئایینێکان، مرۆڤ بەم ئاستە دەگەیەنێ کە هەق تەنیا ئەو چەمکەیە مورشیدەکانی وی باوەڕیان پێی هەیە، ئەو ڕەوتە لە بیروباوەڕ ئەو شێوازە دزێوەی وەگەڕ خستووە کە بە ڕەشەکوژی دەیانەوێ بە دەسەلات بگەن، بەلام ئەوانەی بۆ داگیرکردنی دەوڵەت و دەسەلات و سامانی کۆمەڵگە، ڕەوتی ڕەشەکوژیان ڕەچاو کردووە، لەسەرەتاوە نیشانی دەدەن ئەگەر بە دەسەلات بگەن چۆن دەوڵەتێك بونیاد دەنێن.

دیموکراسی ڕەوتی باوو پەسەندکراو لە ناو زۆرینەی گەلانی جیهانە، دەوڵەتانێکی زۆریش لە نێوخۆدا بە ڕەوتی دیموکراسی هەڵدەسوڕێن و لەم ڕەوتە پشتیوانی دەکەن، ئەوەش حاشای لێناکرێ کە زلهێزەکان لە دەرەوەی وڵاتی خۆیان ڕەوتی دیموکراسی بە پێوانی " سوودو سەرمایە " بەڕێوە دەبەن، بەلام بۆ گەلێکی بندەسەلاتی وەك کورد پێویستە ڕەوتی دیموکراسی بکرێتە ستراتیژی جوولانەوەکان، خەڵك بە ڕەوتی دیموکراسی پەروەردە بکرێن، چونکە لە دنیای هاوچەرخدا زۆرینەی گەلانی جیهان ڕەوتی دیموکراسیان پەسەندکردووە، هەر بۆیە زلهێزەکانیش ناچارن لە دەرەوەی وڵاتی خۆشیاندا ئەو ڕەوتە " هەرچەندە وەك دەمامکێکیش بێ " لە بەرچاو بگرن!

سەرەتای پێکهاتنی دەوڵەت ئاسەوارە بەر لە مێژوویەکانی دۆزراوە لە مێزۆپۆتامیا نیشان دەدەن دەسەلاتێکی کۆمەلاەتی– ئابوری بونیادنراو لە سەر بیری ئایینی، یەکەم جار لە شارەکانی ئەو ناوچەیە پێکهاتووە، ئەو دەسەلاتە سەر بە مزگەوت (مەعبەد)ی شاربووە. وێدەچێ مامۆستایانی ئایینی (کاهن) بەسەر ئەو دەسەلات و سامانە کە بەئی "خودا" دەناسرا، ڕاگەیشتبن. ئەو دەسەلات و سامانە بەپێی داب و نەریتی تایبەت بە شێوازێك لە چەشنی سۆسیالیستی لە خزمەت خەڵکی وڵات دابووە(٣). لەو بارەوە گوردن چایلد، دەڵێ:

" ئەو نیزامە ئابوورییە کە خودا بە گەورەترین سەرمایەدارو زەمیندار دەناسراو مەعبەدەکەشی ببوو بە بانکی شار بە ڕووناکی سەر وە دەورانی بەر لە مێژوو دەدا"(٤).

داگیرکردنی دەوڵەتی سەرەتایی، کاهینەکان وەك مامۆستای ئایینی لەڕووی "فێربوون و زانست" و بڕوای خەڵك دەسەلات و سامانی شارەکەیان بەڕێوە دەبرد. بەڵام وردەوردە ئەو دەسەلات و سامانە، لەلایەن کەسانێك دەستی بەسەرداگیرا کە خۆیان بە پادشا دادەنا. پادشا پێویستی بە زانست و فێربوونی چەمکی ئایین نەبوو، بەڵام خۆی بە نوێنەری خودا دەناساند. بەو شێوازە پادشا ئایینی کرد بە پشتیوان و پاشکۆی دەزگای دەسەلاتی داگیرکراو، چایلد دەڵێ: " تا ساڵی (٣٠٠٠پ.ز) هێزێکی دنیایی لە پەنا دەزگای خودایی پەرەیگرت کە لەلایەك بە سەرشۆڕی خۆی بە نوێنەری خوداو لەلایەکەی دی بە ملهۆڕی خۆی بە پادشا دادەنا... پادشا بەشی زۆری لە دەسەلاتی دنیایی خودا بەسەر خەڵکدا، زەوتکرد"(٥)، ئەو بۆچوونە (لەمەڕ دەوڵەتی سەرەتایی) بەرهەمی زانستیانەی توێژەران و لێکدانەوەیان لە ئاسەوارە بەر لە مێژوویەکانن(٦).

دیارە ئەو کۆمەڵگەیەی کە توانیبووی دەسەلاتێکی "کۆمەلایەتی– ئابووری" ڕێك و پێك دروست بکات، ئەو کارەی بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگەی خۆی کردبوو (بۆ پێشکەوتن، هاوکاری کۆمەلایەتی، یارمەتی لێقەوماوان، چاودێری و بەرگریکردن لە دەستکەوتەکانی گشت کۆمەڵگەی سەر بە وڵات). ئەو ڕاستییەش حاشای لێناکرێ، کۆمەڵگەیەکی ئەوتۆ مەبەستی لە دامەزراندنی دەزگای دەوڵەت ئەوە نەبووە چەمکێك پێك بێنی بەرژەوەندی خۆی پێشێل بکات، بەڵام دواتر ئەو دەسەلاتە داگیرکراوە، دیارە داگیرکراوی دەزگای دەوڵەت لە بنەمای خۆڕستی پێکهاتەی دەوڵەت جیایە، ئەو گوتە درەوشاوەی مارکس: "دەوڵەت دەزگای سەرکوتگەری چینایەتییە" کردەوەو ڕەوتی داگیرکراوی دەزگای دەوڵەت نیشان دەدا، نەك ناوەڕۆکی پێکهاتەیی دەوڵەت.

لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست پتر لە (٥٠٠٠) ساڵە دەوڵەت داگیرکراوە، لەو ماوە درێژەشدا داگیرکەرانی دەوڵەت خۆیان بە ئایینەوە هەڵپەساردووە، ئەو ڕەوتە

ئێستاش هەر درێژەی هەیەو ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی بەسەردا نەهاتووە بۆ نموونە: با داگیرکردنی دەزگای دەوڵەت لە لایەن حیزبی بەعس لە بەر چاو بگرین، سەدام بەدەستی خۆی لە سەر ئاڵای عێراق دروشمی ئیسلامیی (الله اکبر)ی نووسی، ئەنفالیشی وەك ڕەوتێکی ئیسلامیی بۆ داپۆشینی جینۆسایدی گەلی موسوڵمانی کورد بەکاربرد، نزیك بە (٤٠٠٠) ساڵ لە مەوبەر هەر لەم ناوچەیە "حەمورابی" بە شێوازێکی دی ئەو کارەی دەکرد.

پێکهاتنی دەوڵەتی نوێ لە سەدەکانی ڕابردوو لە ڕۆژئاوا دەوڵەتی نوێ لەسەر بەرژەوەندی دانیشتوانی وڵات، وەك "نەتەوە" پێکهات. ئەو ڕەوتە "دەوڵەت– نەتەوە"ی لێکەوتەوە. بەڵام لە وڵاتە پێشکەوتۆکان، لە سێبەری دێموکراسیدا وردە وردە بەرچاوتەنگی دەوڵەت– نەتەوە لە کزێی دا. لەحاڵێکدا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە سەدەی ڕابردوو دەوڵەتی نوێ لە مەودای بەرتەسکی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەو گەلە– کە پێشتر خاوەن دەسەڵات بوو– پێکهات و لە سەرەتاوە ڕەوتی بەرچاوتەنگ ڕەگەزپەرست و پاوانخوازی لێکەوتەوە، پێویستە ئەوەش بگوترێ: ڕێبازی دامەزراندنی دەوڵەتی نوێ ئەو هەلەی ڕەخساند کە داگیرکەران بە هاسانی بتوانن دەزگای دەوڵەت داگیر بکەن، کۆمۆنیستەکان هەوەڵ هەنگاویان بۆ ئەو چەمکە هەڵێنا. لێنین پاش زاڵبوون بەسەر دەزگای دەوڵەتی روسیای تەزاری بە پێی تێگەیشتنی خۆی و هاوبیرانی لە تیۆری مارکسیستی، چەشنێکی نوێی لە دەوڵەتی سۆسیالیستی دامەزراند، زۆری نەخایاند ڕەگەزپەرستی نازی و فاشیست لە ناوەڕاستی ئەورووپا وەخۆکەوتن. هەڵبەت شکستی ئەو دوو دەوڵەتە لە شەڕی یەکەمی جیهانی، زەمینەی بۆ گۆڕانی ئەو بیرانە خۆشکردبوو. نازێکان و فاشیستەکان، بە فریودانی خەڵك بەدەسەڵات گەیشتن و دەوڵەتیان لەژێر ڕکێفی خۆیان نا، ئەوان بەو ڕەوتە زۆرتری وڵاتانی جیهانیان تووشی شەڕکرد. بەڵام دواتر لە یاسای بنەڕەتی وڵاتانی پێشکەوتوو لە داگیرکردنەوەی سەر لە نوێی دەوڵەت لەلایەن ڕەگەز پەرست و پاوانخوازان بەرگری دەکرێ. ئەو ڕەوتە نیشانی دەدا چەمکی دەوڵەتی نوێ لە ناوەڕۆکەوە دژ بە پاوانخوازی و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ بونیاد نراوە.

له رۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاست له سه‌ده‌ی ڕابردووه: ئاییندار، نه‌ته‌وه‌خوازو كۆمۆنیسته‌كان بۆ دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنه‌مای بڕوای خۆیان تێده‌كۆشن، هه‌ركامیان وانیشان ده‌ده‌ن كه بڕواو قسه‌كانیان پیرۆزه‌و له به‌رژه‌وه‌ندی گه‌لدایه، له وڵاته وه دوا كه‌وتۆكان، چاند (كولتور)ی دێموكراسی باونییه، هه‌ر بۆیه‌ش دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنه‌مای تایبه‌ت وه‌ك ئایین، ناسیۆنالیسم و كۆمۆنیسم، درێژه پێدانی ڕه‌وتی نادێموكراتیكی ڕابردوویه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بنه‌مای ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر نه‌ریتی ئه‌وڕۆیی و دێموكراسی بێ ده‌كرێ پێشی داگیركردنه‌وه‌ی ده‌وڵه‌ت بگیرێ. ئه‌وڕۆ ده‌زگای ده‌وڵه‌ت بۆ ماوه‌یه‌كی دیاریكراو به ده‌ست تاقمێك له باوه‌ڕپێكراوان و كه‌سایه‌تی لێهاتوو ده‌سپێردرێ.

ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌ت له وڵاتانی پێشكه‌وتوو ئامرازی پێشكه‌وتنه، به‌ڵام له ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاست خه‌ڵك داماوی ده‌ستی ده‌وڵه‌تانی تایبه‌تن، له حاڵێكدا ئه‌و ناوچه‌یه ئالاهه‌ڵگری شارستانیه‌ت له جیهاندایه، به گوته‌ی چایلد، "بریتانی و بێلژیك ٣٠٠٠ ساڵ دوای ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاست گه‌یشتنه قۆناغی دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ت. وڵاتانی ئیسكاندیناوی دواتر له‌وانیش به‌و قۆناغه گه‌یشتن، وادیاره ئێمه‌ی خه‌ڵكی ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاست له پێناو چاندی نادێموكراتیكی چه‌ند هه‌زار ساڵه ئه‌وڕۆ چاوه‌ڕوانی هێرشی زلهێزه‌كانین تا بێن و خه‌ڵكی ئه‌م وڵاته له ده‌ست داگیركه‌رانی ناوخۆیی ده‌وڵه‌ت ڕزگار بكه‌ن!

كولتور و ده‌وڵه‌ت، هه‌ر گه‌له‌ی شایه‌نی ئه‌و ده‌وڵه‌ته‌یه كه هه‌یه‌تی. چاند (كولتور)، نه‌خشێكی به‌رزی له پێكهات و ساختاری ده‌وڵه‌ت هه‌یه. گه‌لانی ڕۆژهه‌لات، ئه‌گه‌رچی به پێكهێنه‌ری سه‌ره‌تایی ده‌وڵه‌ت ده‌ناسرێن، به‌ڵام نه‌یانتوانیوه خاوه‌نی ده‌سه‌لاتی ده‌وڵه‌ت بن، له‌كاتێكدا گه‌لانی پێشكه‌وتوو نه‌ته‌نیا له به‌ده‌سته‌وه گرتنی ده‌سه‌لاتی ده‌وڵه‌ت سه‌ركه‌وتوو بوون، به‌ڵكو توانیویانه ده‌وڵه‌ت وه‌ك ئامرازێك بۆ پێشكه‌وتن و په‌ره‌پێدانی به‌رژه‌وه‌ندی وڵات و گه‌ل وه‌گه‌ڕخه‌ن.

ڕۆژئاواییه‌كان سه‌دان ساڵه له ڕه‌وتی دروستكردنی ده‌وڵه‌ت ده‌كۆڵنه‌وه تابه‌و ڕاده‌یه گه‌یشتوون، به‌ڵام له ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاست پتر له پێنج هه‌زار ساڵه

دەوڵەت وەك دەسەلاتێکی خودایی (نەك هی خەڵك) چاوی لیّ دەکریّ، لەو ماوە درێژەشدا کەسانێك یان تاقمێك دەستیان بەسەر دەوڵەت و دەسەلاتی گەلداگرتووە کە خۆیان بە ئاین و خودا هەڵپەساردووە، ئەو چەمکە نادروستە وە دواکەوتوویی ئەو ناوچەیەی پێکهێناوە.

ڕەکێشی سامان و دەسەلات، سەروەت و دەسەلات ئەوەندە ڕەکێشن، هەر تاك یان کۆمەڵێك دەستی پێڕاگەیشت، دەیەویّ ئەو بەرهەمە لە پاوانی خۆی بگریّ، لە ڕۆژهەلات لەسەرەتاوە چاندی کۆمەڵگە چەشنێك گۆراوە کە خەڵك نەیانتوانیوە لە داگیرکردنی دەوڵەت بەرگری بکەن، بەلام لە ڕۆژئاوا (وەك یۆنانی بەر لە مەسیح) تا ڕاددەیەك بەرگری لە داگیرکردنی دەوڵەت کراوە، بیر و لێکۆڵینەوە لەمەر بونیادنانی دەوڵەت بە وردی لە بەرچاو گیراوە. ڕۆژئاوا لە سەدەکانی ڕابردوودا دروشمی گۆڕانکاری، چاکسازی و لێکۆڵینەوەی لەسەر "دەوڵەت" بەدەستەوەگرت، ئەورۆ لە وڵاتە پێشکەوتۆکان سیستمی نوێی دەوڵەت وەك دەسەلاتی گشتی کۆمەڵگە بۆ پێشکەوتنی وڵات چاوی لێدەکریّ. بەلام لە وڵاتە دواکەوتۆکان دەوڵەت دەسەلاتێکی داگیرکراوە کە بە ویستی داگیرکەرلن هەڵدەسووڕیّ.

لەم وڵاتانە خەڵك ماوەی سەدەیەکە بە چاولێکەری لە ڕۆژئاوا بۆ گۆڕانکاری دەوڵەت هەوڵدەدەن، بەلام دیسان داگیرکەرانی دەسەلات ئەو هەوڵانە بەلای خۆیاندا دەشکێننەوە، داگیرکەرانی ناوخۆیی لە بن عەبای نوێخوازی دەست بەکار بوونەوە لەزۆرینەی ئەم وڵاتانە، بنەمای دەوڵەتی نویّ لەسەر بەرژەوەندی نەتەوەی بالادەستی پێشوو دامەزراوەتەوە.

بنەماکانی دەوڵەتی نویّ: ١- دەسەلاتی سەر وڵات (Sovereignty) ٢- حکومەت، (State)، کە کۆڵەکەی سەربەخۆیی وڵاتە. ٣- دەوڵەت (Government)، وەك دەزگای دەستگۆڕی بەڕێوەبەری حکومەت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو. بنەمای پێکهاتەی لێژنەی دەوڵەت بە دەنگدانی نوێنەرانی خەڵك بە کەسایەتی لێهاتووی باوەڕپێکراو پێك دیّ.

بەڵام شێوازی دەنگدان بۆ پێکهاتنی دەوڵەتی نویێ ئەو هەڵەی پێکهێناوە کە دەکرێ بە هەڵخەڵەتاندنی خەڵك، یان بە فێڵ و تەڵەکە، یان نمایشێك لە هەڵبژاردن دەوڵەت داگیر بکرێ. دیارە ئەو ڕەوتە لەوڵاتە وە دواکەوتۆکان هاسانتر سەردەگرێ، لەبەر ئەوەی داگیرکەرانی دەسەلات نایەڵن چاندو هۆکارەکانی دێموکراسی لە کۆمەڵگەدا پەرەبگرێ، نایەڵن زانست و ئاگایی خەڵك پەل داکوتێ.

لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لە سەدەی ڕابردووەوە، نەتەوەخوازەکان هەستی نەتەوەگەری تین دەدەن، ئایینێکان بیروبۆچوونی خۆیان (بۆ دامەزراندنەوەی سەر لە نوێی دەوڵەت) بە پیرۆز دادەنێن، مارکسیستەکان، دروشمی لابردنی چەوسانەوەو پێشکەوتوویی هەڵدەسووڕێنن. بەڵام هەرکام کاتێك بە دەسەلات بگەن، دەوڵەت لە پاوانی خۆیان دەگرن، ئەو ڕەوتەش دژ بە بنەمای دەوڵەتی هاوچەرخە، دەوڵەتی هاوچەرخ نابێ دەستی بەسەردابگیرێ.

بەڵام گەلی کورد لەبەر ئەوەی دەسەلاتدارەکانی ناوچەو زلهێزەکانی جیهانی لە وڵاتە داتاشراوەکاندا کوردیان بە کەمایەتی و بێ دەسەلاتی هەڵپەساردووە، ئەو گەلە بۆ وەدەستهێنانی دەسەلاتی لێ زەوتکراو پێویستە یەکبگرێ: نەتەوەخواز، ئایینی و کۆمۆنیست بە یەکەوە بۆ وەدەستهێنانی دەسەلات هەوڵبدەن. دیارە تێکۆشان بۆ ڕزگاربوون پێویستی بە چاندنی تۆوی دێموکراسی لە نێو تێکۆشەران و گشت گەلی کورد هەیە.

لە چەند سەدەی ڕابردوودا تا ئەوڕۆ جەماوەری هاوبەش لە بەرژەوەندی و پێناسەدا، خۆ بە "نەتەوە" دادەنێن، ئەگەر دەوڵەت– نەتەوەی تایبەت بەخۆیان دانەمەزراندبێ، داوای دروستکردنی دەکەن، لێرەدایە کە ئەوانەی زۆردارن دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان دادەنێن، ئەوان بنەماکانی دێموکراسی ڕاستەقینە لە بەرچاو ناگرن، تەنیا بەرژەوەندی نەتەوەی باڵادەست لە بەرچاو دەگرن و کارەکەی خۆیان بە دروست دادەنێن، گەلانی تری وڵات وەك بندەست چاو لێدەکەن، ئەگەر زۆر توندو تیژیش بن بە ڕاشکاوی جینۆساید دەستپێدەکەن: دەیانەوێ گەلە جیاوازەکان واز لە پێناسەی خۆیان بێنن و لە ناویاندەبەن، دەربەدەریان دەکەن و لە نیشتمان دووریان دەکەنەوە.

به‌لام زۆرینه‌ی دانیشتوانی ولاتانی جیهان چ به ڕه‌چه‌ڵه‌ك چ له باره‌ی: زمان، ئایین، داب و نه‌ریت و داخوازێکان وه‌ك یه‌ك نین، هه‌ر بۆیه‌ش ده‌وڵه‌تی دامه‌زراو له‌سه‌ر بنه‌مای تایبه‌ت، به‌رژه‌وه‌ندی به‌شێك له هاونیشتمانان پێشێل ده‌کات.

دیاره زه‌وتکردنی ده‌سه‌ڵات و نیشتمانی گه‌لانی دی، چه‌مکێکی نوێ نییه تا ئه‌و کاته مێژوو نیشان ده‌دات ئه‌و ده‌ستدرێژیانه هه‌ر دیتراون، ئاسه‌واره کۆنه‌کان نیشان ده‌ده‌ن ئاشورییه‌کان چ به‌لایه‌کیان به‌سه‌ر میدیاکان ده‌هێنا، کۆلۆنیالیسته‌کان له سه‌ده‌کانی ڕابردوودا چیان به‌سه‌ر گه‌لانی جیهان به تایبه‌ت سوورو ڕه‌ش پێسته‌کان هێنا...

**+ ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌ت له سه‌ر بنه‌مای ئایین بونیاد بنرێ ، ئایا چۆن ده‌توانێ مافی هه‌موو نه‌ته‌وه‌کانی تر و ئایینه‌کانی تر دابین بکات به‌بێ جیاوازی (به‌تایبه‌تی ئه‌گه‌ر ئه‌و ده‌وڵه‌ته ده‌وڵه‌تێکی ئیسلامیی بێت ) ؟ له‌کاتێکدا تۆ له نووسینێکتدا ده‌ڵێیت: "له ڕۆژهه‌لاتی نێوه‌ڕاست، پێکهاتنی ده‌وڵه‌ت– نه‌ته‌وه، ده‌سه‌لاتی ڕه‌گه‌زپه‌رستانه‌ی لێکه‌وتۆته‌وه؟!".**

ئه‌بریشه‌می: له‌و پرسیاره‌دا بیری بونیادنانه‌وه‌ی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنه‌مای ئایین زۆر به‌رچاوه، له وه‌لامی پێشوو ئاماژه به ڕه‌وتی ده‌ستپێکی دیاریکراوی ده‌وڵه‌ت کرا، دیتمان ده‌وڵه‌تی سه‌ره‌تایی له‌سه‌ر بنه‌مای ئایین دامه‌زراوه، دواتریش که ده‌وڵه‌ت داگیرکرا زۆرتری پادشاکان بۆ پیرۆزکردنی ده‌سه‌لات پادشایه‌تیان به ئایینه‌وه گرێ ده‌دا، مه‌سیحیه‌ت له سه‌ره‌تادا بێ ده‌سه‌لاتترین ئایین بوو، به‌لام چه‌ند سه‌ده دواتر بوو به ئامرازی ده‌وڵه‌تانی داگیرکه‌ر(بۆ به‌رینکردنه‌وه‌ی سنووری ده‌سه‌لات، تالان و به‌دیلگرتنی خه‌ڵکی ولاتانی دی). له‌حاڵێکدا مێژوو نیشان ده‌دا، ئیسلام له‌سه‌ره‌تاوه له‌سه‌ر بنه‌مای ده‌سه‌لات و حکومه‌ت خۆی نواندووه، ئیسلام له بواره‌کانی سیاسیی، ئابووری و کۆمه‌لایه‌تی خۆی به ڕێبه‌ری به‌ره‌ی مرۆڤ داده‌نێ، هه‌ر بۆیه‌ش له سه‌ره‌تاوه کاتێك ولاتێك ده‌که‌وته ده‌ست موسوڵمانان حاکم و ده‌سه‌لاتداره‌کان به نێوی ئایین و"ئیسلام" حوکمیانکردووه، به‌لام ئیسلام له‌و ماوه درێژه‌دا نه‌یتوانیوه ڕه‌وتێکی وه‌پێشکه‌وتووانه بۆ ده‌وڵه‌ت و ده‌سه‌لات بدۆزێته‌وه، له حاڵێکدا ده‌وڵه‌تی هاوچه‌رخ (که له ولاته

ناموسوڵمانەكان پێكهات) له سەر ڕەوتی جیابوونی ئایین له دەوڵەت دامەزراوە، سیاسەت، ئابووری و كێشه كۆمەڵایەتێكان ناتوانن له بازنەی ئاییندا چارەسەر بن.

مێژوو نیشان دەدا دەوڵەت و حكومەتی ئیسلامیی (١٤٠٠) ساڵی خایاند (له سەرەتاوە تا سەدەی بیست). پرسیار ئەوەیە: لەو ماوە درێژەدا ئەزموون و دەستكەوتی ئیسلام له دەسەڵات و دەوڵەت چۆن بووە؟ كەسایەتییە خاوەن بیرەكانی یەك دوو سەدەی ڕابردووی ئیسلامیی وەك سەید جەماڵەدین و...هتد، دوای دەستكەوتی ڕۆژئاوا له پێكهێنانی دەوڵەتی هاوچەرخ هاتنە سەر ئەو بیرەی كه موسوڵمانەكانیش به چاولێكەری له ڕۆژئاوا دەوڵەت بكەنە ئامرازی پێشكەوتنی وڵاتە ئیسلامێكان. بەڵام له ڕۆژئاوا زۆرتری دەوڵەتە نوێیەكان لەسەر بنەمای جیا له ئایین دامەزران، تەنانەت ئەوانەی گرێدراویان به ئایینەوە هەر ماوە به چەشنێك لایەنی دێموكراسی له ناو ئەواندا بەهێزە، كه جوغزەكانی ئایین بەرگری له ڕەوت و یاسای نێونەتەوەیی بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ ناكات. ئایا دەوڵەتی دامەزراو له سەر بنەمای ئیسلام دەتوانێ ئەو ڕەوتە لەبەرچاو بگرێ؟ یان به بیانووی ناكۆكی لەگەڵ بنەماكانی ئایین وەلا دەندرێ؟

بەشێك له ئیسلامێكان له ڕەوتی دەوڵەتی هاوچەرخ بۆ جیابوون له ئایین توورەن، دیارە ئیسلام و دەسەڵات له سەرەتاوە لێك جیا نەبوون، بەڵام لەم بارەوە پرسیار زۆرن وەك: دەستكەوتی ئیسلام له سیستمی دەسەڵاتی ئایینی چ بووە؟ لەو ماوە درێژەدا موسوڵمانان چ هەوڵێكیان بۆ چاكسازی و گۆڕانكاری له چلۆنایەتی دەسەڵات و دەوڵەتداوە جگه له چەند كەسێك وەك ئیبنی خەلدون، چ ووردبوونەوەو لێكۆڵینەوەیەك له مەڕ چەمكی دەوڵەت و دەسەڵات له ئارادایە؟

ئەوە دوای پێكهاتنی دەوڵەتی هاوچەرخ له ڕۆژئاوایە كه بەشێك له موسوڵمانان وەخۆ كەوتوون تا سەر له نوێ دەوڵەتی ئیسلامیی دابمەزرێننەوە. موسوڵمانان بۆ بەر له ئەوروپاییان له فیكری پێشخستنی شێوازی دەسەڵات و دەوڵەتدا نەبوون؟ ئەگەر ئەو ڕۆ دەیانەوێ به شێوازی هاوچەرخ دەوڵەت دابمەزرێنن، پێویستە ئەو دەوڵەتە لەسەر بنەمای هاوچەرخ و له ئایین جیا بێت.

وێده‌چێ ناهومێد بوونی خه‌ڵكی ولاَتانی ئیسلامیی له‌و ته‌رحه‌ی كه‌ به‌ نێوی دێموكراسی خۆی نواندووه‌، بیر دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ت له‌ سه‌ر بنه‌مای ئایین كه‌وتبنه‌وه‌ تا ده‌وڵه‌ت و ده‌سه‌لاَت و كۆمه‌ڵگا له‌ گه‌نده‌ڵی و ناپاكی ڕزگار بكه‌ن، به‌لاَم ئه‌و بیره‌ له‌ ناوه‌ڕۆكی خۆیدا دووپاتكردنه‌وه‌ی ئه‌زموونی ڕابردوویه‌كی سه‌دان ساڵه‌یه‌.

له‌ سیستمی هاوچه‌رخدا بیری دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنه‌مای ئایین ناكۆكی پێكهاته‌یی لێ ده‌كه‌وێته‌وه‌، ده‌وڵه‌تی هاوچه‌رخ ده‌بێ به‌ پێی به‌رژه‌وه‌ندی ولاَت و یاساگه‌لی ڕێكخراوه‌ نێو نه‌ته‌وه‌ییه‌كان هه‌ڵبسوڕێ، نه‌ له‌ بازنه‌ی ئاییندا قه‌تیس بكرێ به‌ له‌به‌رچاوگرتنی ئه‌و چه‌مكانه‌، ئه‌و پرسیاره‌ خۆ ده‌نوێنێ دانراوه‌یه‌كی پیرۆز، به‌ستراوه‌ نه‌گۆرو ئاسمانی، چۆن ده‌شێ بكرێته‌ بنه‌مای پێكهاته‌یه‌كی به‌ربلاَوی دنیایی و هه‌ڵگری گۆڕانكاریی؟

له‌ چه‌مكی هاوچه‌رخدا ئه‌گه‌ر بیرو داخوازی دامه‌زراندنی ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنه‌مای ئایین به‌ پاوانخوازی دانه‌ندرێ، ناشاره‌زایی و بێ بڕوایی به‌ دێموكراسی ده‌سه‌لمێنێ، ئه‌گه‌ر ده‌وڵه‌ت له‌سه‌ر بنه‌مای ئایین دابمه‌زرێ به‌ڕێوه‌به‌ری چاوه‌ڕوانكراوی ئه‌ركی ده‌وڵه‌ت و ئایین ده‌شێوێ، خه‌ڵك له‌ هه‌ردوولا ده‌تۆرێن، ئایین و ده‌وڵه‌ت له‌ ئه‌رك و تایبه‌تمه‌ندێكانی خۆیان داده‌ماڵدرێن.

سه‌ره‌كیترین ئه‌ركی ده‌وڵه‌ت بریتییه‌ له‌ به‌ڕێوه‌به‌ری كاروباری ولاَت و كۆمه‌ڵگه‌، دابینكردنی هێمنایه‌تی و ئاسایش له‌ ولاَت و ڕاگرتنی سه‌ربه‌خۆیی و په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ولاَتانی تر، دیاره‌ ئه‌و ئه‌ركانه‌ به‌ لێهاتوویی و زانستی تایبه‌ت (كه‌ له‌ مه‌ودای زانستی ئایینیدانین) به‌ ئه‌نجام ده‌گه‌ن.

سه‌ره‌كیترین ئه‌ركی ئایین، بریتییه‌ له‌ ئامۆژگاری و به‌ڕێوه‌به‌ری ئه‌رك و شێوازی ژینی په‌یره‌وان و ناساندنی ئایین، ئه‌وكاره‌ش پێویستی به‌ زۆره‌ملێ و پاڵپشتی ده‌سه‌لاَتی ده‌وڵه‌ت نییه‌، به‌ڵكو به‌ ویستی په‌یڕه‌وانی ئایین، له‌ مزگه‌وت و بنكه‌كانی ئایینی (ناده‌وڵه‌تی N G O) پێكدێ.

له‌ ولاَتێكی ئازاددا هه‌ر ئایینێك ده‌توانێ شه‌رعییه‌تی تایبه‌ت به‌ خۆی به‌ڕێوه‌به‌رێ (سه‌باره‌ت به‌ په‌یره‌وانی نه‌ك ته‌واوه‌تی هاونیشتمانان)، ئه‌و ڕه‌وته‌ش

به لەبەرچاوگرتنی مافەکانی تایبەت بە مرۆڤ ئەنجام دەدرێ. دیارە ئایین و دەوڵەت دەتوانن هاوکار بن، بەڵام پێویست بە بەستنەوەی بنەمای دەوڵەت بە ئایینەوە نییە، ئەو کارە ئیستیبدادی ئایینی لێ دەکەوێتەوە. هەر ئایینێك، تایبەت بە بەشێك لە هاونیشتمانانە، بەڵام دەوڵەت تایبەت بە گشت هاونیشتمانانە.

وەك ئاماژەی پێکرا ئەو قسەیە بە مانای وەلانانی ئایین و ئاییندارەکان لە بازنەی دەوڵەت نین، لە وڵاتە ئازادەکاندا، ئاییندارە لێهاتۆکان بە هێنانەوەی دەنگ دەتوانن دەوڵەت بەدەستەوە بگرن، بەڵام لەو قۆناغەدا ئەرکی دەوڵەتیان پێ دەسپێردرێ (نە ئەرکی ئایینی). بەو چەشنە ئاییندارە لێهاتۆکان دەتوانن شارەزایی‌و لێهاتوویی و دڵپاکی خۆیان بە خەڵکی وڵات بسەلمێنن. لە چەمکێکی ئەوتۆدا پێویست نییە ئایین بکرێتە بنەمای پێکهاتەی دەوڵەت.

وەك ئاماژەی پێکرا ئەگەر ئایین بکرێتە بنەمای پێکهاتەی دەوڵەت، خەڵك لە ئایین دەکشێنەوە. دەوڵەتیش لێهاتوویی خۆی بۆ ڕێبەری کاروباری وڵات لەدەست دەدا. لە ئەنجامدا خەڵك بۆ ڕزگار بوون لەو پێکهاتە نارێکە، لە دەوڵەت دادەبڕێن، ڕوو لە شۆڕش و تێکدانی دەوڵەت دەکەن.

لە وڵاتە پێشکەوتۆکان دەوڵەت و ئایین لێك جیان. ڕێکخراوەی ئایینی و سێکۆلار بۆ بەڕێوەبەری دەستگۆڕی دەوڵەت بە شێوازێکی شارستانیانە ململانی دەکەن، بەڵام کاتێك دەوڵەت دەکەوێتە بندەستی هەر لایەك پێویستە بەرژەوەندی گشت لایەنەکان ڕابگرن و جوغزی بەرژەوەندی گشت هاونیشتمانان لە بەرچاوبگرن، باشتر ئەوەیە ئەرکی ئایین و ڕێکخراوەکان لە بنکەکانی تایبەت بەخۆیان چاوەدێری پەیڕەوان بکەن، دەوڵەتیش کاری بە کاری ئایین و ڕێکخراوەکان و (N G O)کان نەبێ، ئایین و بنکەکانی دی نابێ بە زۆرەملی ویستی خۆیان بەسەر گشت هاونیشتماناندا بسەپێنن. دیارە پەیڕەوانی هەر ئایین‌و ڕێکخراوەو... داب و نەریتی خۆیان ڕادەگرن. لە چەمکێکی ئەوتۆدا جیاوازی کاروباری ئایین و دەوڵەت لەبەر چاو دەگیرێ، دەوڵەت بە پێی هەلومەرجەکان ئاڵوگۆڕی بەسەردادێ، بەڵام ئایین وەك خۆی دەمێنێتەوە. بڕوانە دەوڵەت–

نەتەوە (کە ئێستاش لە زۆر ولاتان وەك پێکهاتەیەکی پیرۆز و نەگۆڕ خۆ دەنوێنیٚ)، وردە وردە چەمکی "تایبەت بوون" وەلادەنیٚ و بەرەو دانراوەیەکی کۆمەلایەتی بۆ گشت "هاونیشتمانان" هەنگاو هەلدێنیٚ لە زۆر ولاتان شاروەند (Citizen) جێگای نەتەوەی تایبەتی گرتۆتەوە.

دەولەت بە ئیرادەی خەلك، بەردەوام لە دەستگۆڕدایە، بەلام ئایین بە ئیرادەی خەلك گۆڕانی بەسەر دانایە، دەولەت و ئایین دەتوانن بەیەکەوە هاوکاریٚ بکەن، بەلام ناتوانن جێگری یەکبن.

ئەو تایبەتمەندیانەی ئەوڕۆ بۆ دەولەت لەبەر چاو گیراون لە ڕابردوو لە ئارادا نەبوون. ئەو یاساو داب و نەریتانە– کە دەستگۆڕن– بۆ دەولەتی هاوچەرخ پێکهاتوون، بەلام دەولەتی دامەزراو لەسەر ئایین بەهۆی بەستراوە بوونی بنەماکانی دەست و بالی وەك دەولەتی ئازاد نابیٚ.

وەك ئامازەی پێکرا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بیری دامەزراندنی دەولەت لەسەر بنەمای ئایین مەبەستێکی نویٚ نییە، بە درێژایی مێژووی ئەو ناوچەیە دەولەت لەسەر بنەمای ئایین بووە، زۆرتری ولاتە موسولمانەکان لەسەرەتاوە لەسەر بنەمای ئایینی ئیسلام بەڕێوە چوون، بەلام مێژوو وێنەیەکی بەرچاوی لە دەولەتی ئایینی چ بەر لە ئیسلام و چ دوای ئیسلام نیشان نەداوە. لەو ماوە درێژەدا لە ولاتانی ئیسلامیی لێکۆلینەوەیەکی بەرچاو لەسەر دەولەت و کێشە کۆمەلایەتێکان نەدیتراوە، ئەو بابەتانەی ئەوڕۆ لە ولاتە ئیسلامێکان بۆ دامەزراندنی دەولەت باسیان لەسەر دەکریٚ، بە تەواوەتی دەستکەوتی ڕۆژئاواییین، ئەو دەستکەوتانەش بۆ وەدەستهێنانی دەسەلات لە ولاتانی ئیسلامیش کەلکیان لیٚ وەردەگیریٚ، لە نێو موسولمانان‌دا چ ئەزموون و دەستکەوتێکی پێشکەوتوو بۆ دامەزراندنی دەولەت لە ئارادا نییە، بەلام لە ڕۆژئاوا لێکۆلێنەوە بۆ چاکسازی دەولەت بەردەوامە، پتر لە سەدەیەکە (دەولەت– نەتەوە) وەك بەرچاوترین دەستکەوتی دەولەتی هاوچەرخ خۆی دەنوێنیٚ، بەلام ماوەیەکە بەرەو لێژی دەڕواو وردە وردە سەردەمی بەسەر دەچیٚ.

دووپاتی دەكەمەوە مەبەست لەو باسە وەلانانی ئایین و نەتەوەگەری لە دەسەلات نییە، بەلْكو مەبەست لە بنەمای دەوڵەتی هاوچەرخە كە نابێ بە ویستی تایبەت بە لایەنێك لە هاونیشتمانان ببەسترێتەوە.

وەك دەبینین دەوڵەتی دامەزراو لەسەر بنەمای نەتەوەخوازی تایبەت دەسەلاتی ڕەگەزپەرستانەی لێ كەوتۆتەوە، دیارە ئایین، نەتەوەگەری یان ئیدیۆلۆژی (وەك كۆمۆنیسم)، بە پێی تێگەیشتن تەفسیرو لێكدانەوەی جۆراوجۆری بابەتەكان ناتوانن گشت بەرەی تایبەت بە خۆیان قانع بكەن، چ دەگا بە لایەنەكانی دی، ئەو بابەتانە وەك دۆگما خۆ دەنوێنن، ناتوانن جوغزە پیرۆزكراوەكانی خۆیان ببەزێنن.

ئەگەر دەسەلاتی ئایینی لە ڕووی ئایین ڕایەك دەربڕێ، كەس توانای دەنگ هەلْبڕینی نییە. ئەوەش دژ بە ڕەوتی پێكهاتەی هاوچەرخی دەوڵەتە، دەوڵەتی دامەزراو لەسەر بنەمای تایبەت، دەبێتە هۆی لێكترازانی خەلْك و دەوڵەت. سەرئەنجامی ئەو لێكترازانە وەپاشكەوتوویی وڵاتە.

لەجیاتی ئەوەی ئایین ببێتە دەسەلاتی سیاسیی باشترە ببێتە بەڕێوەبەری شەریعەت و پەروەردەكردنی كەسایەتیی پاك، زاناو لێهاتوو، ئایین پێویستە بەكردەوە خۆی بە خەلْك بناسێنێ نەك بەهۆی دەسەلاتی سیاسیی.

بیری دامەزراندنەوەی سەر لە نوێی دەوڵەت لەسەر بنەمای ئایین (بە تایبەت لە وڵاتە دواكەوتۆكان) لەو كاتەوە سەریهەلْداوە كە داگیركەرانی دەسەلات بە ناوی نوێخوازی دەوڵەتیان لە ژێر ڕكێفی خۆیانناوە، خەلْك توانایی ئەوەیان نییە لە پاكی و ناپاكی كاربەدەست و بەڕێوەبەران بكۆلْنەوە، ئایینێكان بۆ لابردنی ناپاكان قۆلْیان هەلْمالْیوە، دەیان هەوێ دەوڵەت بخەنە ژێر ڕكێفی خۆیان بەبێ ئەوەی نموونەیەكی باشی دەوڵەتی ئایینی لە ڕابردوو دەستنیشان بكرێ. بەلام لە وڵاتە وە پێشكەوتۆكان خەلْك لە مەودای دێموكراسیدا دەتوانن لە پاكی و لێهاتوویی و ناپاكی و ناشایستی كاربەدەستان بكۆلْنەوە، ناپاكان وەلابنێن. هەر بۆیەش ئەوان گەڕانەوە بۆ سەر بنەمای ئایین بە پێویست نازانن. لە وڵاتانی پێشكەوتوو بورۆكراسی ساغ و لێهاتوو، كارو باری وڵات بەڕێوە دەبا. بەلام لە

وڵاتانی وه دواكەوتوو بورۆكراسی گەندەڵ بەسەر وڵات ڕادەگا، وەك دەبینین ئەگەر بنەمای دەوڵەت و دەسەڵات له سەر داب و نەریتی سوننەتیش بێ دەكرێ بورۆكراسی و بەڕێوەبەری وڵات لەسەر بنەمای پێشكەوتووانه دابمەزرێ (وەك ئەماراتی یەكگرتوی عەرەبی)، له وڵاتێكی ئەوتۆدا بنەمای دامەزراندنی دەوڵەت زۆر بەرچاو نییه، بەڵكو شێوازی هاوچەرخی بورۆكراسی بۆ بەڕێوەبەری كاروباری وڵات زۆر بەرچاوه. هەر بۆیەش له وڵاتانی سعودی و ئەمارات باسی دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر بنەمای تایبەت بەرچاو نییه.

له وڵاته پێشكەوتۆكان خەڵك دەتوانن بەرگری له دەستدرێژی و ناپاكی كاربەدەستان و گەندەڵی كاروبار بكەن، بەڵام له وڵاتانی دواكەوتوو خەڵك توانایی ئەوەیان نییه له پاكی و ناپاكی لێهاتوویی و ناشارەزایی كاربەدەستان و گەندەڵی كارەكان بكۆڵنەوه، بۆیه پەنا بۆ ئایین و ئیدیۆلۆژی تایبەت دەبەن، خەڵكی بێزار له دەسەڵات و بورۆكراسی گەندەڵ جگه له وێنەی دەسەڵاتی ڕابردووی ئایینی یان پادشایەتی، یان دروشمی كۆمۆنیستەكان چ شێوازێكی تریان له دەوڵەت لەبەر چاو نییيه.

له لایەكی دی بڕوای ئایینی له ڕووی هەڵبژاردن و تێگەیشتن پێكنایه، ئەوەی كه هەنووكه له جیهاندا باوه ئایین زۆرتر له باوكەوه به ئێرس دەگات، گرفتی گەورەی بەشێك له ئایینەكان ئەوەیه: مافی هەڵبژاردنی ئایینی له مرۆڤ داگیر كردووه. له حاڵێكدا ماددەی (١٨) بڕیاری نێونەتەوەیی، ئازادی هەڵبژاردنی ئایین دەستنیشان دەكات، هەڵبەت بەشێك له وڵاته پێشكەوتۆكانیش گرێدراوێكیان به ئایینی تایبەتەوه هەیه، بەڵام ئەو گرێدراوییه زۆر بەرچاو نییه، له ڕەوتی دێموكراسی و دەوڵەتی نیشتمانیدا مرۆڤ دەتوانێ سەبارەت به هەرمەبەستێك ڕای خۆی دەربڕێ، قسه بكاو دەنگ هەڵبڕێ، بەڵام له مەودای ئایین دا ئەوكاره ناكرێ: مامۆستایان و خاوەن ڕایانی ئایین به هۆی تێگەیشتن یان قامك دانان لەسەر ئەوبابەتانه (كه دەگەڵ ویستی وان یەك دەگرنەوه) ڕای خۆیان به پیرۆز و ئاسمانی دادەنێن و بەسەر خەڵكیدا دەسەپێنن، كەسیش توانای ئەوەی نییه ڕای پیرۆزكراو ڕەت بكاتەوه یان دژ بەو ڕایه دەنگ هەڵبڕێ. بەپێچەوانەی بەر له

ئیسلام ده‌كرێ بڵێین ده‌وڵه‌تی سه‌رده‌می چوار خه‌لیفه‌ی ڕاشدین چه‌شنێكی نوێ له ده‌سه‌ڵات و ده‌وڵه‌ت بوو: ئه‌میری موسوڵمانان له‌لایه‌ن موهاجیر و ئه‌نسار، هه‌ڵده‌بژێردرا، خه‌ڵك به‌یعه‌تیان له‌گه‌ڵ ئه‌میری داندراو ده‌كرد. چوار خه‌ڵیفه‌ی ئاماژه پێكراو له نێو خه‌ڵكدابوون، وه‌ك خه‌ڵك ده‌ژیان. به‌ڕێچوونی خه‌ڵك به چه‌شنێك له‌لایه‌ن ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی چاوه‌دێری ده‌كرا، ئه‌و ڕه‌وته‌ش له شه‌ڕایتی سه‌رده‌می خۆیدا ئینقلابێك له سیاسه‌ت و شێوازی به‌ڕێوه‌به‌ری وڵات و پێكهاته‌ی ده‌وڵه‌ت بوو، به‌ڵام مێژوو نیشان ده‌دا ئه‌و چه‌مكه پێشكه‌وتووه زۆری نه‌خایاند، موعاویه سه‌رله نوێ ڕه‌وتی كۆنی ده‌وڵه‌تی (وه‌ك سه‌رده‌می پادشایه‌تی) گرێدراو به ئایینی دامه‌زرانده‌وه، سیستمی ده‌سه‌ڵاتی موعاویه داسه‌پاو بوو، ئه‌و ئایینی ئیسلامیی كرد به دروشمی ده‌سه‌ڵات و ده‌وڵه‌ت، وه‌ك سه‌رده‌می حه‌موڕابی (نزیك به ٢٥٠٠ ساڵ به‌ر له موعاویه) كه ئه‌ویش خۆی به راسپارده‌ی خودا داده‌نا، یاسای له‌سه‌ر بڕوای ئایینی سه‌رده‌م ده‌رده‌خست. له ڕوانگه‌ی په‌یوه‌ندی "ئایین و ده‌سه‌ڵات"ه‌وه چ جیاوازێك به‌ینی موعاویه‌و حه‌موڕابی نابیندرێ. هه‌ڵبه‌ت له سه‌رده‌می حه‌مورابی ئایینی ئیسلام له ئارادا نه‌بوو، موعاویه موسوڵمان بوو، ده‌سه‌ڵاتی خۆیشی به ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی ناساند. ده‌سه‌ڵاته پادشایه‌تێكانی دواتریش ئیسلامیان وه‌ك دروشمێك بۆ بێ ده‌نگكردنی خه‌ڵكی موسوڵمان و تالان و داگیركردنی وڵاتانی ناموسوڵمان به‌كار ده‌برد. سوڵتان مه‌حموودی غه‌زنه‌وی، وێنه‌یه‌ك له‌و كه‌سانه بوو كه به بیانووی ئیسلام هێرشی برده سه‌ر هیندوستان، كوشتارو تالانێكی وه‌ڕێخست كه ئێستاش دڵڕه‌شی هیندی و موسوڵمانی لێده‌تكێته‌وه.

دیاره له ده‌وڵه‌تی نیشتمانی هاوچه‌رخدا گشت دانیشتوانی وڵات هاوبه‌شن، به‌رژه‌وه‌ندی نه‌ته‌وایه‌تی و ئایینی گشت هاونیشتمانان له‌به‌رچاو ده‌گیرێ. له چه‌مكێكی ئه‌وتۆدا هاونیشتمانان (كه زۆرینه‌یان په‌یره‌وی ئایینێك یان خاوه‌نی پێناسه‌ی نه‌ته‌وایه‌تی تایبه‌ت، یان هۆگری بیروباوه‌ڕێك بن) ده‌توانن به ده‌نگدان به‌ڕێوه‌به‌ری ده‌وڵه‌ت به‌ده‌سته‌وه بگرن. هه‌ر بۆیه‌ش چ نیازێك به به‌ستنه‌وه‌ی ده‌وڵه‌ت به ئایین، نه‌ته‌وه‌گه‌ری یان ئیدئۆلۆژێكی تایبه‌ت له ئارادا نییه.كاتێك

بنەمای دەوڵەت لەسەر ڕێزگرتن لە مافی گشت هاونیشتمانان دابمەزرێ، یاسای بنەڕەتی بەرگری لە دەستدرێژی دەوڵەت دەکا. بەڵام ئەگەر بنەمای دەوڵەت لەسەر مەبەستی تایبەت دابندرێ، بەرگری لە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ ناکرێ، وەك دەبینین لە وڵاتە پێشکەوتۆکانیش بە بیانوی یاسای بنەڕەتی دەوڵەت، نایەڵن ژنە موسوڵمانەکان لە بنکە دەوڵەتێکان بە سەرپۆشەوە بن. ئەو ڕەوتە، نیشان دەدا کە بنەمای دەوڵەت لە وڵاتە پێشکەوتۆکانیش بە تەواوی لەسەر ڕێزگرتن لە گشت ئایینەکان (وەك مافی مرۆڤ) لەبەرچاو نەگیراوە. ئەوەش حاشای لێناکرێ کە لە زۆر وڵاتان، (دەوڵەت– نەتەوە)، دەسەڵاتی ڕەگەزپەرستانەی لێکەوتۆتەوە، بڕوانە ڕەگەز پەرستەکان لە تورکیا بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی، زۆرتری دەزگای دەوڵەتی عوسمانیان بەدەستەوە بوو، ڕەگەزکوشی گەلی ئەرمەنیان دەستپێکرد. هەرچەند ئەوەش حاشای لێناکرێ نەتەوەگەری ئەرمەنی بە پشتیوانی ڕوسیای تەزاری پەلاماری دانیشتوانی ناوچەگەلی ڕۆژهەلات و نزیك بە سنوری ڕوسیایان دەدا. ئەوانیش زۆر بێبەزەیانە خەڵکی موسوڵمانی ناوچەکانیان دەکوشت، تالانیان دەکردن و هەڵیان دەبڕین.

لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی ڕەگەز پەرستانی تورك هاونیشتمانانی بە رەچەڵەك یۆنانیان دەر پەراند، دواتر دەستیان بە ڕەگەزکوژی کوردان کرد. ئەوان تەواوەتی مەڵبەندی ئاسیای بچووکیان بە وڵاتی تایبەت بە گەلی تورك قەبلاند، لە حالێکدا ئاسیای بچووك نیشتمانی کورد و ئەرمەنی و گەلانی تریشە، لە هەزار ساڵی ڕابردوودا، تورکەکان وردە وردە دەستیان بەسەر ئاسیای بچووك داگرت و دەسەڵاتە کوردەکانیان لەناوبرد، لە تورکیا لە سەرەتای سەدەی بیست ڕەگەزکوژی نەتەوەکانی نا تورك دەستیپێکرد.

ئەگەر بنەمای دەوڵەت لەم وڵاتە لە سەر بەرژەوەندی گشت هاونیشتمانان دامەزرابا، دەوڵەتێکی زۆر بە هێزتر پێك دەهات. بەڵام "دەوڵەت– نەتەوە"ی ڕەگەز پەرستی تورك حاشا لە بوونی گەلی کورد لە وڵاتێك دەکا کە بەشێکی ئەم وڵاتە نیشتمانی مێژوویی گەلی کوردە، بە پێی یاسای کۆماری تورکیا هەرکەس بڵێ لە وڵاتی ناو لێنراو بە تورکیا کورد هەیە کەمترین تاوانی ئەشکەنجەو زیندانە،

ئەوان بەوەش ڕازی نین کوردان وەك تورکێکی ڕەسەن بناسن! بەڵکو پێیان دەڵێن" تورکی کێوی! ئەو چەواشەکاریانە بەرهەمی دەوڵەتێکن کە لەسەر بنەمای نەتەوەی تایبەت بە تورك دامەزراوە، لە زۆر وڵاتان دەوڵەت– نەتەوە مافی هاونیشتمانان پێشێل دەکات. بەڵام دەوڵەتی هاوچەرخی دامەزراو لەسەر بنەمای دێموکراسی بەرگری لە پێشێلکردنی مافی هاونیشتمانان دەکات.

وەك ئاماژەی پێکرا، بنەمای دەوڵەتی هاوچەرخ دژ بە ئایین یان نەتەوەگەری نییە، لە دەوڵەتی نیشتمانی هاوچەرخدا بە هێنانەوەی بێ فێڵ و فەرەجی دەنگ هەر لایەنێك دەتوانێ بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەسەڵاتی دەوڵەت بەدەستەوە بگرێ. بەڵام ناتوانێ مافی ئەوانیدی پێشێل بکات. ئەگەر ئایین مەندەکان یان نەتەوەخوازەکان بتوانن دەنگ بهێننەوە، چ پێویستە بنەمای دەوڵەت بە ئایین یان نەتەوەگەری تایبەت گرێ بدرێ؟ بە شێوازی دێموکراسی دەوڵەت (کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو پێکدێ) دەتوانێ بەبێ جیاوازی "مافی هاونیشتمانان (چ ئایینی چ نەتەوەخواز) دابین بکات. لە دەوڵەتێکی ئەوتۆ دا ئیسلام گەراکان دەتوانن لە دەنگداندا ڕای گشتی وەدەست بێنن و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەوڵەت بەڕێوەبەرن.

وەك باسکرا ئیسلام لە ماوەی پتر لە سیازدە سەدە –جگە لە سەردەمی خولەفای ڕاشدین– وێنەیەکی وێچووی لە دەوڵەتی ئیسلامیی نیشان نەداوە تا ئەوڕۆ بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لەسەر بنەمای ئەو ئایینە پێ دابگرین، ئاستی سەردەمی خولەفای ڕاشدین–یش، لە ئارادا نەماوە، جگە لەوەی ئەو سەردەمیش چاندو بیری دەسەڵاتخوازی ملهۆڕانەی هەزاران ساڵە سێ ئەمیری موسوڵمانانیان یەك لە دوای یەك لە ناو برد، (١٣٠٠) ساڵ دەسەڵاتداری ئیسلامیی نەیتوانیوە ڕەوتێکی بەرچاو لە دەوڵەتی ئیسلامیی نیشان بدات، ئەوڕۆ بە چ هیوایەك دەیانەوێ سەر لە نوێ ڕەوتی ڕابردوو دووپات بکەنەوە؟

لە شێوازی دەوڵەتی هاوچەرخدا چ نیازێك بە بەستنەوەی "دەوڵەت" بە ئایین یان نەتەوەگەری یان ئیدئۆلۆژێکی تایبەت هەیە؟ بۆ لە سەردەمی پێشوو لە وڵاتە ئیسلامێکان چ لێکۆڵینەوەیەکی بە پێز بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی

نەدیتراوە؟ دەوڵەتە پادشایەکانی وڵاتانی ئیسلامیی لە سەردەمی موعاویەوە تا ئەورۆ خۆیان بە دەوڵەتی ئیسلامیی داناوە، بەرهەمی (١٤٠٠) ساڵەی ئەو دەوڵەتانەش جگە لە داگیرکەری وڵاتانی دی و دواکەوتوویی گەلانی موسوڵمان چی تر نەبووە. زۆرتری وڵاتە ئیسلامێکان پاش تێکچوونی دەسەڵاتی کۆن هەوڵیان بۆ ڕەخسا تا داوای دامەزراندنەوەی دەوڵەتی ئیسلامیی بکەنەوە. ئەگەر ئەوانە ڕەوتی (١٤٠٠) ساڵە بە ئیسلامیی ناناسن بۆ لەو ماوە درێژەدا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی هەوڵیاننەداوە؟ بەشێك لەئەوانەی خۆ بە موسوڵمان دەناسێنن بۆ داگیرکردنەوەی سەر لە نوێی دەوڵەت و دەسەڵات شێوازی دژ بە مرۆڤایەتی یان (خۆکوژی بۆ کۆکوژی و ڕەشەکوژی) وەگەڕ خستووە. ئەو ڕەوتە درێوە بۆ بەر لە سەردەم لە ئارادا نە بووە؟ بۆ ئەو ڕەوتە دژ بە حاکمەکانی پێشوو کە ئەوە هەموو زوڵمەیان دەکرد بەکار نەدەبردرا؟ ئایا ئەو بیرو لێکدانەوەیە لە دینی ئیسلامیش تازە دۆزراوەتەوە؟

ئەگەر دەوڵەت لە سەر بنەمای تایبەت (ئایین یان نەتەوەگەری) دابمەزرێت بیرو ڕای خەڵك و نوێنەرانیان لە سەر زۆر بابەتان ناتوانێ لە بازنەی بیروڕای مامۆستایانی ئایینی یان نەتەوەخوازەکان بچێتەدەر. ئەو ڕەوتەش دژ بە چەمکی دەوڵەتی هاوچەرخە.

بێگومان ئەو بیرە ئایینیانە کە داکۆکی لەسەر چاکسازی کۆمەڵگەو سیستمی دەوڵەت دەکەن زۆر جێی ڕێزن، بەڵام باشترە ئاییندارەکان لە دەستگۆریی و یاسایی دەوڵەتدا هاوبەش بن، کەسایەتی شارەزاو لێهاتوو بۆ بەڕێوەبەری دەوڵەت دەستنیشان بکەن و بەو چەشنە ئاستی خۆیان و ئایین لە کۆمەڵگەدا بەرزتر کەنەوە.

**+ تا چەند کورد شتێکی هەبووە بەناوی (کێشەی نەتەوایەتی) لە مێژەوە؟ یاخود ئەم مەسەلەیە لەم دواییانەدا سەریهەڵداوە؟**

ئەبریشەمی: کاتێك باس لە کێشەی نەتەوایەتی دەکرێ گەلێك مەبەستی نوێ خۆ دەنوێنن، جگە لە پێناسە کولتورێکان کە ڕیشەیان لە درێژایی مێژوودایە، نەتەوە دیاردەیەکی نوێیە لە چەمکی هاوچەرخدا نەتەوە بە گەلێك دەگوترێ کە

خاوەنی ماف چارەی خۆنووس بێ، سەروەری وڵاتی خۆی بەدەستەوە بێ، ئەگەر گەلێك دەسەڵاتی وڵات و چارەی خۆنووسی نەبێ، کاتێك بە نەتەوە دادەندرێ کە بۆ گەیشتن بە ئەم ئامانجە بە گشتی خەبات بکات، کورد پتر لە یەك سەدەیە بۆ ئەو مەبەستە خەبات دەکات و بەم شێوازە خۆی بە گەورەترین گەلی بێ دەوڵەت ناساندووە، بەڵام لە زۆرتری جووڵانەوەکانی کورداندا "ستراتیژێکی ڕوون و یەکگرتووی نەتەوەیی" لە ئارادا نەبووە، هەڵبەت پێشتریش هۆزە کوردەکان جیاجیا لە هەوڵی ڕاگرتنی دەسەڵاتی ناوچەیی خۆیاندا بوون، بەڵام لە ڕابردووشدا هەوڵ و پلانێکی "ڕوون" بۆ پێکهێنانی قەوارەیەکی دیاریکراوی کورد لە ئارادا نەبووە، لە ڕابردوودا کورد بەرلەوەی خۆی وەك گەلێك (نەتەوەیەك) بناسێ لە ژێر ناوی ناوچەو هۆزدا خۆی ناساندووە. هەر بۆیەش بەر لە سەدەی بیستەم کێشەی کورد زۆرتر ناوچەیی بوو. ڕاپەڕینی گشتی لە ئارادا نەبوو. ئەو کات، سیستمی حکومەتی ئێران و عوسمانی تەواو لە سەر بنەمای نەتەوەیی نەبوو، بەڵام ئەو سەردەمیش داگیرکەرانی دەسەڵاتی کورد بزووتنەوە ناوچەییەکانیان بە سەربزێوی "کورد" ناو دەبرد بۆ داگیرکەران هەموو ناوچەو هۆزەکان کە خاوەنی ناوی جیا بوون بە کورد دەناسران. دەکرێ بڵێین بەر لەوەی کورد بۆ خۆی قەوارەیەکی سیاسیی لەبەرچاو بگرێ، دەسەڵاتە زاڵەکان و دەرەکێکان قەوارەیەك بۆ کورد قایل بوون.

لە سەدەی بیستەم بناغەی دەوڵەتی نوێی ئێران لەسەر بیری نەتەوایەتی دامەزرا، دەوڵەتی عوسمانیش وردە وردە کەوتبۆ دەست تورکە نەتەوەخوازەکان، پاش شەڕی یەکەمی جیهانی دەوڵەتی عوسمانی دابەشکرا، کێشەی کورد گەیشتە لوتکەی خۆی، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە بەپێی بەرژەوەندی داگیرکەر (بە تایبەت بەریتانیا) لە بەرینایی ئەمپراتوری عوسمانی دەوڵەتگەلێك پێکهاتن کە کوردستانی بندەستی عوسمانی بە قەرارەی چەند دەوڵەتی تازە پێکهاتوو بوو، هەر یەك لەو دەوڵەتە تازە پێکهاتووانەش– وەك عێراق و سوریا– لەسەر بنەمای نەتەوەی تایبەت (عەرەب) دروستکران، لەو نێوەدا گەلی کورد کەوتە ژێردەستی ئەو (دەوڵەت– نەتەوە) تازە پێکهاتووانە، کێشەی کورد لە عێراق بەرهەمی ئەو

پرۆژەیە بوو کە بەریتانیا دایبەزاند، لەو بەینەدا گەلی کورد بە ویستی داگیرکەر لە نێو ئەو دەوڵەتە داتاشراوانەدا بە کەمایەتی دەرهێندرا.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی کورد لە هەر وڵاتەی ڕاپەڕینی خۆی دەستپێکرد، دیارە بەر لەسەردەمی پێکهاتنی (دەوڵەت– نەتەوە)ی تایبەت بە تورك، عەرەب و فارس (کە بەسەر کورددا زاڵن و مافی چارەی خۆنووسیان لە گەلی کورد زەوتکردووە) کێشەی کورد لە ئاستی ئەوڕۆدا نەبوو، هەڵبەت ناکرێ بڵێین چ کێشەیەکیش لە ئارادا نەبوو. بەڵام کێشەی نەتەوایەتی بە مانای هاوچەرخ لە ئارادا نەبوو، بەڵام کێشەی کوردو تورك، کوردو عەجەم لە ئارادا بوو (لە سەردەمی عوسمانیدا کێشەی کوردو عەرەب بەرچاو نەبوو).

یەکێك لە تایبەتمەندێکانی (دەوڵەت– نەتەوە) پاوانی دەسەڵات و سامانی وڵاتە لە بندەستی نەتەوەی باڵادەستدا، گەلی بندەست بە خاوەن خاك ناناسرێ، وەك پەنابەرو بیانە چاوی لێ دەکرێ. ئەگەر نەتەوەی بندەست سەبارەت بەو بێ عەداڵەتییە دەنگهەڵبڕێ، دەسەڵاتدارەکان دەڵێن ئەوە داوای بەشداری لە خاك و زێدی مەدا دەکات، هەر بۆیەش بە بیانوی دابەشکەر سەرکوتی دەکەن. لە حاڵێکدا بنەمای سنووری ئەم وڵاتانە لەسەر ویستی دانیشتوان (کوردان) پێکنەهاتووە، بەڵکو بەزۆر بەسەریاندا داسەپاوە.

ئەوەی مێژوو نیشانی دەدا ناوی کورد لە دوای هێرشی موسوڵمانان گەشەیساند لە سەردەمی هێرشی عەرەباندا کوردان لە بەرامبەر هێرشەکاندا ڕاوەستان، دوای باوەڕ هێنان بە ئیسلام کورد خزمەتێکی زۆری بە ئیسلام و زانستی ئایینی دەستپێکرد، بەڵام ئەو سەردەمیش کوردان بە گشتی بیرێکیان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەك بۆ گەلی خۆیان نەبوو( بۆ نموونە، لە هەڵسەنگاندن لە تەك فارس و تورکدا). دەڵێن ئەبوموسلیمی خۆراسانی کورد بووە، ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست بێ، بێ سیاسەتی و بێ ستراتیژی کورد نیشان دەدا، کورد خۆی بەکوشتداوە تا ئیدی بە دەسەڵات بگەن خۆ بەکوشتدان بۆ ڕاگرتنی دەسەڵاتی بیانە، لە دوای ئیسلامەوە تا سەردەمی هاوچەرخ ڕەوتی سیاسیی کورد بووە.

(ترکان خاتون) خێزانی مەلیکشا دوای نەمانی مێردەکەی بۆ وەدەستهێنانەوەی دەسەڵات ڕووی لە کرماشان کرد، کوردان لە فریای هاتن و (٤٠) هەزار کەس وەدوای کەوتن چوونە ئیسفەهان، دوایی بۆ لای قەزوێن و قەڵای هەڵەمووت هەڵکشان، زۆرتری ئەو کوردانە هەڵوەدا بوون، ئەوان بۆ ئەوەی (ترکان خاتون) لە دەسەڵات نەکەوێ، خۆیان بەکوشتدا! بەڵام ئەو سەردەم ئەگەر هەست و بیری کوردبوون و کوردایەتی لە ئارادا با، دەکرا بە (٤٠) هەزار سوپایی دەسەڵاتێك لە چەشنی سەلجوقێکان دابمەزرابا مێژوو هەست و بیرێکی ئەوتۆ لە ناو کورداندا نیشاندنادا.

هاتنی ئیسلام بۆ کوردان وەك ڕاپەڕینێکی زۆر گەورە بوو، کوردی نەدیار هاتە ڕوو، وردە ردە دەسەڵاتی ناوچەیی کورد دامەزرا، بەڵام ئەو سەردەم ئەگەر نەڵێین بیری کوردایەتی لە ئارادا نەبووە، دەکرێ بلێین بەرچاو نەبووە، لەحاڵێکدا فارسەکان دوای هێرشی موسوڵمانان لە بنەوە هەستی زیندوڕاگرتنی دەسەڵاتی پێشوویان لە بیر بوو. فیردەوسی وێنەی زیندوو ڕاگرتنی ئەو بیرەیە، تورکانیش بە هاتنی ئیسلام ڕێگایان بۆ دامەزراندنی گەورەترین دەسەڵاتی مێژوویی کرایەوە. پرسیار ئەوەیە بۆ لە نێو کورداندا بیرێکی ئەوتۆ بۆ پێکهێنانی قەوارەیەك بۆ کورد لە ئارادا نەبوو؟

هۆزە تورکەکان، کە بە هێرشی موسوڵمانان دەرگای ئێرانیان بەرەو ڕوو کرایەوە، بە لێشاو خۆیان لە ناوچەکان ئاخنی، لە سەرەتا وەك غوڵام جێی خۆیان کردەوە، دواتر توانیان لە 'غولام"ی ڕا خۆ بگەیەننە سەر تەختی پادشایەتی و گەورەترین ئەمپراتوریان لە جیهاندا بونیادنا کە ئێستاش ئاسەواری هەر ماوە، بەڵام کورد قەت ئەو توانایەی لەخۆ دەرنەبڕی کە تەنانەت قەوارەیەك لە کوردستان دروستبکات. ئەو سەردەم کوردیش دەستی هەر بەئەو چەکانە ڕادەگەیشت کە تورك و عەرەب هەیانبوو. بەڵام "بیر"ی دامەزراندنی دەسەڵات و قەوارەیەك بۆ کورد، لە ئارادا نەبوو.

لە ڕوانگەی مێژوویییەوە، تا ئەو دواییانە کورد خۆی بەنەتەوە دانەناوە. لەو نێوەدا نەتەنیا ئیسلام تاوانبار نییە، بەڵکو ئەگەر کورد بیری نەتەوەگەری ببایە، ئیسلام وەك هۆکارێك لە فریای دەهات، وەك لە فریای تورکان هات.

ئەگەرچی لەو ماوەیەدا کوردیش پێناسەی نەتەوایەتی خۆی پاراست، بەلام وەك تورك ئایینی ئیسلامیی نەکرد بە ئامرازی دامەزراندنی دەسەلات و دەوڵەت، سەرکردەکانی تورك لەسەرەتاوە ئیسلامیان کردە ئامرازی ڕاوو ڕووت و داگیرکەری و تالان و کوشتار بە نێوی پەرەپێدان بە ئیسلام.

سوڵتان مەحموود (غەزنەوی) لە ڕۆژهەلات و هیند بە ناوی ئیسلام ئەوەندەی تالان و کوشتار کرد کە ئێستاش ئاسەواری هەرماوە، دوای سوڵتان مەحموود تورکانی غەز ڕوویان لە تالان و کوشتاری خەڵکی موسوڵمان نا. دواتر تورکی بەناو سەلجووقی هێرشی خۆیان دەستپێکرد، بەلام ئەوان ڕوویان لە ڕۆژئاوا کرد بەسەر کوردستاندا تێپەڕین و هێرشیان بۆ ڕۆم برد، تورکان بە مەبەستی "دوا ڕۆژ" هێرشیان دەبردە سەر ولاتی بندەستی یونانێکان (ڕۆمی ڕۆژهەلات)، بەلام کوردان لە "کات"دا دەژیان و گوێلەمستی سەرکردە تورکەکان بوون بیری دواڕۆژیان نەبوو، لە بەرامبەر کورداندا تورکان لەسەر ڕێکخستن بوون، دەسەلاتی گەلی خۆیان لەبەر چاو بوو. سەرکردەو هێزەکانی تورك بە زمانی گەلانی بندەست نەدەدوان بەڵکو گەلانی بندەستیان وادار دەکرد بە تورکی بدوێن، کاتێك کۆمەڵگەیەك لە بیری دواڕۆژی خۆیدا نەبێ درەنگ پەی بە کێشەی خۆی و داگیرکەرو زۆرداران دەبا. کورد تا دروستبوونی دەوڵەتی سەفەوی لە ماوەی (٥٠٠) ساڵدا بیری لە خۆی نەدەکردەوە، دەنا هیچ نەبێ دەیتوانی لە بەرامبەر پەلاماری تورکمانانی قەرە قۆینلو و ئاق قۆینلو بوەستێ. بەلام نەبوونی بیرێکی هاوبەش بۆ یەکگرتوویی لە کوردەواریدا چارە ڕەشی دواتری بەدواوە بوو کە ئێستاش هەر درێژەی هەیە، ئەو سەردەم کورد لەوە حاڵی نەبوو کە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، دەسەلاتی بچووك وەك ئەمارەتەکانی کورد نەیدەتوانی سەروەری خۆی بپارێزێ. پێویست بوو دەسەلاتی بەرین و یەکگرتوو پێکبێ، نەك ئەوەی لەبەر بێدەسەلاتی

پەنا بۆ تورکان بەرن، خۆیان وەبن باڵی وان بدەن و بە ویستی تورکان پەلاماری یەکتر بدەن.

بەداخەوە، کورد لە مەودای بیری سیاسییدا لاوازە، کورد بیری لەوە نەکردۆتەوە دەسەڵاتی بەرەی مرۆڤ گرێدراوی سیاسەتە. ئەمارەتە کوردەکان لەو ڕوانگەی سیاسیی نەگەیشتە ئەو ئاستە کە چۆن دەتوانن دەسەڵاتی خۆیان ڕابگرن. ئەمیرە کوردەکانیش بیریان لە قەوارەیەك بە نێوی "کورد" نەدەکردەوە! وێدەچێ هەر بۆیەش لە فیکری یەککگرتووییدا نەبوون. بە واتای ئەوڕۆ کورد ستراتێژی یەککگرتوویی ناسیۆنالیستی نەبووە، کورد ئەو سەردەم وشیارو ئاگادار لە ئەوزاع نەبووە، دۆست و دوژمنی وڵات و گەلی خۆی نەناسیوە. ئیستاش لەو بارەوە لاوازە.

هەزار ساڵ لەمەوبەر کاتێك تورکمانەکان هێرشیان دەهێنا، ئەگەر دەسەڵاتە میرنشینەکانی کورد بیرێکی ڕوونی سیاسییان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەك هەبا، پشتی یەکتریان دەگرت. لە بیری دواڕۆژدا دەبوون، بەڵام کوردان لێکدا فریوی تورکانیان دەخوارد، یان دەکرێ بڵێین خزمەتیان بە وان دەکردو خیانەت بە خۆیان، لە واقیعدا کێشەی کورد زۆر کۆنە، بەڵام ئەو کێشەیە بەر لەوەی دەرەکی بووبێ ناوەکی بووە. کورد لە فیکری دامەزراندنی دەسەڵاتی تایبەت بە وڵات و گەلی خۆی نەبووە. ئەوە عەرەب و تورك بوون کە پەیان بە بوونی قەوارەیەك بە نێوی "کورد" بردووە. عەرەبان وشەی کوردیان وە سەر زارو ڕاوێژی مێژوونووسان خست و کردیانن بە (ئەکراد)!

تورکانیش زۆر زوو کوردیان ناسی، هەوەڵجار سوڵتان سەنجەری سەلجوقی بوو کە نێوی کوردستانی هێنایە ناو جوغرافیای سیاسیی وخستییە بەر دەستی مێژوونووسان، ئەوە تورك بوون کە پەیان بە مەترسی قەوارەیەك بە نێوی کورد بردو تێگەیشتن ئەو گەلە (کە لە هەر ناوچەیەك خۆی بە نێویك دەناسێنێ)، مەخابن هەموو کوردن، سوڵتان سەنجەری سەلجوقی بوو کە لە مەودای جوغرافیای سیاسییدا وڵاتێکی زۆر بەرچاوی ئەو گەلەی بە "کوردستان" دەستنیشان کرد، هەڵبەت ئەو نێوە پێش تریش هەبووە، بەڵام کوردان بە تێکڕایی

جەختیان لەسەر ناساندنی کوردستان وەك نیشتمانی گەلی کورد نەکردووە، ناوچەی میرنشینە کوردییەکان باری سیاسییان هەبوو، بەڵام کوردستان باری سیاسیی نەبوو کوردان بیرێکی سیاسییان بۆ ناساندن و دامەزراندنی دەسەڵاتێك لە وڵاتەکەیان نەبووە، دواتر کاتێك کوردان کەمێك پەیان بە ناسینی خۆیان برد، کار لەکار ترازابوو، تازە ئەو کاتیش میرە کوردەکان، بەرژەوەندی بنەماڵەی خۆیان بەرزتر لە بەرژەوەندی وڵاتێك بە نێوی کوردستان و گەلی کورد بە تێکڕایی دادەنا.

ئەو سەردەم ئەمارەتەکان بە ئەو نێوانە دەناسران: ئامێد (دیاربەکر)، ئەردەڵان، بابان، بتلیس، بۆتان، حەکاری، موکری و... ئەو ئەمارەتانەش هەریەکە لە فیکری ڕاگرتنی دەسەڵاتی خۆیاندا بوون. شارەزایەکی باشی سیاسییان لە چەمك و ئاستی کورد لە ناوچەدا نەبوو. کێشەی کورد بەر لە ئەوەی دەرەکی بێ ناوەکی بوو، هەر ئەمارەتێك ئەگەر بۆخۆشی نەیویستبا، لە بەرژەوەندی دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی بە گژ هاوسێکەیدا دەکرا! بەڵام زۆرجار ئەمیری کورد بۆ تێکشکاندنی ڕەقیب یان هاوسێ کوردەکەی یاریدەی دەسەڵاتە زاڵەکانی دەدا.

**+ هەروەکو خۆیشت لە نووسینەکانتدا باسی دەکەی کورد نیشتمانەکەی لەلایەن هەردوو زلهێزی عوسمانی و سەفەویەوە دابەشکراوەو سەربەخۆییان لە دەستداوە، بەبۆچوونی تۆ چی ئەم دوو دەوڵەتەی هانداوە کە بەو شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ کورد بکەن؟ لە کاتێکدا ئەم دوو زلهێزە بە ناوی ئایینەوە حوکمیان کردووە؟**

ئەبریشەمی: لەمەڕ ئەو پرسیارە: "ئەم دوو زلهێزە (عوسمانی و سەفەوی) بە ناوی ئایینەوە حوکمیان کردووە" لە وەڵامەکانی پێشوو نیشان درا، دەوڵەتانی ئیسلامیی لە سەردەمی موعاویەوەوە تا ئەوڕۆ سەلماندویانە کە ئەوان لە سیاسەت و حکومەتدا ئیسلامیان وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن، ڕاگرتن، پەرەپێدان و مەشروعیەتدان بە دەسەڵات (دەوڵەت) بەکار بردووە.

دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەت دوای سەرهەڵدانی (شا ئیسماعیلی سەفەوی)، خۆی بە جێگرو درێژەی رەوتی خیلافەتی ئیسلام دادەنا،(وەك ئەبوبەكری موسەنیف لە ئاخرێكانی سەدەی ١٦ لە مەڕ كردەوەی سوپای ئەو دوو زلهێزە لە گوندەكەی خۆی بە ناوی (چۆڕ)، لە نزیك هەورامان لە ٩٨٩ ك.م. دەڵێ:

گهی از ڤالمان اهل اسلام به غارت می شدی هر صبح و هر شام

گهی از جور مأمور قزلباش، نهان می گشتم اند شعب هر تاش).

سەفەوێكانیش لە ڕوانگەی مەزهەبی شیعەوە ئاستێكی ئەوتۆیان بۆ خۆیان لەبەر چاو گرتبوو بەڵام هەردوو لا ئاینیان وەك "ئامراز" بۆ مەشروعیەتدان بە كارە نامەشروعەكانیان بەكار دەبرد.

**+ لە مەڕ وەڵامی ئەو پرسە بەبۆچوونی تۆ چی ئەم دوو دەوڵەتەی هانداوە كە بەو شێوەیە ڕەفتار لەگەڵ كورد بكەن؟**

ئەبریشەمی : بە كورتی دەكرێ بڵێین فرەخوازی وان و بێ فیكری خۆمان! جیاوازێكی بەرچاو لە نێوان كوردو هاوسێكانی بە تایبەت تورك و عەجەم لە گۆڕەپانی بیرو كردەوەی سیاسییدا دەبیندرێ (لە كوردەواریدا بە ئێرانیانی نە كوردی شیعە دەڵێن عەجەم). لە وەڵامەكانی پێشوو ئاماژە بەوەكرا توركان خوازیاری دامەزراندنی دەسەڵاتی گەورەو بەرینن، لە حاڵێكدا كوردان لە سەرەتاوە بە دەسەڵاتی ناوچەیی قەناعەتیان كردووە، ئێستاش ناوچەگەری باو لە ناو كوردان، پاشماوی ئەو ڕەوتەیە، بەڵام بەو حاڵەشەوە كوردان لە مەودای بیری سیاسیی (بۆ ڕاگرتنی ئەو دەسەڵاتە ناوچەییانە) لاواز بوون، ئەوان نەیانتوانیوە پێویست بوونی یەكگرتوویی و هاودەنگی ئەمارەتەكان بەخۆیان بسەلمێنن، كوردان لەوەتەی لەم بەشەی جیهاندا ناسراون تا ئەو دواییانە بیرێكی بەرچاویان لە دامەزراندنی قەوارەیەك بۆ كورد نەكردۆتەوە، دەسەڵاتی بچووك بە تایبەت لە رابردوودا (كە دەوروبەری پڕبێ لە دەستدرێژكەر) نەیدەتوانی دەسەڵاتی خۆی ڕابگرێ، ئەوڕۆ سیستمی ناو نەتەوەیی تا ڕاددەیەك بەرگری لە دەستدرێژی دەكات، بەڵام ئەگەر كورد لە دوای ئیسلامەوە بیری لە خۆی و گەلێك

به نێوی كوردو وڵاتێك تایبهت بهو گهله كردباوه ئهوڕۆ له ڕێژهی وڵاته سهر بهخۆییهكان بوو.

وهك ئاماژهی پێكرا، له ڕۆژههڵات له سهرهتاوه دهسهڵاتی دهوڵهت به نێوی ئایین بووه، لهو ماوه درێژهدا ئایین ههر بۆ مهشروعیهتدان بهدهسهڵات بهكار بردراوه، لهسهدهی بیستهم توركه نوێخوازهكان دهوڵهتی به نێو خیلافهتی ئیسلامیی عوسمانیان وهلانا، لهم ناوچهیه دهوڵهت چ به نێوی ئایین، چ به نێوی نهتهوهگهری و سێكۆلار له سهرهتاوه له بهرژهوهندی گشت هاونیشتمانانندا نهبووه.

له لایهكی دی نیشتمانی كورد كهوتۆته مهودای تێكبهزینی ڕۆژههڵات و ڕۆژئاوا، ئهو دوو لایهنه (ڕۆژههڵات و ڕۆژئاوا) به درێژایی مێژوو ڕقهبڕكێی و شهڕو شوڕیانه (وهك دهڵێن ۹۰٪ شهڕهكانی مێژوو لهم ناوچهیه ڕوویانداوه).

لهو نێوهدا كوردستان بۆته مهیدانگهی ئهو شهڕو ڕقه بڕكێیه: شهڕ خۆی لهماڵی كورد ئاخنیوه، نیشتمانی لێ دابهشكراوه، ماڵی به تالان چووه، به تۆبزی له زێدو نیشتمانی خۆی وهدهرندراوهو ڕهوانهی تاراوگه كراوه.

دهكرێ هێرشی خهشایار شای ئێرانی بۆسهر یۆنان (كه ڕقه بركێی وهرزشی ناو نهتهوهیی ماراتۆنی لێكهوتۆتهوه)، وهك سهرهتای مێژوویی دیاریكراوی شهڕو پێكههڵپڕژانی ڕۆژههڵاتی ناوهڕاست و ڕۆژئاوا دابندرێ (ئهو ڕهوته ئێستاش ههر درێژهی ههیه)، ماوهیهك دوای هێرشی ئێران بۆ سهر یۆنان ئهوجار ئهسكهندهری مهقدونی له باكووری یۆنانهوه هێرشی بۆ ڕۆژههڵات هێناو دهسهڵاتی ئێرانی تێك و پێكدا. ماوهیهكی درێژ یۆنانێكان بهسهر ئێران و كوردستاندا زاڵبوون، بهڵام دیسان ئێران خۆی ڕاستكردهوه، شهڕو شۆڕ له بهرینایی نیشتمانی كورد ههڵایساوه، به دهركهوتنی ئیسلام دهسهڵاتی ئێران لهناوچوو، بهڵام ڕۆم (بیزانس) خۆی ڕاگرت و شهڕی بهینی موسوڵمانان (ڕۆژههڵات) و ڕۆم (ڕۆژئاوا) ههر نهپساوه، به هروژمی توركان بۆ سهر ئێران و كوردستان ئهوجار هێرشی ڕۆژههڵات به نێوی ئیسلام بۆ سهر ڕۆژئاوا دهستیپێكرد. چوار سهدهی نهخایاند ئهوجار ڕۆژئاوا (ئهوروپا) ئاڵای شهڕی خاچی بهرز كردهوه، به لێشاو بهرهو ڕۆژههڵاتی

ناوەڕاست (وەك بنكەی ئایینی ئیسلام) وەڕێ كەوت، ئەوروپاییەكان بۆ ماوەی (٨٠) ساڵ قودسیان داگیركرد، خەڵكێكی زۆریان كوشت. صەلاحەدینی ئەیوبی ئەوروپاییەكانی لە قودس دەرپەڕاند. زۆری نەخایاند ئەوجار هێرشی مەغۆل لە باكوری چینەوە بۆ سەرڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەستپێكرد، باوەڕ لەسەر ئەوەیە كە ئەو هێرشەش بە تیندانی لایەنگرانی ڕۆژئاوا بۆ سەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست وا بەرین بۆتەوە: (دۆقوزخان)، ژنە مەسیحێكەی هۆلاكۆ مێردەكەی بە لایەنگری لە مەسیحێكان و ئەوڕوپا هاندەدا، لەبارەگای هۆلاكۆدا كاری گەورە بە مەسیحێكان دەسپێردرا، لە دوای هۆلاكۆ (ئەبا ئاقاخان) پەیوەندی لە گەڵ پاپ پێكهینا(٧)، لەو بەینەدا كوردستان كاولكرا دواتر نۆبەی هاندانی حاكمانی توركمان لە ئێران (ئاق قۆینلو)، دژ بە عوسمانی هاتە گۆڕێ، ئەو شەڕانەش لە نیشتمانی كورددا ڕوویاندا، ئەوجار دژایەتی ناوخۆی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، جێگای دژایەتی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای گرتەوە، ئەو شەڕە لە بن نەهاتووانە نیشتمانی گەلی كوردیان كاولكرد، بەلام شەڕی دوو بەرەی ڕۆژهەلاتی (كە بوو بە هۆی وەدواكەوتوویی و كاولكردنی كوردستان)، لە بەرژەوەندی ڕۆژئاوادابوو، بۆ ڕوونكردنەوەی پێوەندی بەرژەوەندی ئەوروپاو شەڕی ناوخۆیی وڵاتە ئیسلامێكان چاوێك لە مێژوو دەكەین:

لە ئاخری سەدەی سێزدەدا دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا، دیسان هێرشی درێژخایەنی ئاسیا بۆ سەر ئەوڕوپا دەستپێكرد، بەلام بە دامەزرانی دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران لە سەرەتای سەدەی (١٦) شەڕی ناوخۆی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست هروژمی توركان بۆ سەر ئەوڕوپا لە كزییدا، دوای ماوەیەك، ئەوروپاییەكان وەك نەخۆشێك چاویان لە دەوڵەتی عوسمانی دەكرد، لە سەدەی نۆزدەدا بەریتانیا كە زۆر بەهێز بوو، بن پێلی ئەو نەخۆشەی (عوسمانی) گرتبوو نەیدەویست وە ئەرزی بكەوێ، لەبەر ئەوەی بەری هێرشی ڕوسیاو هێزەكانی دی لە ئەوروپای پێبگرێ.

بەریتانیا بە بیانووی بەرگری لە توندوتیژی بەدرخانێكان سەبارەت بە مەسیحێكان (كە ئەوانیش لە لایەن ڕۆژئاواوە دنە دەدران و پشتیوانیان لێ دەكرا)

لە دامرکاندنی بزووتنەوەی میرە لێکەوتۆکانی کورد بە نهێنی یارمەتی دەوڵەتە نەخۆشەکەی دەدا!

بەڵام دەوڵەتی سەفەوی لە (١٥٠١ز) بە ڕاسانی مێردمنداڵێك لە بنەماڵەی شێخ سەفیەدینی ئاردەوێلی بە نێوی ئیسماعیل پێکهات، شا ئیسماعیل لە دایکەوە نەوەی شازادەی مەسیحی (ژنی ئوزون حەسەنی ئاق قۆینلو) بوو، بەو چەشنە دەوڵەتی شیعەی سەفەوی دژ بە دەوڵەتانی سوننی (کە هەرە بەهێزەکەیان عوسمانی بوو) ڕاست بۆوە، شەڕو هەڵلا لە نێوان دوو لقی ئایینی ئیسلام هەڵایسا. بەڵام بەشێکی زۆر لە کوردەکان لە ئەسەر هێرش و کوشتاری شائیسماعیل کەوتنە داوێنی دەوڵەتی عوسمانی (ڕێکەوتننامەی بەدلیسی – سوڵتان ١٥١٤ز حەکیم ئیدریس بەدلیسی وەك گوتەبێژو نوێنەری میرنشینەکانی کورد لەلایەك و سوڵتان سەلیمی عوسمانی لە لایەکەی دی).

کاتێك دەوڵەتی سەفەوی لە ڕۆژهەڵاتی عوسمانی قوت بۆوە، عوسمانی یەکێك لە زلهێزەکانی مێژوو دەژمێردراو بەسەر بەشێك لە سێ قارەی ئەوروپا، ئاسیا و ئەفریقا زاڵبوو. ئەوروپاییەکان لە دوای شکستیان لە شەڕەکانی خاچی بە دوای ئەو پرۆسەیەوە بوون هۆیەك بێتە پێش و وڵاتە ئیسلامێکان لە جیات ئەوەی هێرش بەرنە سەر ئەوروپا خۆ بە خۆ بە شەڕ بێن و هێرشی ئاسیا دژ بە ئەوروپا لە ئارادا نەمێنێ، ئەو ئاواتە سەریگرت و کوردستان کرا بە مەیدانی شەڕی وڵاتە ئیسلامێکان و کوردستان کاولکران و ئەوروپاییەکان دەرفەتیان پێدرا کە بەخۆیاندا بێنەوە.

لەوکێشە درێژخایەنەدا کەس کاری بەوە نەبوو شەڕی نێوان سەفەوی و عوسمانی، "نیشتمانی کورد" کاول دەکات. لە کتێبی (سفرنامەهای ونیزیان در ایران(٨). گەڕۆڵێکی ونیزی بە ناوی (ویلچنتۆ دالساندری)، (کە لە سەردەمی شا تەهماسب چاودێری کاروباری ئێران بە تایبەت وڵاتی ئازربایجان بووە)، دەنووسێ: "توانایی شا تەهماسب کاتێك وە دیاردەکەوێ کە بە فەرمانی شاتەهماسب ئەو ئاوەدانیانەی لە دوو بەری سنووری ئێران و عوسمانین (واتە کوردستان) بە پێوانی شەش ڕۆژ ڕێگا کاولکران و سووتێندران، قەڵاکان لەناو بردران...". لە درێژەی

باسەكەدا دەردەكەوێ كە ئەو شەڕانە لە بەرژەوەندی ئەوروپادا بوون، ئەوان لەم دەرفەتانە كەڵكیان وەرگرت و شارستانیەتیان وەپێشخست، بەڵام ئەو چەمكە مێژووی ونكراوی شارستانییەتە، ئەگەر كوردان بتوانن ئەو ڕاستییە بۆ گەلانی جیهان ڕوون بكەنەوە، شارستانییەت بە كوردان قەرزدار دەبێت.

ناسیاوێك لە نیشتمانی كورد ئەوە حاشای لێناكرێ كە كورد لەسەرەتاوە خاوەن نیشمان بووە. خەڵكی هەر ناوچەیەش مەڵبەندی خۆی پاراستووە، بەڵام بەر لە دابەشبوونی نیشتمانی كورد لە مابەینی دوو زلهێزی سەفەوی و عوسمانی كوردان بیرێكی بەرچاویان لە وڵاتێك بە نێوی كوردستان نەكردۆتەوە، ئەگینا دەبوو بۆ پێكهێنانی دەسەڵاتێكی تایبەت بە كوردستان تێكۆشابان، دەكرێ بڵێین: ماوەیەكی زۆر درێژ نییە كە كورد نیشتمانی خۆی وەك قەوارەیەكی دابەشكراو لەبەرچاو دەگرێ، شەرەفخانی بەتلیسی كە (لە سەرەتای سەدەی ١٧)دا كتێبی میژووی كوردستانی نووسی، پەیدابوونی بیرو ڕوانگەیەكی ئەوتۆ نیشان دەدا. ئەحمەدی خانی لە ئاخرێكانی سەدەی (١٧) زۆر بە ڕوونی بیری دامەزراندنی دەوڵەتی یەكپارچەی كوردی لە (٣٥) هەڵبەستدا لە سەرەتای شاكارەكەی "مەم و زین" خستە ڕوو.

ئەگەر لەوانە بگوزەرێین، بەرگەیەك لە ئارادانییە كە بڵێین كوردان خوازیاری قەوارەیەكی تایبەت بە خۆیان بووبن، لە كوردستان هەر ناوچەیەك میرێكی هەبووە، ئەو میرانە هەر لە فیكری ڕاگرتنی دەسەڵاتی ناوچەی خۆیاندا بوون، وادیارە میرەكان نەیانتوانیوە بەسەر وەزعی داسەپاودا زاڵبن، ئەوەش لە سەرەتاوە لاوازی بیری سیاسیی میرە كوردەكان دەگەیەنێ.

لە واقیعدا كوردان بەر لەوەی خۆیان بە گەلێكی "یەكپارچە" و خاوەنی وڵاتێكی "لێكدانەبڕاو" دانابێ، خۆیان بە نێوی ئێل و عەشیرەت و دەسەڵاتی لێكدابڕاو ناساندووە، وا دیارە كوردان لە فیكری دامەزراندنی دەسەڵاتی وڵات (Sovereignty)ێك وەك نیشتمانی گەلی كورد نەبوون.

بۆیەش مێژوونووسەكانی ئیسلامیی تا سەردەمی سەلجوقێكان ئاماژەیەكی ڕوونیان بە وڵاتێك بە نێوی "كوردستان" نەكردووە، دیارە باو نەبوونی نێوی

كوردستان وەك سوژەیەكی سیاسیی لە بیری مێژوونووساندا، بە نەبوونی وڵاتێك وەك نیشتمانی گەلی كورد دانانرێ، ئەو مەبەستەش حاشای لێ ناكرێ، گەلی كورد زۆر درەنگ بە ئەو بیرە سیاسییە گەیشت كە دەبوو نیشتمانەكەی وەك وڵاتیكی خاوەن دەسەڵات، لە دەست خودی كورددابایە، بەڵام كاتێك گەلی كورد بە ئەو بیرە گەیشت، ئەوانەی بەسەر كوردستاندا زاڵبوون لە بەرامبەر ئەو بیرەدا ڕاوەستان، ئەوڕۆ نەتەنیا توركی فرەخواز بەڵكو شۆڤێنیستی عەرەب و ئێرانیش بە بیستنی كوردستان وەك قەوارەیەكی سیاسیی تێكدەچن و هەڵدەبەزنەوە، دیارە ئەگەر كوردان لە سەردەمی هێرشی توركمانەكان یان دواتر خاوەنی دەسەڵاتێكی یەكپارچە بووبان، یان میرنشینەكانی كورد تاڕاددەیەك گوێ لەمستی دەسەڵاتێكی ناوەندی خۆیان بووبان، ئەودەم وڵاتی كوردستان وەك قەوارەیەك خۆی دەنواند. بەڵام لە سەرەتاوە بیرو بابەتێكی ئەوتۆ لە نێو كورداندا نەبووە.

لە واقیعدا بەر لە ئەوەی كوردان خۆیان وەك سوژەیەكی سیاسیی (گەلێكی خاوەن دەسەڵات) لەبەر چاو بگرن، ناكوردەكان (وەك سەلجوقێكان) بوون كە گەلی كوردو نیشتمانەكەیان وەك قەوارەیەك دۆزیوەتەوە. دیارە ئەو باسە زۆر بەرینەو ناكرێ بە ساكاری قسەی لەسەر بكرێ، بەڵام وادیارە ناسینی كورد وەك قەوارەیەك لە ناو هاوسێكان زووتر خۆی نواندووە. ئەرێ دەكرێ بڵێین كوردان لە سەرەتادا خۆیان لە بازنەی سیاسیی و فەرهەنگی وڵات و گەلانێك بە نێوی ئێران و ئێرانی دۆزیبێتەوە؟ یان خۆیان دامەزرێنەری قەوارەیەك بەم ناوە بووبن؟

بەڵام دوای ئیسلام تا قوتبوونەوەی شائیسماعیل (١٥٠١ز)، دەسەڵاتێك بە ناوی ئێران لە ئارادا نەبوو، لەو ماوە درێژەدا دەسەڵاتی سیاسیی وڵاتی بەناو ئێران لە دەست شیعەكاندا نەبوو كە لەڕوانگەی مەزهەبەوە جیا لە هاوسێكانی بێ، میرنشینە كوردەكانیش هەر دەسەڵاتیك لە دەوروبەریان دا زۆردارتر ببا، بە چەشنێك بە لای ویدا دەشكان، تەنانەت بە ویستی ئەوانیش هەڵدەسوڕان.

هەروەها لەو ماوە درێژەیەدا كوردستان نە یەكپارچە بوو نە وڵاتی جیا لە نیشتمانی كورد، بەڵام بەدامەزراندنی دەوڵەتی شیعە لە ئێران، كورد دابەشبوونی بەسەردا سەپا، بەشی زۆری میرنشینەكانی كورد بەلای عوسمانیدا شكان،

بەشێکی کەم بە بەری ئێرانەوە ما، بۆ ڕوونکردنەوەی ڕەچەڵەکناسی مەبەستەکە لە هاتنی ئیسلامەوە دەستپێدەکەین کە لە سەدەی حەوتەمی زایینی، عەرەبان بەسەر کوردستاندا زاڵبوون، لە سەدەی نۆدا کوردان لە ناوچەکاندا بوونە خاوەن دەسەڵات، بەڵام ئەو دەسەڵاتانە بە نێوی کورد نە بوون، بەڵکو بە نێوی بنەماڵەکان یان ناوچەکان بوون، هەڵبەت ئەو سەردەم ئەو ڕەوتە لە دەرەوەی کوردستانیش هەر وابوو، لە سەدەی یازدە هێرشی تورکان دەستی پێکرد، بەڵام کوردان لە دوای ئەو هێرشە، تا ڕادەیەك دەسەڵاتیان هەر بە دەستەوە ما.

کاتێك دەسەڵاتە تورکەکان بێ هێز دەبوون، میرنشینە کوردەکان بەهێز دەبوون. چەمکی سیاسیی وڵات وای لێهات کە گەلانی ناتورکی ئەو ناوچانە لایان وابوو دەسەلات و پادشایەتی تایبەت بە تورك و تورکمانە!

لە سەدەی سیازدە هێرشی مەغۆل دەستیپێکرد، کوردستان کاولکرا (جاناتان رندێل) دەڵێ:"مەغۆلان کشتوکاڵی کوردستانیان وا لەناوبرد کە بەرهەمی کشتوکاڵ سەد ساڵ دواتر، دە لە سەدی بەر لە هێرش بوو"٨

لێرەدا نابێ لەوەش چاو داپۆشین کوردان ئەگەر بەری کشتوکاڵیان لێ دەگیرا، لە پڕبەرەکەتی وڵاتەکەیان کەڵکیان وەردەگرت و بژێوی خۆیان لێ وەدەست دەهێنا، لە سەردەمێکی ئەوتۆدا زۆرتر ڕوویان لە ئاژەڵداری و کۆچەری دەکرد وەدوای مەڕوماڵات دەکەوتن، هەر بۆیەش لە مەودای کۆمەڵایەتی، شارستانیەت، شێوازی ژین و پێکهێنانی بژێو بۆ دواوە دەگەڕاندرانەوە.

بەڵام دیسانیش کوردان توانیان دەسەڵاتە ناوچەییەکانیان دامەزرێننەوە، لە ئەوانەی کە هەوەڵ جار توانیان مەغۆلان تێکبشکێنن کورد بوون، "لەساڵی ١٢٩٢ز./ ٦٧١ک.م. (الملك القاهر بیبرس)، کە لە بنەماڵەی صەلاحەدینی ئەیوبی بوو، مەغۆلەکانی تێکشکاند"٩. کاتێك لە سەرەتای سەدەی شازدە بنەماڵەی سەفەوی دەسەڵاتی شیعەیان لە بەرامبەر عوسمانی سوونی دانا، دەسەڵاتەکە بەنێوی "ئێران" ناسرا، ئەگەرچی مەبەستی شا ئیسماعیلی مێردمنداڵ دامەزراندنەوەی دەسەڵاتی وڵاتێك بە نێوی ئێران نەبوو. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی لە سەرەتاوە بە ناو "تورك" حوکمی کردووە.

**بەكورتی:**

١- كوردان لە دوای هێرشی موسوڵمانان وەك هێزێكی كۆمەلایەتی، سیاسیی ناویان كەوتە سەر لاپەرەكانی مێژوو.٢- دەسەلاتی ناوچەیی كورد دامەزرا.٣- كوردان لە بیری دامەزراندنی قەوارەیەك كە زۆرتری ناوچە كوردییەكان بگریتەوە نەبوون.٤- سولتان سەلاحەدیین ئەیوبی كە كوردبوو لە دەرەوەی كوردستان دەسەلاتێكی گەورەی پێكهێنا، ئەو دەوڵەتەی بنەماڵەی صەلاحەدین دایانمەزراند بە ناوی كورد نەبوو. جیاوازی كوردو هاوسێكان لە ڕووانگەی چاندو سیاسەتوانی توركان لە سەرەتاوە لە بیری قەوارەی گەورەی سیاسییدا بوون، ئەوە ڕەوتی جیاوازی سایكۆلۆژی، چاند و بیری سیاسیی لە نێو كورد و تورك نیشان دەدا. ئەگەر بیر لەوە بكەینەوە كە كوردەكانیش لەو سەردەمدا هەر ئەو چەكانەیان بەدەستەوە بوو كە توركان هەیانبوو، ئەو پرسە لە ئارادایە بۆ كوردان لە دوای هاتنی ئیسلام وەك توركان بۆ دامەزراندنی قەوارەیەكی گەورە (كە تەواوی كوردستان دابپۆشی) هەوڵیان نەداوە ؟

هەڵبەت ئەو پرسیارە بۆ ئەوە نییە كە كوردیش دەبوو وەك دەسەلاتی هاوسێكانی داگیركەر ببا ، بەڵكو دەبوو بیانزانیبا كە بە دەسەلاتی بچووك نەدەكرا لە بەرامبەر دەسەلاتی گەورەتر رابوێستن. ئەوەش كورتبوونی بیری سیاسیی كورد نیشان دەدا، دەنا كوردیش هیچ نەبا باشتر دەیتوانی قەوارەی خۆی لە ناوچەكاندا بپارێزێ.

پاش هێرشی تەیموری شەل بۆ سەر كوردستان و كاولكردنی سەر لە نوێی ئەم وڵاتە، دیسانیش كوردان دەسەلاتە ناوچەییەكانیان ساز دایەوە. بەلام ماوەیەكی نەخایاند دوو هۆزی توركمانی (ئاق قۆینلو و قەرەقۆیندلو) دەستیان بە داگیركردنی ناوچە كوردییەكان كرد، هۆزی یەكەم نەیتوانی تەواوەتی كوردستانی باكور داگیر بكات، بەلام حەسەن بەگ (ئوزون حەسەن) (لە بەرەی ئاق قۆینلو)، بە زۆرو فێڵ و تەڵەكە دەسەلاتە كوردییەكانی هەڵچنی.

(والتێر هینتس)، لەو بارەوە دەڵێ: "كاری دەست بەسەركردنی كوردان كە قەرە قۆینلۆكان دەستیان پێكردبوو، لە ساڵی (٨٧٤ك.م) بە دەستی ئوزون

حەسەنی ئاق قۆینلو بە ئەنجامگەیشت"(١١). بە گوتەی (هینتس) لەهەمان سەرچاوە، ماوەیەك دواتر، کوردان دیسان سەربەخۆیی خۆیان بەدەست هیناوە، بەڵام دواتر بەدەستی شا ئیسماعیلی یەکەم، نەوەی جونەید (سەفەوی ن.) و ئوزون حەسەن، سەرکوتکرانەوە. (مارتا دایکی شا ئیسماعیل، کچی ژنە شازادە مەسیحێکەی ئوزون حەسەن بوو کە بە ویستی خۆی لە دەربار‌دا هەر مەسیحی مابۆوە، ن. )، هینتس لە درێژەی باسەکەدا دەڵێ: ئەوجار هەر دوو قەبیلەی (ئاق و قەرە). بەیەکەوە پەلاماری کوردانیاندا.

(هینتس) لە بارەی چەمکی ئەخلاقی، سیاسیی و کۆمەڵایەتی کورداندا دەڵێ: ئوزون حەسەن، قەڵای بەناوبانگی "حسن کێف"ی گەمارۆدا. (ملك خلف) لە بنەماڵەی ئەیوبی مەشهور بە جەف سوور بە سەرسەختی لەبەرامبەر گەمارۆی قەڵاکەی راوەستا، بەڵام یەکێك لە برازاکانی مەلیك فریوی تورکمانانی خواردو مامی خۆی لە نێو حەمامدا کوشت، قەڵا لە (٨٦٦ / ١٤٦٢)وە دەست تورکمانان کەوت، یەکێك لە براکانی مەلیك و تەواوی ئەمیرانی "حسن کێف" کوژران، لەشکری کوردان بە دیل گیراو بۆلای دیاربەکر (کە پێشتر داگیرکرابوو) ناردرا، (هەمان سەرچاوە).

لە گەمارۆی بەتلیس، ئەمیر ئیبراهیم کە سێ ساڵی خۆی ڕاگرت لە ئەسەر نەخۆشی و قاتی و قڕی، بەڵێنی بۆ دەست هەڵگرتن لە بەرگری راگەیاند. هەر لەو سەردەمدا ئەمارەتی حەکاریش وەبەر هێرش کەوت. بەڵام بە گوتەی شەرەفنامە، مەلیك عیزەددین کە زۆر ئازا بوو شەری نەکرد، ئەو گوتبووی: چۆن تورکان لە ڕۆژی چوارشەمە هێرشیان هێناوە، ئەو نایەوێ شەر بکا ! تورکمانەکان گرتیان و کوشتیان.

نیشتمانی کوردان دابەشبوونی بەسەردا سەپا (وەك هەڵبژاردن لە ڕووی ناچارییەوە). پرۆفیسۆر ئیسماعیل حەقی ئوزون چارشلی(١٢). مێژوونووسی بەناوبانگی تورك، دان بەو ڕاستییەدا دەنێ کە ڕۆژهەڵاتی ئاناتۆلی لە ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانیدا نەبوو. ئەو ناوچە کوردستانیانە بە شەڕ وەبەر عوسمانی نەکەوتن، بەڵکو لەسەر ڕێکەوتننامەی بەینی ئەمارەتە کوردییەکان بە چاودێری

حەکیم ئیدریس بدلیسی و دەوڵەتی عوسمانی بوونە هاوپەیمانی عوسمانی، لەو بەینەدا حەکیم ئیدریسی بەدلیسی پێکهێنەری ڕێکەوتننامەکە لەگەڵ سوڵتان سەلیمی عوسمانی بوو(١٥١٤ز)، لەو بڕیارەدا کوردان مافی دامەزراندنی دەسەلاتی ناوچەیی و هەڵبژاردنی میری ئەمارەتیان هەبو بەڵام چ ڕێکەوتننامەیەك لە نێوان گورگ و مەڕدا بەردەوامە؟! وەك عوبەیدی زاکانی دەڵێ" گربە شد عابدو مسلمانا" (ئەو کتێبەی عوبەیدی زاکانی لەلایەن کاك ئەحمەدی قازی بە ناوی (کتك و مشك وەرگێڕاوە). دەوڵەتی عوسمانی وردە وردە ئەو دەسەلاتەی لە کوردەکان بڕی، لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەت– نەتەوەی تایبەت بە تورك لە سەدەی بیست، حاشا لە بوونی ولاتێك بە نێوی کوردستان و گەلی کورد کرا.

بەو چەشنە نە تەنیا کوردستان دابەشکرا، بەلکو بوو بە مەیدانی شەڕی لە بن نەهاتووی دوو زلهێزی بە ناو موسوڵمان و هاوسێی کورد (لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستان) دیارە نزیك سەدەیەکە سیستمی دوو دەوڵەتی ئێران و تورك گۆڕدراون و بەیەکەوە شەڕ ناکەن (لە شەڕی یەکەمی جیهانی لەشکری تورکان هاتە ناوچە کوردییەکانی سەر بە ئێران، ئەو هاتنە بوو بە هۆی کوشتارێکی لە ڕادە بەدەر بە دەست دوو لایەنی شەڕەکەوە (ڕووسیای تەزاری و عوسمانی)، بەڵام پڕیشکەکانی ئەو شەڕانەی کە لە سەرەتای سەدەی شازدە دەستی پێکردهەر ماون و کوردو هاوسێکان ئازار دەدەن (نموونەیەکیان شەری عێراق و ئێران) بوو.

ئەو شەڕانەی ناوخۆی موسوڵمانان لە سەرەتاوە وەك کردنەوەی جەبهەی ڕۆژهەڵات بۆ بەرگری لە توندووتیژی هێرشی عوسمانی لە ئەوروپا (ڕۆژئاوا) بوون، ئەو شەڕانە دەرفەتێکی مێژوویی بوون کە بۆ پێشکەوتنی ڕۆژئاوا ڕەخسان، هەر بۆیەش بە ڕاشکاوی دەکرێ بڵێین: ڕۆژئاواو دنیای پێشکەوتوو بە کەڵك وەرگرتن لەو شەڕانە (کە بوون بە هۆی کاولکردنی کوردستان) قەرزداری گەلی کوردن، ئەو شەڕانە کە سەدان ساڵیان خایاند نیشتمانی کوردیان کرد بە مەیدانگەی شەڕی دوو لایەنی جیا لە کورد، ئەو ڕاستییە حاشای لێناکرێ کە ئەو شەڕانە لە بەرژەوەندی ئەوروپا بوون، هەلی سەرلە نوێ ژیانەوەیان (Renaissance) بۆ ئەوروپا ڕەخساند، ئەوەش حاشای لێناکرێ دەستکەوتی ڕێنێانس، بە گشت

جیهان گەیشت و بەشی هەرە زۆری خەرج و خەسارەکەشی وەبەر کوردو نیشتمانەکەی کەوت.

ڕۆژئاوا ئەو هەلەی چۆن بۆ ڕەخسا؟ ئەمارەتە کوردییەکان کەوتبوونە مابەینی عوسمانی و ئەو تورکمانانەی بەسەر ئێراندا زاڵبوون، بەڵام فرەخوازی تورکان لە فریای ڕۆژئاوا هات، تورکمانەکان پەلاماری ئەمارەتە لێکدابڕاوەکانی کوردانیانداو یەك یەك لە ناویانبردن، دەنا زلهێزی عوسمانی بە بوونی ئەو ئەمارەتانە لە سنووری ڕۆژهەڵاتی خۆی (کوردستان) ئەرخەیان بوو، مەترسییەکی نەبوو، بەڵام ئوزون حەسەنی تورکمان ئەمارەتە کوردییەکانی هەڵچنی و بە هیوای یارمەتی ڕۆژئاوا پەلاماری بردە سەر وڵاتی بندەستی سوڵتان محەممەدی فاتیح، کە ئەستەمبوڵی گرتبوو. لێرەدا دەکرێ بڵێین فرەخوازی تورکان لە ڕۆژهەڵات لە فریای ئەوروپا هاتو شەڕ هەڵایسا، دواتر کێشەی ئایینی هاتە سەر فرەخوازی و ئاواتی ئەوروپا لە پێکهەڵپرژانی موسوڵمانان پێکهات. لە دوای پەیدابوونی شا ئیسماعیل زۆرینەی ئەمارەتە کوردییەکان پاڵیان بە عوسمانییەوەدا. بەوچەشنە میرنشینە کوردییەکان نەك تەنیا لێك دابڕان و قەوارەی کورد لەبەر یەکچوو، بەڵکوو میرە کوردەکان وادارەکران پێکهەڵپرژێن، بە تایبەت ئەو ئەمارەتانەی لەو بەری سنوور بوون. زۆرتری کوشتارو تاڵانەکان بەسەرخۆی کورددا دەسەپا!

ئەگەر گەورەترین هۆی لاوازی ئەمارەتە کوردییەکان، فرەخوازی تورکان و بێ سیاسەتی کوردان بووبێ، هاندانی ئوزون حەسەن (تەنانەت لە لای ژنە مەسیحێکەشیەوە) بۆ هێرشبردنە سەر وڵاتی بندەستی عوسمانی بوو بە هۆی بادانەوەی هێرشی بێ بەزەییانەی ئەو زلهێزە بۆ لای ڕۆژهەڵات، عوسمانی دوای پەلامار لە ڕۆژهەڵاتی خۆی ناچار بوو بەشێکی هەرەزۆری هێزەکانی بگەڕێننەوە بۆ لای ڕۆژهەڵات.

لەو بارەوە کە ئوزون حەسەن(وەك پادشای ئێران) لە دژی عوسمانی پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژئاوا گرت، ئەگەرچی ئەوە دواتر بوو کە ئەو پەیوەندییە بەرهەمی لێکەوتەوە، بەڵام سەرەتای شەڕی نێوان ئێران و عوسمانی لە سەردەمی ئوزون حەسەنی سوننی مەزهەب دامەزرا.

(هینتس)، لە ژێر عینوانی "پەیوەندی نافەرجامی ئێران و ڕۆژئاوا" دەڵێ: "بەشێك لە مێژووی ئاق قۆینلو کە بەتایبەت لە باری مێژووی کولتور و شارستانییەت شێرن و ڕەکێشە و پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەشەوە هەیە لەو ئاستەدا جێگای ووردبوونەوەی پترە..."(١٣)، ئەو باسە کە بۆ ئەوروپاییەکان لە باری مێژوویی و شارستانیەت شیرین و ڕەکێشە، بۆ کوردان هۆی لە قەوارە چوون و (٥٠٠) ساڵ کوشتارو وە دواکەوتوویی و کاولبوونی وڵاتە.

تورکی گەورەو تورکی گچکە! سوڵتان موحەممەدی فاتیح، لە (١٤٥٣ز) قوستەنتەنیە (ئەستەمبوڵ) پێتەختی ڕۆمی شەرقی داگیرکرد و کردی بە ناوەندی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی، سوڵتان موحەممەد لە ئەوروپا بە نێوی "تورکی گەورە" نێوبانگی دەرکرد، ئوزون حەسەنیش (لە ئەوروپا) لەقەبی تورکی گچکەی پێدرا، دوای ئەوەی ئوزون حەسەن دیاربەکری لە ژێردەستی کوردان دەرهێنا کردی بە پێتەختی خۆی. (هینتس) کە ئاماژە بە کەسایەتی و مەملەکەتداری ئوزون حەسەن دەکات، دەڵێ: بەرهەمی داسەپاوی داگیرکەری ئوزون حەسەن ئەوە بوو کە ئەو بوو بە یەکێك لە بەهێزترین فەرمانڕەوایانی ڕۆژهەڵاتی نزیك. شێوەی مەملەکەتداری ئوزون حەسەن بەهێز و مەحکەم بوو، بەڵام ئەو مەملەکەتدارییە جگە لە قودرەت تەڵەبی لەسەر چ بنەمایەکی بیروڕا (بەشێوەیەکی شارستانیانە) نەبوو(١٣). ئوزون حەسەن کە دەگەڵ بنکە دەسەڵاتەکانی مەسیحی گورجی و ترابۆزانی (کە ژنەکەی کچی شازادەی وێ بوو) پەیوەندی هەبوو سەفیری بۆ ئیتالیا نارد.

(هینتس) لەوبارەوە دەڵێ: "پاش داگیرکردنی قستەنتەنییە لە ١٤٥٣ دیسان لە ئەوروپا خەونی سەردەمی شەڕی خاچی ژیایەوە. لەساڵی ١٤٥٦ پاپا کالیکستی سێیەم یەکێك لە راهیبانی فرانسیسکانی بە نێوی "لۆدۆیکۆ داپۆلۆنیا"ی ناردە ترابۆزان و گورجستان، ئەو راهیبە تێکۆشەر و کارزانە کاتی گەڕانەوە چاوی بە ئوزون حەسەن کەوت و ئەوی لە نەخشەو بیری داود شا ئاگادار کرد کە لە ترابۆزان جێگری شازادەی ساوا بوو.

(هینتس) له درێژەی باسەكەدا دەڵێ: "دەسپینا خاتون (ژنه مەسیحیەكەی ئوزون حەسەن) مێردەكەی بۆ یارمەتی هاونیشتمانانی هان دەدا، ئەگەرچی ئوزون حەسەن هیوایەكی به توانایی مەسیحێكانی ناوچه نەبوو، بەڵام كاتێك ئەوان نوێنەریان بەرەو ئەوروپا بەرێكرد ئەویش نوێنەری لەگەڵ خستن..."

ئوزون حەسەن بۆ ئەوەی كه ڕەنگه بتوانێ دەسەڵاتی خۆی بەرینتر بكاتەوە، له ساڵی (١٤٧٢ز) سەفیرێكی به نێوی حاجی موحەممەد بۆ ئەوروپا بەرێكرد كه له ئیتالیا پێیان دەگوت "ئازیمائۆمەت" مەبەستی حەسەن بەگ (ئوزون حەسەن) ئەوە بوو بەڵكو له شەڕی خۆی و ئەوروپاییەكان دژ به عوسمانی یاریدەی یەكتر بدەن، له "ونیز" تۆپچی و تۆپخانه وەر بگرێ، سەنای "ونیز"یش نوێنەرێكی به نێوی "كاترینۆزۆنۆ"، كه خوارزای كاترینا دسپینا (خێزانی حەسەن بەگ) بوو به مەنزووری یارمەتی دنیای مەسیحیەت وەرێخست، ئەو نوێنەره له حەسەن بەگی خواست ئیزن بدات چاوی به پووری بكەوێ، دسپینا خاتون بەو كاره(هاوكاری حەسەن بەگ له تەك ئەوروپاو مەسیحێكان، بۆ هێرشبردنه سەر عوسمانی زۆر دڵنیا بوو(١٤).

دەسەڵاتدارانی ئیسلامیی و شەڕی ناوخۆ وەك ئاماژەی پێكرا، دەسەڵات و دەوڵەتی دامەزراو له وڵاتانی ئیسلامیی له دوای خولەفای راشدین، ئیسلامیان وەك ئامرازێك بۆ مەشروعییەتدان به حكومەت به كار بردووە، ئەو شەڕانەی ئوزون حەسەن لەگەڵ میرنشینەكانی كورد و دواتر لەگەڵ عوسمانی (كه هەموویان سوننی بوون) هەڵی ئاساند، له بەرژەوەندی ئیسلامدا نەبوون. بەڵكو له بەرژەوەندی ڕۆژئاواو مەسیحییەتدا بوون، به خوێندنەوەی ئەو بابەتانه دەكرێ بپرسین حوكمكردن به نێوی ئایین چ مانایەك دەدا؟ كام یەك لەو دەوڵەتانەی له سەرەتای ئیسلامەوە حوكمیانكردووە خۆیان به ناموسوڵمان داناوە؟ ئەگەر ناموسوڵمان بوون بۆ موسوڵمانان ئیعترازیان نەكردووە؟ بۆ دوای پتر له سیازده سەدە تازە وەخەبەر هاتوون؟ چ دەلیلێك هەیه ئەوانەی ئەوڕۆ داوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیی دەكەن له دەسەڵاتدارانی سەردەمی موعاویە موسوڵمان تر بن؟

ئەوەی ڕوونە ئەو شەڕانەی لەسەدەی پازدە ڕا لە نێوخۆی موسوڵمانان دامەزراو پتر لە (٥٠٠) ساڵی خایاند، لە دژی بەرژەوەندی وڵاتە ئیسلامییەکان بوون، هێرشی سەدام بۆ سەر ئێران و کوێتیش درێژەی ڕەوتی پێشوو بوو، بۆ لە نێو موسوڵمانان چ دەنگهەڵبڕینێك سەبارەت بەو شەڕانە –تەنانەت سەبارەت بە سەددام–یش لە ئارادا نەبوو؟

لە دەستپێکی شەڕەکان لە (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەرەوە گەلی کورد بە چەکی دەستکردی وڵاتە دژ بە ئیسلامەکان کوژراون و ماڵیان کاولکراوە، دەکرێ بپرسین دەوڵەتانی ئیسلامیی (لە سەردەمی موعاویەوە تا ئەوڕۆ).

١– چ بەرهەمێکیان بۆ گەلانی موسوڵمان هەبووە؟

٢– ئەگەر دەوڵەتانی ڕابردوو بە شەرعیان ڕەفتار نەکردووە، بۆ دەنگهەڵبڕینێك بە شێوازی ئەوڕۆ لە ئارادا نەبووە؟

٣– ئەوانەی ئەوڕۆ بۆ داگیرکردنی دەوڵەت خۆ بەکوشت دەدەن و خەڵکی بێتاوان دەکوژن، چ دەلیلێك هەیە ئیسلامخوازانی ئەوڕۆ لە ڕابردۆکان موسوڵمانتر بن؟

٤– ئەرێ بڵێی ئەوانەی ئەوڕۆ بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و دامەزراندنی دەوڵەت لە سەر بیری ئیسلام، ڕێبازی خۆکوژیان هەڵبژاردووە یان بە شێوازی جۆراو جۆر ڕەشەکوژی و کۆکوژی دەکەن لە دەسەڵاتدارانی سەردەمی زووتر موسوڵمانتر بن؟

**+ زۆرێك لە کوردە ناسیۆنالیستەکان ئیسلام بەوە تاوانبار دەکەن کە هۆکارێك بووە بۆ نەهامەتییەکانی گەلی کوردو ئەم ئایینە بووەتە هۆی ئەوەی کە کورد نەبێتە خاوەنی دەوڵەت، تا چەند ئەمە ڕاستەو واقیعیە؟**

ئەبریشەمی: ئیسلام ئایینێکی جیهانییەو هیچ جیاوازییەکی لە نێوان ڕەش و سپی و تورك و فارس و..هتد دانەناوە. ئەو قسانە بزڕکردنی عەیب و ئیرادی خۆمانن چۆن ئیسلام تەنیا بۆ گەلی کورد بۆتە هۆکاری نەهامەتی و هۆی نەبوون بە خاوەن دەوڵەت؟ لەحاڵێك دا ئیسلام لەسەرەتاوە بۆ تورکان بۆتە هۆکاری دامەزراندنی بەرزترین دەسەڵات و دەوڵەت وەك سوڵتان مەحموودی غەزنەوی

سەلجوقێکان، خوارەزمشایەکان، عوسمانی، تەیموری شەل، تورکمانەکان، قاجار و...هتد؟

له وەلامی پێشوو ئاماژەی پێکرا گەلی کورد بۆخۆی پتر تاوانبارە، کوردانیش وەك فارسەکان نزیك (٢٠٠) ساڵ دوای ئیسلام بنەمای دەسەلاتی ناوچەیی خۆیان دامەزراندەوە، بەلام ئەوان لە چەمکی سیاسییدا زۆر لە کورد خاوەن ئەزموونتر بوون، ئێستاش هەر وان. بۆ ئەوان توانیان پشت ڕاستکەنەوەو سەر لە نوێ ببنەوە دەولەتێکی بەهێز و توانا کە ئەورۆ کایە بەزلهێزەکانی جیهانی دەکەن؟! بۆ کورد لە سەرەتاوە هەروا داماو ماوەتەوە؟ بۆ تاوانی کەمبیری خۆمان بەسەر ئایین دادێنین؟ ئەگەر ئیسلام بووبێتە هۆی وەپاشکەوتوویی، ئەوەش کێشەیەکی تەواوی موسولمانانی جیهانە نەك کورد بە تەنیایی. لە حاڵێکدا بە هاتنی ئیسلام گەورەترین ڕاپەڕینی کۆمەلایەتی لە مێژوویی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەتایبەت گەلی کورد پێکهات. ئەگەر گەلانی ناوچە نەیانتوانی خۆیان لەدەست داگیرکەرانی دەسەلات ڕزگار بکەن، داگیرکەرانی دەسەلات توانیان وەك پێشوو لە ئایینی تازە بۆ حکومەت بەسەر جەماوەردا کەلك وەربگرن. خەلك کە بەهۆی هاتنی ئیسلام ڕزگاری و ڕێزیان (ایاك نعبد: مرۆڤ تەنیا بەندەی خودایە) وەدەست هێنابوو، کاتێك دەیاندی (لە سەردەمی خولەفای راشدین) دەتوانن بە هاسانی میری تەواوی موسولمانان ببینن و قسەی دەگەڵ بکەن سکالاو ڕەخنەی لێ بگرن، هەڵیانکوتا سەر میری بەیعەت پێکراو، یەك بە دوای یەك کوشتیانن و ڕێگایان بۆ دامەزراندنەوەی پادشایەتی ئەوجار لە ژێر دروشمی ئایینی ئیسلام خۆشکرد، موعاویە کە یەکێك لە بلیمەتانی سیاسەت بوو، ڕاست بۆوەو بە دامەزراندنی پۆلیسی نهێنی، دەستی بە ناسینی تەواوی ئەوکەسانە کرد کە وێدەچوو ڕەخنەو کۆسپ بخەنە سەر شێوازی دەولەت و دەسەلاتی وی (هەلبەت بە نێوی ئیسلام)، دەستبەسەرکردنی حەزرەتی عائیشە، (کە لەقەبی دایکی ئیماندارانی پێدرابوو)، یەکێك لەو کارە سیاسیانەی موعاویە بوو.

دیارە کە لە سەرەتاوە ئایینی ئیسلامیش کرا بە ئامرازی داگیرکەرانی دەسەلات و دەولەت، ئەو چەمکەش تەنیا بۆ گەلی کورد دانەمەزرا، گشت گەلانی

ناوچه بەو دەردە گرفتار بوون، بەلام ئەو گەلانەی خاوەن بیری سیاسیی و دیتنی پاشەڕۆژ بوون، توانیان گەلی خۆیان وە سەرووی گەلانی دیكه بخەن و بیانكەنه خاوەن ولاتو دەولەت و دەسەلات، ئەگەر كورد نەیتوانیوه ببێته خاوەن دەولەت، بۆ ئیسلام تاوانباره؟ گەلی كورد خۆی تاوانباره، بەداخەوه كورد چ بۆخۆی چ حاكمەكانی، بیری سیاسییان تەسكبووە، ئاگایان له ئەوزاعی ولاتی خۆیان و دەورووبەر نەبوو، هەر دەسەلاتدارێك هاتباو بیگوتبایه وەرن دەچین بۆ شەڕو تالان، وەدوای دەكەوتن.

كورد دەسەلاتی میرە كوردەكانی بەو جۆرە نەدەپاراست كه دەسەلاتی بێگانەی دەپاراست، كورد هەر له كاتدا دەژیا. ئاگای له عومری ئەم دنیایه نەبوو. ئەگەر بلێین ئیسلام وای له كورد كرد كه له گوێی گادا بنوێ، ئەدی بۆ ئەو ئایینه ئەو نەهامەتیانەی بەسەر گەلانی تر (وەك تورك) نەهێنا ؟

پێویسته ئەوەش بلێین: كوردان له زانستی ئایینی ئیسلامدا زۆر بەرچاو بوون: (جابان)، سەحابه بوو، كوڕەكەی یەكێك له بێژەرانی ئەحادیسه، له ئیمام موحەممەدی غەزالی دەگێڕنەوه، كه گوتوویەتی: فەرهەنگی ئیسلامیی لەسەر موتالای چوار بەره له زانایان راوەستاوه" كه سێ بەره لەوانه كه ناوی بردوون، له هۆزه كوردەكانن، وەك زانایانی دیاربەكرو ئامێدیو شارەزوورو هەلەبجەو دەینەوەرو كرماشان(١٦).

وەرن ئەوڕۆش له كوردەوارییدا تێگەیشتنێك له ئایین وەگەڕ خەین كه له سەر پەروەردەكردنی مرۆڤایەتی و مرۆڤ دۆستی خول بخوا، هەولێ بۆ زانست (له هەموو بوارەكانی) ئامانجی گەلی كورد بێ وەك خودا دەفەرموێ: (هَلْ يَستَوِي الَّذِينَ يَعلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعلَمُونَ)، هەرچی خدەی باشی گەلانی جیهانه ڕەچاوی كەین و هەرچی پیس و نەگبەته له ناو گەلی خۆمانی دوور بخەینەوه. پێشەوای نەمر له نوتقەكانی خۆیدا بۆ خوێندكارەكان دەیگوت: "ئێمه به تفەنگ له بەرامبەر هێزی دەسەلاته زالەكان چمان پێناكرێ، بەلام له ڕێگای هەولدان بۆ خوێندن و زانستەوه دەتوانین خۆمان لەو بێ دەسەلاتییه ڕزگار بكەین".

لە لایەکی دیش لە مێژوودا چ شارستانییەتێك بە بێ ئایین نەدیتراوە، رۆژئاواش کە لەو دوایانەدا بۆتە هەڵگری پێشکەوتوویی و شارستانییەت خۆی بە ئایینی مەسیح هەڵواسیوە، بەڵام هەر گەلێکی مەسیحیش هەڵگری دروشمی پێشکەوتوویی و شارستانییەت نییە. ئەو گەلانەی پێشکەوتوون بەشێك لە هۆکانی چاندو خدەی خۆیانە کە بۆتە هۆی سەرکەوتنیان.

وەك ئاماژەی پێکرا ئاسەوارە بەر لە مێژووییەکان نیشان دەدەن بناغەی شارستانییەت و پێشکەوتن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستی پێکردووە، بەڵام پاش داگیرکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەلایەن پادشاوە، نەهامەتی داوێنی بەسەر هەموو گەلانی ناوچەدا کێشا. پرس ئەوەیە گەلانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نزیك بە گشتیان موسوڵمانن، لەو نێوەدا ئیسلام بۆ تەنیا بۆ کورد بۆتە هۆی نەهامەتی؟! ئەو رێکخراوانەی بۆ رزگاری گەلی کورد خەبات دەکەن، بەشێك لە ئەندامەکانیان پشتیان لە ئایین کردووە، بەڵام زۆر لە رابردوو نارێکترو دابڕاوترن، لەو بەینەدا ئایینی ئیسلام چ نەخشێکی لەم نەهامەتیانەدا هەیە؟ لە نێو کورداندا، نارێکی، ناکۆکی، زۆر بەرچاوە، ستراتیژێکی هاوبەشی نەتەوایەتی لە ئارادا نییە، ئەو رەوتە دژێوانە چ پەیوەندییەکیان بە ئایینی ئیسلامەوە هەیە؟

ئێمەی کورد شانازی بە مێدیا دەکەین، بەڵام با ئەو راستیانە لەبەر چاو بگرین:

١- ئەو دەوڵەتەی مێدیاکان بونیادیاننا، بە نێوی کورد نەبوو.

٢- مێدیاکان بە هۆی تێگەیشتن و یەکگرتوویی توانیان لە ژێر ستەمی ئاشورێکان رزگار بن.

٣- ئەگەر کورد بە مێدیا دەنازێ بۆ لە دوای تێکچوونی میدیاوە تا ئەورۆ نەیتوانیوە یەکگرتوویی نەتەوەیی پێکبێنێتەوە؟

٤- بۆ ئێستاش پلان و ستراتیژێکی یەکگرتوو بۆ گشت گەلی کورد لە ئارادا نییە؟

ئەوەی کە دەڵێن: ئیسلام هۆکارێك بووە بۆ نەهامەتییەکانی گەلی کوردو ئەم ئایینە بووەتە هۆی ئەوەی کە کورد نەبێتە خاوەنی دەوڵەت،" لەسەر کام بنەمای لۆژیکی، ئەو قسانە دەکرێن؟!

ئەوە حاشای لێناكرێ ئیسلام بوو بە هۆی ئەوەی كە توركمانەكان لە غولامی ڕا بە گەورەترین دەسەلأت و دەولەت بگەن، گەلانی موسولمانی تریش هەروا بەدەسەلأت و دەولەت گەیشتوون، لە هیندوستانیش موسولمانان سەدان سالّ حوكمیان كرد و خاوەن دەسەلأت و دەولەت بوون، ئێستاش خاوەن دەولەتن، لە ئاسیای باشووریش (بەنگلادش، مالزیا، ئەندۆنزیا) كە بۆ خۆیان ئایینی ئیسلامیان هەلبژاردووە (بە شەڕ بەسەریان دانەسەپاوە) خاون دەولەتن. ئێمەی كورد جگە لەوەی دەسەلأتە زالە بەرچاوتەنگەكان بە هەموو شێوەیەك سەركوتمان دەكەن بەلأم نابێ تاوانی چەوتكارێكانی خۆمان بەسەر ئایین و دەوروبەردا بێنین.

ئەوەی كە دەلێن ئیسلام "هۆكارێك بووە بۆ نەهامەتییەكانی گەلی كورد،" هەولێكن بۆ داپۆشینی لاوازێكانی بیری سیاسیی، كۆمەلأیەتی و خدەكانمان.

با لە ئەو ئامۆژگارییەی قورئان دەرس وەربگرین: (ان اللة لا یغیر ما بقوم حتي یغیروا ما بانفسهم).

ئەوەش حاشای لێناكرێ: ئایین بەشێكی جیانەكراوە لە چاند(فەرهەنگ)ی بەرەی مرۆڤە. وەك مێژوو نیشانیداوە، جەماوەر ئەگەر پشت لە ئایین-یش بكات، دیسان بە چەشنێكی دی بۆشایی ئایین لە ناو جەماوەردا پڕدەبێتەوە. ڕاستییەكی دیش ئەوەیە: ئیسلام مەگەر لەلایەن تاكە كەسەوە تا ڕادەیەك ڕاگیرابێ، دەنا وەك زۆرتری ئایینەكان هەر بە ڕوالەت ڕاگیراوە، لە بنەوەو لە نهێنی وەلانراوە.

لەحالێكدا ئیسلام بە ڕوونترین شێواز بە خەلكی ناساندووە خودا لە هەموو جێگایەك حازرو نازری كردارو گوتاری ئێمەیە. ناكرێ خۆمان لە خودا بشارینەوە.

بە بڕوای زۆرتری ئایینەكان ئایین (بۆ نموونە ئیسلام) وەك پۆلیسی نهێنی ئاگای لە كردەوەی خەلكە، ئەو بڕوایە لە گشت كاتێكدا باشترین شێوازی پاراستنی مافی تاك و كۆیە. هەر بۆیەش خەلك نایانەوێ كۆمەلگا پشت لە ئایین بكات. ئەو ترسەی ئایین سەبارەت بە لێپرسینەوەی دواڕۆژ لە دلّی جەماوەردا چاندوویەتی، هێمنایەتی و متمانەیەكی زۆری لە نێو خەلك پێكهێناوە، زۆر دیتراوە كەسانێك كە سەردەمی ژیندا خودایان لە بیر نەبووە، لە كاتی مردندا لە كردەوەی

خۆیان سەبارەت بە خەڵك پەشیمانبوونەوەو داوای لێبووردنیان کردووە، زۆرتری ئەو باوەڕە لە بیری ئایینی هەڵدەقوڵێ.

بەکورتی بەشی زۆری تاوانی بێ دەسەڵاتی و بێ دەوڵەتی کورد، لە ئەستۆی خودی کوردە، دەکرێ بڵێێن: ناسیۆنالیستی کوردیش تاوانبارە، بەشێکی بەرچاو لە نەتەوەخوازەکان نە ناسیاوێکی ئەوتۆیان لە ئاستی نەتەوایەتی کورد هەیە، نە پلان و ستراتیژێکی یەکگرتوویان بۆ ڕزگاری لە بەرنامەدایە. هەر تاك و گرووپ و ڕێکخراوەیەك دەهۆڵی خۆی دەکوتێ، بە بێئەوەی هەموو بەیەکەوە هەوڵبدەن ڕێگای چارەسەری بێدەسەڵاتی گەلی کورد بدۆزنەوە.

**+ ئایا ئایین دەتوانێ چارەسەری قەزیەی سیاسیی کورد بکات یان وەکو تۆ دەڵێی: بۆ نەتەوەیەك کە زوڵمی نەتەوەیی لێکراوە خەباتی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەیی شتێکی ڕەوایە؟**

ئەبریشەمی: قەزیەی کورد، لە سەرەتاوە هەرچۆنێك پێکهاتبێ ئەوڕۆ کێشەیەکە لەگەڵ داگیرکەرانی ماف خۆ چارەنووسی گەلی کورد. داگیرکەرانی ئەوڕۆی ماف گەلی کوردیش ئەو دەسەڵاتەیان لە داگیرکەرانی پێشوو پێگەیوە، داگیرکەرانێك کە لە سەرەتاوە هەر خۆیان بە ئایینی و موسوڵمان داناوە. ئەگەر ئەو کێشەیە بە یارمەتی ئایین چارەسەر کرابا، دەبوو کێشەیەکی ئەوتۆ ساز نەبووبا، ئێستاش ئەو کێشەیە لەلایەن داگیرکەرانی ماف خۆچارەنووسی گەلی کورد پێکهاتووە کە لەسەرەتاوە ئایینی و موسوڵمان بوون. ئەگەر ئایین توانیبای چارەسەری قەزیەی سیاسیی کوردی کردبا تا ئێستا دەیکرد، لە لایەکی دیش با کورد تەواو ئایینی بێ، قەزیەی سیاسیی کوردی چۆن پێ چارەسەر دەکرێ؟

قەزیەی سیاسیی کورد، کێشەیەکی هاوچەرخە. ئایین ناتوانێ چارەسەری ئەو قەزیە بکات. لەلایەکی دی بەشێك لە جەمسەرەکانی "قەزیەی سیاسیی کورد" بە دەست ئەو هێزانەوەیە کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئایینن، بە (تایبەت ئایینی ئیسلام).

دیارە ئەو کێشەیە لەسەرەتاوە بەو چەشنە نەبووە، ئەوڕۆ کێشەی کورد ئەوەندەی کە بە دەسەڵاتدارانی ناوچەوە پەیوەندی هەیە، بە ڕوانگەی زلهیزەکان

و هەڵسوکەوتی جیهانیشەوە گرێدراوە. بەڵام بڕوای ئایینی دەتوانێ یاریدەدەری گەلی کورد بێ، ئیسلام نەیگوتووە گەلی کورد دەبێ بندەست و دیلی دەسەڵاتی غەیری خۆی بێت. لە ئیسلامدا ئیتاعەی لە خاوەن دەسەڵاتی ناوخۆ (اولی الامری منکم) جایزە، نەك خاوەن دەسەڵاتی دەرەکی، ئەوانەی دەسەڵاتی خۆچارەنووسیان لە کورد زەوتکردووە گەلی کوردیان لە خۆیان جیا کردۆتەوە، بروانە دەوڵەتی تورك ئەگەر کورد خۆی بە تورك دانەنێ، وەك دوژمن یان بێگانە چاوی لێ دەکرێ. لێرەدا ناتوانین بڵێین هەموومان موسوڵمانین و یەك ئۆممەتین، تاوانی ئەو جیاکردنەوەیە وەباڵی ملی داگیرکەرانە نەك گەلی کورد. لەو ڕوانگەوە بروا ناکەم ئایین بە تەنیایی کارێکی لە دەست بێ. بەڵام ئایین دەتوانێ لە چاکسازی نەفسانیەت و بڕوا بەخۆبوونی گەلی کورددا کاریگەر بێ.

ئەوەش حاشای لێناکرێ کە گەلی کورد وێڕای هاوسێکانی موسوڵمانە، بەڵام کام یەك لە داگیرکەرانی مافی نیشتمانی و خۆچارەنووسی گەلی کورد– چ ئەوڕۆ چ لەسەدەکانی ڕابردوو– بە پێی ئوسوڵی ئایین و ئیسلام لەگەڵ کورد هەڵسووڕاون؟ ئەگەر ئەتاتورك نکوولی ئایینی دەکرد، لایەنگرانی ئێستاش نکولی ئایین دەکەن، سەددام نکولی ئیسلامیی نەدەکرد بە خەتی خۆی دروشمی ئیسلامیی لەسەر ئاڵای عێڕاق دانا، بەڵام دیتمان ئەویش وەك دەوڵەتی لائیکی تورکیا، چی دەرهەق بە گەلی کوردو نیشتمانەکەی کرد، ڕۆژێ دوای شیمیابارانی حەڵەبجە لە کۆبوونەوەی وڵاتە ئیسلامێکان لە کوێ هیچ کام لەو دەوڵەتە موسوڵمانانە ئاماژەیان بە ئەو کارە دژ بە ئایینەی سەددام نەکرد، مەگەر لەم جیهانەدا چ کەسی موسوڵمان نەبوو کە دژ بەو جینایەتە دەنگ هەڵبڕێ؟ مەگەر دەنگ هەڵبڕین سەبارەت بە جینایەت دژی بەشەرییەت تەنیا ئەرکی بڕیارەکانی ناو نەتەوەییە؟ مەگەر ئەو بێدەنگییە پشتکردن لە ئایینی خودا نییە؟ هەر ئەو بێدەنگیە مەودای بە دەزگای حکومەتی سەددام دا کە ئەوجار جینایەتەکانی خۆیان دژ بە گەلی کورد بە نێوی ئەنفال بە ئایینی ئیسلامەوە گرێبدەن. ئەو بنکە ئایینیانەی جیهانی ئیسلام سەبارەت بەو جینایەتانەو نێوەکەی چ دەنگێکیان هەڵبڕی؟ لەو نێوەدا ئایین و ئاییندار لە کوێبوون؟

وادیارە بۆ ڕزگاری گەلی کورد پێویستبێ ئاین و نەتەوەگەری هاودەنگ بن. گەلی کورد ئەوەندەی نەتەوەخوازە ئەوەندەش ئاینییە. ئەوەش دەتوانێ ببێتە هۆی یەکگرتوویەکی بەرینترو بەهێزتر.

ئەوانەی مافی نیشتمانی و پێناسەی خودادادی گەلی کورد پێشێل دەکەن، فریان بە ئاینەوە نییە، ئەوان لەسەر بنەمای فرەخوازی و باڵادەستی نەتەوەی تایبەت بە خۆیان، مافی گەلی کورد پێشێل دەکەن، بۆیەش کورد پێویستە ماف و پێناسەی خوداپێداوی خۆی بپارێزێ، پێویستە لە ئایین-یش کەلك وەربگرێ. پتری گەلی کورد پابەندی ئایینن بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئایین خەباتی گەلی کورد سەرکەوتوو نابێ لە جووڵانەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورددا ئایین دەتوانێ زۆر کارساز بێ، ئەگەر خەڵك و سەرکردەکان خاوەن بیروبڕوای ئایینی و پاك وخاوێن بن، باوەڕ بە خۆبوون پتر دەبێ، گرفتی کارەکان کەمتر دەبێتەوە.

وەك دەزانین یەکێك لە خاڵەکانی سەرکەوتنی هەر دەوڵەت و دەسەڵات و ڕێکخراوەیەك ئەسپاردنی کاروبار بە کەسایەتی پاك، لێزان و لێهاتووی باوەڕ پیکراوە، خاڵی هەرە گرنگی ئایین، پەروەردەکردنی کەسایەتی پاك، لێزان و لێهاتووی باوەڕپێکراوە.

کاتێك دەگوترێ بۆ نەتەوەیەك کە زوڵمی نەتەوەیی لێکراوە خەباتی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەیی شتێکی ڕەوایە، مەبەست لە ئەوە نییە کە نەتەوەخوازی بە تەنیایی کارەکان دەباتە پێش، بەڵکو پێشێل کەرانی ئەو مافەی گەلی کورد، بە سەروەر دانانی گەلی خۆیان و بندەست دانانی گەلی کورد ئێمە وادار دەکەن ڕێبازی نەتەوەخوازی پتر لە بەر چاو بگرین.

ئەوەش حاشای لێناکرێ کە ئایین بەشێکی هەرە گرنگی پێناسەی نەتەوەگەرییە، دیارە زۆرتری ئایینەکان (وەك مەسیحیەت و ئیسلام) تایبەت بە گەلێك نین، بەڵکو جیهانین، بەڵام نەتەوەگەری تایبەت بە گەلێکی دیاریکراوە. کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد تایبەت بە گەلی کوردە نە هەموو موسوڵمانان. بەداخەوە، زۆرتری وڵاتە ئیسلامێکان لەڕەگەزکوژی کوردەکاندا خۆیان مەلۆسکردووە، تەنانەت لە جینۆساید وشیمیاییکردن، لەسەر کورد وەجواب

نەهاتن. کورد وەك گەلێکی هاوچەرخی بێ دەوڵەت ناتوانێ تەنیا پشت بە ئایین ببەستێ. پێویستە هەم لە مەودای ئایین، هەم لە ڕێبازی نەتەوەگەری و سیاسیی و جیهانی بۆ ڕزگاربوون تێ بکۆشێ.

بۆ ڕزگاری ئەو گەلە، ئایین و نەتەوەگەری (تەنانەت کۆمۆنیستەکان-یش) بەیەکەوە باشتر دەتوانن کاربکەن دژایەتی نێوان لایەنگرانی ئەو چەمکانە لە بەرژەوەندی داگیرکەرانی مافی گەلی کورددایە. ئایین بەتایبەت ئیسلام بۆ ڕزگاری گەلێکی داماو هۆکارێکی زۆر بەنرخە، ئایین دەتوانێ بەشێکی زۆری خەڵکی ئایینداری لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، باوەڕ بە خۆبوون بە هێز بکات، لە ئیسلامدا ڕەگەزو ڕەچەڵەك مایەی فەخرنین، بەرەی مرۆڤ نابێ بەندەی یەکتر بن، بەندەگی بەرەی مرۆڤ تەنیا بۆ خودا هاتووە، ئەو بابەتانە ڕەوتی ڕزگاری گەلی بندەست نیشان دەدەن...

کاتێك ئایین، بە تایبەت ئیسلام ئەو توانایانەی هەیە، هەڵەیە ئایین لە چەمکی خەبات دوور بخرێتەوە. نەتەوەخوازیش بندەستی نەتەوایەتی هەڵناگرێ. ئایین و نەتەوەخوازی بۆ گەلی کورد دوو ئامرازی بەهێزی ڕزگارین. بەڵام کورد لە بنەماکانی ڕەوتی یەکگرتوویی دوور کەوتۆتەوە. ئەم باسانەش ئەو ڕاستییە تاڵە دەردەخەن، ئەگەر نەتەوەخواز لەسەر ڕوەلانانی ئایین (ئیسلام) پێ دابگرێ، دیارە ڕزگاری گەلەکەی ناوێ. بەڵکو دەیەوێ بە چەشنێکی دی مافی گەلەکەی پێشێل بکات. لەو نێوەدا کۆمۆنیستەکان ئەو ڕاستیەیان بزر کردووە کە بۆ بەجێهێنانی بیری کۆمۆنیستی لە ناو هەر گەلێکدا پێویستە ئەو گەلە خاوەن دەسەڵات بێ، گەلی کوردیش تا نەبێتە خاوەن دەسەڵات، ناتوانێ ڕێبازی کۆمۆنیستی ڕەچاو بکات. ئەوانەی خۆ بە کۆمۆنیست دادەنێن، باشترە بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات بۆ گەلی کورد هاوکاری نەتەوەخواز و ئاییندارەکان بن.

ئەمن بۆ ڕزگاری گەلێکی بندەست وەك کورد، دژایەتێك لە نێوان ئایین و نەتەوەگەری (تەنانەت کۆمۆنیسم-یش) نابینم. بەتایبەت ئایینی ئیسلام کە دژ بە عەبدایەتی بەرەی مرۆڤ لە یەکترە.

ئیسلام نەی گوتووە کورد دەبێ بندەستی تورك عەرەب و فارس بێ. نەشی گوتووە کورد دەبێ دەسەڵاتی خۆچارەنووسی نەبێ، یان کەمتر لە گەلانی دیکە بێ. بەڵام ئەگەر گەلی کورد بۆ خۆی ئیرادە نەکات و بە شێوازی هەڵسەنگێندراو تێنەکۆشێ، ئایین ناتوانێ لە بندەستی فرەخوازانی بەرچاو تەنگ و پاوانخوازانی دەسەڵات ڕزگاری بکات.

**+ لە پاش دەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە کوردستان، کورد توانی چەندین ئەمارەتی سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆ پێك بهێنێ و هەوڵی زۆریدا لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامدا دەوڵەتی میدیا بە شێوازێکی دی زیندوو بکاتەوە، بەڵام پیلانی دوژمنان و دووبەرەکی و شەڕە ئیمارات وایانکرد یەك لە دوای یەك ئەو ئیمارەتانە لە ناو بچن، دەتوانیت چۆن بە شێوازێکی زانستییانە ئەمەمان بۆ باس بکەیت؟**

ئەبریشەمی: ئەمن لە چەمکێکی ئەوتۆ کە کورد لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامدا هەوڵی زۆری دابێ دەوڵەتی مێدیا بە شێوازیکی دی زیندوو بکاتەوە، ئاگادار نیم.

بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی پرسیارەکە پێویستە ئاماژەیەك بە شێوازی پێکهاتنی ئیمارەتە کوردییەکان بکرێ. ئیمارەتە کوردییەکان پێکهاتەیەکی ناوچەیی سیاسیی– ئابووری بوون. بەرلەوەی وەك دەسەڵاتێکی قەبیلەیی Tribal State بناسرێن، زۆرتریان لە دەورانی خۆیاندا دەوڵەتیکی ناوچەیی سەربەخۆ بوون، وێنەیەکی بچووك لە دەوڵەتە زلەکانی دەوروبەر، مێژوو نیشان دەدا زۆرتری دامەزرێنەرانی دەوڵەتە زلەکانی سەردەمی "ئیسلامیی" تا سەرەتای سەدەی بیستەم بەرەچەڵەك قەبیلەیی بوون (وەك سەلجووقی، عوسمانی، قاجار و...تاد). بەڵام ئەو دەوڵەتانەی بنەماڵە قەبیلەییەکان بونیادیان نا، دەوڵەتی قەبیلەیی نەبوون، ئەماراتی کوردیش دەوڵەتی قەبیلەیی نەبوون.

بەڵام سایکۆلۆژی سیاسیی کوردو هاوسێکانی– بە تایبەت تورکەکان– زۆر لێك جیایە. دەسەڵاتداری تورك فرەخوازو داگیرکەرە لەحاڵێکدا دەسەڵاتداری کورد لە جوغزی ناوچەیی ناچێتە دەر.

لە کوردستاندا دەسەڵات و دەوڵەت بۆ پاراستنی ئاسایشی وڵات و خەڵك بووە، بەڵام دەسەڵات لە لای تورکان ئامرازێك بووە بۆ بەرینکردنەوەی سنوورو داگیرکردنی وڵاتانی دەوروبەر. (ڕەنگە بڵێن کورد هەر کۆچەر بوون، بەڵام ئەو ڕەوتە لە نێو تورکاندا بەهێزتر بوو.)

بنەمای ئابووری ئیماراتی کورد لەسەر داهاتی ناوچەکانی بندەستیان بوو، هەموو لایەك (ئاژەڵدارو کۆچەر، خاوەن کشتوکاڵ، پێشەساز، بازرگانی و کڕین و فرۆش)، داهاتی ئیمارەتیان دابین دەکرد، خەڵکی ئیمارەتیش لە عەشیرەت و غەیرە عەشیرەت پێکدەهات. ئەو ئیمارەتانە لە سەرەتادا تایبەت بە وڵاتێکی دیاریکراو نەبوون، بەڵام کاتێك ئەو ڕەوتە جێکەوت، سنووری ئەمارەت تاڕادەیەك دیاریکرا، میری ئەماڕەت (بە یارمەتی دانیشتوان) ئەو سنوورانەی دەپاراست. دانیشتوانی ئیمارەت پەیوەندی کۆمەڵایەتی– ئابووری و تێکەڵاوی بنەماڵەییان زۆر بەرچاو بوو، لەبەر ئەوەی لێك نزیك بوون، بەڵام لە دەوڵەتە زلەکاندا (دەوڵەت سەرزەمینی ـ Territorial State) تێکەڵاوێکی ئەوتۆ ئێستاش نابیندرێ (دەوڵەت سەرزەمینی وەك عوسمانی و ئێران). دەوڵەتە زلەکان، خاوەنی وڵاتێك بوون یەکجار بەرین، کە دانیشتوانی ناوچەکان پەیوەندێکیان بە یەکەوە نەبوو، چ لە باری ئابووری، چ لە مەودای کۆمەڵایەتی، تەنیا هاوبەشی ئەوان لە پێکهێنانی لەشکرو دانی باج بە دەوڵەت بوو!

## ئینجا با بێینه سەر ئێل و ئاشیرەتی كورد:

زاراوەی (ئێل، ایل و عەشیرەت)، له زمانی توركی و عەرەبی وەرگیراون، بەڵام ئەو ساختارەی "ئێل" و "ئاشیرەت"ی كورد هەیانبووە له نێو عەرەب و تورك نەبووە. بەشێك له عەشیرەتی كورد ساختاری قەبیلەییان هەبوو، بەڵام زۆرتریان وەك چینێكی "خاوەن زەوی" دیاری دەكران له هەردوو حاڵدا قەبیلەو عەشیرەت وەك "نهاد"ێكی كۆمەڵایەتی– سیاسی خۆدەنوێنن، ئاغا كه خاوەن گوندو زەوی و زار بوو له كوردستانی بێ دەوڵەت له بازنەی ئاشیرەتدا دەیتوانی موڵكی خۆی ڕابگرێ، كەسێك كه پەیوەندی ئاشیرەتی نەبووبا، نەیدەتوانی له دەرەوەی شار خاوەنی دێ و زەوی بێ، بەڵام ئاغایەك كه سەروە ئاشیرەت با دەیتوانی موڵكەكەی ڕابگرێ. (ئەو ڕەوتە بەرگری له پەرەگرتنی زەمیندار بوونی خەڵكی شار و نائاشیرەت و پشكووتنی سەرمایەداری دەكرد.

ئەگەرچی زۆرینەی گەلی كورد له بنەماڵەی ئاشیرەت نەبوون، بەڵام له ڕابردوودا گەلی كورد به ئێل و عەشیرە ـ ئاشیرەت، دیاری دەكرا، ئاشیرەت پێكهاتەیەكی كۆمەڵایەتی زۆرتر هاو ڕەچەڵەك لەسەر بنەمای سیاسیی– ئابووری و خاوەن ناوچەیەكی تایبەت بوون، بەڵام گشت دانیشتوانی ناوچە له بنەماڵەو ڕەچەڵەكی ئاشیرەت نەبوون. ئاشیرەتەكان وەك ئاغاوەت، چینی خاوەن زەمین بوون، دانیشتوانی ناوچە بندەستی ئاشیرەتیش وەك هێزی ئاشیرەت له ئەژمار دەهاتن. بۆیەش دەرەكێكان گەلی كوردیان به ئێل و ئاشیرەت دادەنا. هێزی ئیمارەتەكانیش پتر له عەشیرەتەكانی سەروە ئیمارەت پێكدەهات، لەبەر ئەو هۆیە ناوی عەشیرەتەكان بەرز دەبۆوەو بەسەر ناوچەی بندەستی عەشیرەتدا دەبرا. ئەو چەمكە ئاڵۆزیكی زۆری له ناسیاوی گەلی كوردو دانیشتوانی ناوچەكان پێكهێناوە، له لایەك ئاژەڵداری و ئاژەڵگێڕی (ڕەمەگردانی) وەك كۆچەر چاوی لێدەكرا. هەر بۆیەش زۆرتری نووسەرانی نەكورد نەیان توانیوە جیاوازی كۆچەرو عەشیرەت و گشت دانیشتوانی ناوچەكان لێك جیا بكەنەوە، لەلایەك هەموو دانیشتوانی ناوچەیان به بنەچەكەی عەشیرەت داناوە، لەلایەكیش هەموو

عەشیرەتێکیان بەکۆچەر ناسیوە. ئەوەش هەڵەیەکی کۆمەڵناسی و پێکهاتەی کۆمەڵگەی لێکەوتۆتەوە.

ئەو ئاڵۆزییەش بە پێچەوانەی بەرژەوەندی گەلی کورد بەکاربردراوە، بە تایبەت لەلایەن نووسەرانی سەر وە ئەو دەوڵەتانە کە بەسەر کوردستاندا زاڵن، ئەوان ئێستاش کەلکی سیاسیی لەو مەبەستە وەردەگرن.

بەشێکیان بۆ ئەوەی بنەمای پێکهاتەی ئەمارەتە کوردییەکان ئاڵۆز بکەن، بۆ نموونە پاراگرافێك لە نووسراوی مامۆستایەکی توێژەری زانکۆ لە ئێران دەخەمە بەرچاو، کە چۆن بنەمای سیاسی– کۆمەلایەتی و شارستانیەتی کوردیان بە ئێل و ئاشیرەتەوە گرێداوە، لە حالێکدا تاریفێکی دروستیان لە ئاشیرەتی کورد نەکردووە: "شکست صفویان در جنگ چالدران،نقگە عگفی در تاریخ کردها بود، زیرا ۲۳ امیر نشین کرد، یك پیمان دولتی با عیمانی ها امچا کردند کە بە موجب ێن حکومت محلی رۆسای ایلات کرد در مناگق ایلی خود بە رسمیت شناختە شد و ێنان در مقابل تعهد کردند کە نسبت بە سلگان عیمانی وفادار باشند"(١٥). بە بڕوای ئەو نووسەرە ئەمارەتی وەك دیاربەکرو بەتلیس–یش بە "مناگق ایلی" داندراوە، تاریفێکیش لە "ایل" نەکراوە! ئەگەر میرە کوردەکان لە بنەماڵەی ئێل و ئاشرەت–یش بووبن، دەکرێ وەك بنەماڵەکانی تورك (سەلجووقی، عوسمانی، قاجار و...تاد) لە ئەژمار بێن، بەلام ئەو جیاوازیانە لە ئارادا بوون: دەسەلاتدارانی کورد ڕەوتی داگیرکەری و فرەخوازیان وەك دەسەلاتدارانی تورك نەبووە. ئەو نووسەرە ناوی ناوچە کوردییەکان بە ناوی ئێل و ئاشیرەت دادەنێ، بەلام ئەگەر ناوی قەبیلەیەك لەسەر ولاتێکیش دابندرێ، دیسان ئەو ڕەوتە لە دەرەوەی کوردستان باوتر بووە، عوسمانی، سعودی و...تاد.

بنەمای سیاسی– ئابووری عەشیرەتی کورد، لە کوردەواریدا بە پێچەوانەی ڕەوتی سیاسی– ئابووری باو لە دەوڵەتە زلەکاندا، کە پادشا زەوی و ناوچەی بە ئەوکەسانە دەئەسپارد(اقگاع) کە بەشێك لە ئەرکی ڕاگرتن و تەیارکردنی سوپایان وەخۆ دەگرت، عەشیرەتی کورد بۆ خۆیان خاوەن زەوی و لەوەڕگای ناوچەیەك بوون، ئەوان موڵکی خۆیان لە دەستدرێژی دەپاراست، ئەو چەمکە پێشی ڕەوتی

ئیقتاعی دهگرت که له وڵاته زلهکاندا (وهك عوسمانی و ئێران) باو بوو. ئهو ڕهوته چهشنێکی دهسهڵاتی سیاسیی و ئابووری بۆ ئاشیرهتی کورد پێکهێنابوو.

ئهگهر ناوچهی عهشیرهتێك به نێوی عهشیرهتهکه دهناسرا، ئهو ناوه بهو مانایه نهبوو که گشت دانیشتوانی ناوچهکه له ڕهچهڵهکی چینی ئاغاو عهشیرهتن (عهشیرهت چینی بنهماڵهکانی زهمیندار بوون). ئاغا، به خاوهن دێ دهگوترا، خهڵکی دێ بههه ر شێوهیهك لهسه ر زهوی بان به دهگمهن له ڕهچهڵهکی بنهماڵهی ئاغا بوون، هه ر بۆیهش زۆرینهی خهڵکی دێ جیا له بنهماڵهو چینی ئاغا بوون. ئاغاو عهشیرهت له ناوچهی تایبهت به خۆیان تهواو خاوهن دهسهڵات بوون. بهڵام نهیاندهتوانی له بهرامبهر دهستدرێژی عهشیرهتی بههێزتر یان دهسهڵاتی پادشایهتی خۆڕاگرن.

ئهو بازنه تهنگهی دهسهڵاتی عهشیرهتی، ههلی سیاسیی– ئابووری بۆ پێکهاتنی میرنشینهکوردییهکان پێکهوهنا که به ئیمارهت ناو بردراون(١٦). میرنشینهکان دهسهڵاتێکی زۆر پتریان له دهسهڵاتی عهشیرهتی ههبوو، وهك باسکرا دهسهڵاتی میرنشینه کوردییهکان وێنهیهکی بچووکی دهوڵهته زلهکان بوون.

عهشیرهت هەموو کۆچهر نهبوون، کۆچهری چهشنێك له شێوازی ژینهو لهسه ر بهرههمی ئاژهڵگێڕی و ئاژهڵداری داندراوه، بهڵام ئاژهڵداری له لهوهرگاکانی کوردستان کارێکی بهرههمهێنه ر بوو، ئهو کارهش تایبه ت به ئهو کۆمهڵگهیه نهبوو که کۆچهرییان وهك چهشنێك له ژین ڕهچاو کردبوو، بهڵکو ئاژهڵداری و ئاژهڵگێڕی (له لهوهڕگاکان) وهك ڕهوتێکی بهرههم هێنهر(تولید)، بهشێك له پێکهاتهی ئابووری به شێوازی بهر له سهرمایهداری بوو.

خهڵکی کوردستان به تایبهت دانیشتوانی گوندهکان و ئاشیرهتهکان وێڕای کاری کشتوکاڵ، ئاژهڵداریشیان ههبووه ئهوان کۆچهر نهبوون، بهڵام بهشێك له بنهماڵه (یان کرێکار، نیوهکار و...)، ڕهوتی ههوارچوونیان بهڕێوه دهبرد، ئهو چهمکه له پرۆسهی بهرههمهێنان له کوردستان، لهلایهن دهرهکێکانهوه وا لهنهزهر گیراوه که کورد هەمووی کۆچهر بوون. له زمانی فارسیدا کاتێك دهڵێن "عشایر"

مەبەستیان لە ڕەوتی ژینی کۆچەرییە، خەڵکی ئاسایی–ش کاتێك دەبیسن گەلی کورد لە عەشایر پێکهاتووە، لایانوایە کورد هەموو کۆچەر بوون (دیارە کۆچەریش ناتوانێ خاوەن وڵات و دەوڵەت بێ!).

بەڵام ڕەوتی بەرهەمهێنانی ئاژەڵداری لە پەنا کشتوکاڵ و کاری دەستکرددا، لە زۆرتری ناوچەکانی کوردستان باوبووە. دیارە لە کوردستان کۆمەڵگەی واش هەبوون کە کۆچەریان وەك چەشنێك لە ژین ڕەچاو دەکرد، بەڵام چەمکی ژینی کۆچەری لە کوردستان ناتوانێ ڕەوتێکی گشتی یان زۆرینەی خەڵك بووبێ.

ڕەوتی پێکهاتنی ئیمارەت وەك باسکرا عەشیرەتەکان خاوەن زەوی و ناوچەی تایبەت بە خۆیان بوون، ئەوان بۆ ڕاگرتنی دەسەڵات بەسەر ناوچەی خۆیان دا پێویستیان بە دەسەڵاتێکی بەرزتر لە دەسەڵاتی ئاشیرەتی بووە تا بەرژەوەندی ئاشیرەتەکان لە بەرچاو بگرێ و پیوەندێکان و پێویستێکانی ئابوری– سیاسیی و کۆمەڵایەتی ئەو ناوچانەی پێوەندێکی خۆڕستیان بەیەکەوە هەبوو دابین بکات.

ئەو پێویستیانە بنەمای پێکهاتە و پێوەندی شارەکانی ناوچە و گوندنشینەکان و ئاشیرەتەکانیان پتر قایم کردووە. ڕاگرتنی دەسەڵاتی سیاسیی، بەرژەوەندی و ئاسایشی ناوچەیەك (کە بریتی بووە لە چەند شارو شارۆچکەو کۆمەڵێك عەشیرەت و سەدان گوندو لەوەرگە، ڕێگایان بۆ دامەزراندن و ڕاگرتنی ئیمارەتەکان خۆشکردووە. هەر بۆیەش میرنشینەکانی کورد سەدان ساڵ بەردەوام بوون. دیارە لەو ماوە درێژەدا شێوازی ئابووری کۆمەڵگەو پێکهێنانی بژیوی ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی بەسەردا نەهاتبوو. ئەو چەمکە بەدوای دامەزرانی ئایینی ئیسلام لە کوردستان پێکهات تا ئەو دواییانە هەر وەك خۆی مابۆوە. بەڵام لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا کە سیستمی سیاسیی– ئابووری پێشوو لە ئارادا نەمابوو، ئەو کەسایەتیانەی بۆیان دەلوا دەستیان بە داگیرکردنی ناوچەیەك دەکرد، بۆ وێنە لەسەرەتای سەدەی (۳م.ك.) سەدەقە ناوێك لە کوردەکانی مووسل، کە بە "زریق" ناوی دەرکردبوو، هێرشی بردە ڕۆژئاوای گۆلی ورمێ و شاری ورمێی گرت و کردی بە پێتەختی دەسەڵات و دەوڵەتی خۆی. خەڵیفەی عەباسی کە دەسەڵاتێکی نمادینی هەبوو، لەساڵی (۲۰۹) زریقی کردی بە والی ئازربایجان(۱٦).

بەڵام کاتێك سیستمی نوێی ئابووری– سیاسی دوای زاڵبوونی ئیسلام جێکەوت، ڕێگا بۆ دامەزراندنی ئەمارەتە (میرنشینەکان)ی کورد خۆشکرا. میرنشینە کوردییەکان لەسەر پێویستی سیاسی و ئابووری کوردستان دامەزران. لەهەر ئەمیرنشینەیدا نیشتەجێکان (خەڵکی گوندو شارەکان ـ ناکۆچەرەکان) زۆر پتر لە کۆچەران بوون. بەڵام کاتێك کشتوکاڵ لەناو دەچوو، گوندو شارەکان خاپوور دەکران (وەك هێرشی مەغۆل و شەڕەکانی سەفەوی و عوسمانی)، خەڵك پتر ڕوویان لە ئاژەڵداری وکۆچەری دەکردەوە. بەواتایەکی دی چەشنی ژین لە کوردستان لە هەر هێرشێکی داگیرکەرانەدا دەگەڕاوە بۆ دواوە، بەڵام وەك پێشەوای نەمر دەیگوت: کورد وەك فریزوی وایە، سەدان ساڵە داگیرکەران خەریکن کورد لە ڕەگو ڕیشە دەردێنن، تۆڕی هەڵدەدن (دەڵێن ئۆخەی کوردمان لەناوبرد)، بەڵام دوای ماوەیەك پنچکە فریزوی فڕێدراو سەر لە نوێ شین دەبێتەوە!

کاتێك دەسەڵاتی ئیمارەت لە کزیی دەدا، دەسەڵاتی ئاشیرەت بەرز دەبۆوە. بەڵام دوای ماوەیەك ئاشیرەتەکان بۆ بەرگری لە پێکهەڵپرژان و دەستدرێژی بۆ سەر ناوچەکانیان وەخۆ دەکەوتن تا دەسەڵاتی میر (وەك چاوەدێری ئاشتی و ئاسایشی گشتی لە ناوچە) دابمەزرێننەوە، ئەو ڕەوتە تا سەردەمی بڵاوبوونەوەی تفەنگ لە نێو عەشیرەتەکان باو بوو. بەڵام دواتر هێزی ئاشیرەت وەك هێزی دەرەبەگ وەگەڕ کەوت، ئەو ڕەوتەش تا دوای دامەزرانی دەوڵەتی نوێی ناوەندی لە ئێران و عوسمانی بەردەوام بوو.

لە کوردەواریدا هەڵبژاردنی میرو کردەوەی میر ئاسۆیەکی میتۆلۆژیکی هەیە. میر میرێن، وێنەیەك لەو چەمکەیە. لە کوردەواریدا میرایەتی وەك میرات بە کوڕی گەورەی میر یان بنەماڵەی وی دەبڕا یان هەڵدەبژێردرا. لە میر میرێنیشدا میر هەڵدەبژێردرێ میردەستی دەڕوا، لە کاتی دانیشتن لە قۆناغی دیاریکراو، نابێ پێبکەنێ و گاڵتە بکات. (ئەو ڕەوتە نیشان دەدات کە میرایەتی کارێکی سیاسی و جیدی یە، نابێ وەك گاڵتە چاوی لێ بکرێ). دەڵێن دیاکۆی پادشای مێدیا لە کاتی کۆبوونەوی ڕەسمیدا ڕوخسەتی بە کەس نەدەدا پێبکەنی و گاڵتە بکات.

تێکچوونی میرنشینەکان، دەسەڵاتە زلەکانی ئێران و عوسمانی، بە ڕادەیەك بەرچاو تەنگ و پاوانخواز بوون، کە چاویان بڕوای دیتنی میرنشینە کوردییەکانیان نەبوو بەرەبەرە و دوای پێکهێنانی سیستەمی دەسەڵاتی بەهێزی ناوەندی کەوتن. بەرلەویش سیستمێکی ڕێك و دیاریکراو (مدون) لە نێوان میرنشینەکان و دەسەڵاتی ناوەندی لە ئارادا نەبوو، پێوەندێکان بە پێی دەسەڵاتی پادشاو میر چاوی لێدەکرا. میرە کوردەکان وەك میری وڵاتانی دی لەلایەن پادشا (دەوڵەتی ناوەندی) دیارینەدەکران، بۆیە پادشا زۆر بە ئاسانی دەیتوانی دەسەڵاتە ناوچەییەکان لابەرێ، بەڵام لە مەڕ دەسەڵاتی ناوچەیی کوردان ئەو تواناییەیان نەبوو، هەر بۆیەش لە دەرفەت دەگەڕان تا ئەو ڕەوتە تێکبدەن و کورد لە دەسەڵات بخەن، بەداخەوە ئاشیرەتەکان– کە وەك هێزێکی بەرچاوی ئەماڕەت بوون– لەسەردەمێك کە هەڵگری گۆڕانکاری چەمکی دەسەڵاتی سیاسی بوو، پشتی میرنشینە کوردییەکانیان بەردا. ئەوان بیری سیاسیی نەتەوەگەریان نەبوو، تەنیا لە فیکری ڕاگرتنی دەسەڵاتی ناوچەی بندەستی خۆیاندابوون، لە دوای ئەوەی دەستیان بە تفەنگ ڕاگەیشت، هەستی دەرەبەگایەتی لە ویستی ڕاگرتنی دەسەڵاتی میرایەتی زۆر بە هێزتر بوو. ئەوجار بۆ لە ناوبردنی دەسەڵاتی میرایەتی پاڵیان وە دەسەڵاتی ناوەندی ئێران و عوسمانیدا.

بەڵام دوای ڕمانی میرنشینەکانی کورد دیسان دەوڵەتانی ئێران و عوسمانی نەیاندەتوانی بە بێ هاوکاری و یارمەتی عەشیرەت و ئاغاکان بەسەر کوردستاندا زاڵبن. هەر بۆیەش سەرۆك ئێلەکان و ئاغاکان حاکمی تۆکمەی ناوچەی بندەستی خۆیان بوون، ئەو ماوەیە دەورانی پشکووتنی دەرەبەگی لە کوردستانە.

دوای لە ناوچوونی ئیمارەتە کوردییەکان دوو دەوڵەتی زاڵ (بەسەر کوردستان) دەسەڵاتیان لە کوردستان بە یارمەتی ئاغاو ئاشیرەت پێکدەهات، دەسەڵاتە زلەکان ئەوجار دیتیان لە جێگای هەر ئیمارەتێك دەیان دەرەبەگ قوت بۆتەوە، بەڵام دەسەڵاتە زلەکان لە سیاسەتدا زۆر بە توانا بوون، ئەوان بۆ ناسینی سایکۆلۆژی ئاشیرەت و ئاغاکانی کورد دەست بەکار بوون، (١٨).

دەوڵەتە زاڵەکان لە ڕقە بەری و ناکۆکی نێوان دەرەبەگەکان کەڵکیان وەردەگرت، کاتێك لە جێگای هەر میرێك، دەیان دەرەبەگ قوت ببۆوە، سیاسەتی ئیستیعماری (تفرقە بیندازو حکومت کن: پەرتکە زاڵ دەبی) پتر لە جاران وەگەڕ کەوت. ئەو ڕەوتە تا دامەزران و بەهێز بوونی دەوڵەتی نوێ لە جێگای دەسەڵاتی سوننەتی دوو زلهێزی پیرو بێهێزی ئێران و عوسمانی بەردەوام بوو، هەڵبەت وردە وردە، دەوڵەتی ناوەندی بەهێز دەبوو ئاغاو ئاشیرەت بێ هێز دەبوون لەو ماوەیەشدا کاربەدەستانی دەوڵەت بە تێکبەردانی سەرۆك ئێلەکان، ئێلی سەر بزێویان ڕام دەکرد، ئەو سەرۆك ئێلانەی گوێ لەمستی دەوڵەت بان خەڵات و میداڵ و ئافەرینیان وەردەگرت، ئەوانەی دەمڕاستیان کردبا بە دەستی ئێلە گوێ لەمستەکان تەمبێ دەکران، هەڵبەت لە سەردەمی میرنشینەکانیشدا کاتێك دەسەڵاتی میرەکان لە کزی دەدا دەسەڵاتی سەرۆك ئێلەکان بە هێز دەبوو. ئەوەش حاشای لێناکرێ عەشیرەتی کورد وەك چینی زەمیندار، بە بێ دەسەڵاتی سیاسیی (دەوڵەت) خۆڕاناگرێ، وادیارە بە هاتنی ئیسلام و لاچوونی دەسەڵاتی ساسانی، دەوڵەتێك کە بتوانێ موناسەباتی چینایەتی و کۆمەڵایەتی لە هەر کەلێن و قوژبنێکی کوردستان ڕابگرێ لە ئارادا نەبووە. ئەو چەمکە هەلێکی کۆمەڵایەتی– سیاسیی بۆ دروستبوونی دەسەڵاتی ناوچەیی لە نێو کوردان پێکهینا، دیارە تەواوی خەڵکی ناوچەکانی کوردستان "ئاشیرەت" نەبوون، یانی هەموویان چینی زەمیندار نەبوون، جەماوەری یەك قەبیلەش نەبوون. خەڵکی گوندەکانیش بەڕەچەڵەك زۆر کەم پێوەندی عەشیرەتیان هەبوو. زۆرتری دانیشتوانی گوندەکان پاکار بوون. کاری کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، دەستکرد (سنعەت) و خزمەتکاریان دەکرد.

دیارە خەڵکی ئاسایی زۆر پتر لە جەماوەری ئاشیرەت (وەك چینی خاوەن زەوی) بوون. بەڵام نووسەرانی سەر وەدەوڵەتە زاڵەکان بە سەر کوردستان و زۆرتری خەڵکی دیش لایان وایە کورد هەموویان ئاشیرەت بوون و ئاشیرەتیش کۆچەر بوون. بڵاوکردنەوەی ئەو ڕوانگەیە لەلایەن دەوڵەتە زاڵەکان بۆ ئەو مەبەستەیە: گەلی کۆچەر، نە وڵاتی گەرەکە نە دەوڵەت!!

جیاوازی بەرچاوی كۆمەڵگای كورد لەگەڵ گەلانی هاوسێ لە چەمكی چینی زەمیندار (ئاشیرەت) لە كوردستاندابوو. زۆرینەی عەشیرەتی كورد بە نێوی ئاغاوەت، چینێكی هاو ڕەچەڵەك و خاوەن زەوی و لەوەڕگەو دێهات بوون، چینی خاوەن زەوی وێڕای دەست و پێوەندو گوند نشینەكان لە بەرامبەر پەلاماری دەرەكی و ناوەكی، دەسەڵاتی ئابوری و سیاسیی خۆیان دەپاراست. بۆ ڕاوەستانی ئەو چەمكەش ئیمارەت پێكهاتەیەكی پێویست بوو.

بە كورتی ساختاری عەشیرەت لە كوردستان لە ماوەی پتر لە (١٠٠٠) ساڵی ڕابردوودا چەمكی سیاسیی و كولتوری و كۆمەڵایەتی كوردانی نیشان دەداو تا دەورانی هاوچەرخ ئەو چەمكە بەردەوام بووە، بەڵام بەو حاڵەش دەسەڵاتی عەشیرەتی وەك دەرەبەگ مەودایەكی كورت و بەرتەسكی هەبووە، دەسەڵات و ڕوانگەی بیری سیاسیی عەشیرەت لە بازنەی سنوری زەوی و زاری بندەستی تێنەدەپەڕی. ئەو فۆرماسیۆنە ئابووری– سیاسییە (ئەمارەت) لە كوردستان، لەسەر دامەزراندنی دەسەڵاتی ناوچەیی (ئیماڕەت) ساغ ببۆوە. بەڵام گشت دانیشتوانی ئیمارەت لە چینی زەویدار(عەشیرەت) نەبوون. بەڵكو هەر میرنشینێك، لە كۆمەڵێك عەشیرەتی یەكگرتوو (وەك چەشنێك كۆنفدراسیون)(١٩) و جەماوەرێكی زۆری نائاشیرەتی (دانیشتوی ناوچەی بندەستی ئێل) پێكدەهات. بەڵام پێكهاتەی ئەو میرنشینانە هەڵگری بیری سازدانی دەسەڵاتێك بۆ گشت كوردستان نەبووە. ئەمیرێك كە بۆ سەرۆكایەتی ئیمارەت هەڵدەبژێردرا لە بنەماڵەیەكی تایبەت بوو كە زورجار بە عەشیرەت دانەدەندرا (بۆ نموونە ئەردەڵانێكان بە عەشیرەت نەدەناسران).

ئەگەر ئیمارەتێك لە بەرامبەر دەوڵەتە پادشاییەكانی دەوروبەر توانایی ڕاگرتنی سەربەخۆیی خۆی نەبا لە نێو خۆدا سەربەخۆ دەماوە، بەڵام خۆی بە دەسەڵاتی پادشایەتی (وەك دەسەڵاتی ناوەندی) هەڵدەپەسارد، ئەو چەمكە لەلایەن ئێران و عوسمانی دژ بە ئیمارەتە سەربەخۆكان كەڵكیان لێ وەردەگیرا، لێرەدایە كە دەبینین دەسەڵاتە كوردییەكان، تەنیا لە چوارچێوەی ناوچەییدا

بیریان کردۆتەوە، بیری گشت کوردو کوردستانیان نەبووە، لە فیکری دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسی بۆ وڵاتێك بە نێوی کوردستان نەبوون.

عەشیرەتەکان ئەوەندەی لە توانایان دابا بەرگریان لە دەست درێژی پادشا بۆ ناوچەی بندەست خۆیان دەکرد. هۆیەکەشی ئەوەبوو کە لە نێو کوردان عەشیرەتەکان خاوەن زەوی بوون، خۆیان لە ڕەوتی داسەپاوی سیستمی پادشایەتی دەوڵەتی سەرزەمینی دەپاراست. هەر بۆیەش خوازیاری دامەزرانی میرنشین بوون. میرنشین لە کاروباری ناوخۆدا سەربەخۆ بوو، ڕەوتی ئیقتاعی سیستمی پادشایەتی ڕەچاو نەدەکرت. ئەگەر دەوڵەتە زلەکان زۆر بەدەسەڵات بان ئەمیری ناوچەیان لادەبرد، بەڵام دیسانیش میری ناوچە لەنێو دەستڕۆیشتوانی ئیمارەت و بنەماڵەی میری لێکەوتوو هەڵدەبژێردرایەوە. (بڕوانە سەفەرنامەی ئەولیای چەلەبی لە مەڕ ئەمارەتی بەتلیس). لە دەرەوەی کوردستان داب ئەوە بوو کە وڵات بە موڵکی پادشا دەناسرا، لەلایەن پادشاوە بۆ هەر ناوچەیەك ئەمیرێك دەناردرا، کەسانێك کە ئەو قۆناغەیان پێدەدرا لە خزمەت پادشاو دەوڵەتدابوون، لەشکریان بۆ شا پێکەوە دەنا. شا دەیتوانی ناوچەکە وەربگرێتەوەو بیدا بە کەسانی تر.

بەڵام چەمکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی عەشیرەتی کورد(وەك چینی خاوەن زەوی لە ناوچەیەکی دیاریکراو) دژ بە ڕەوتی دەوڵەتی سەرزەمینی بوو، بنەماڵەکانی ئێل و ئاشیرەت بۆخۆیان خاوەن زەوی و دێهات بوون، ئەوان دانراوی دەوڵەت و پادشا نەبوون. پادشاو دەوڵەت نەیاندەتوانی بەهاسانی ناوچەی بندەستی بنەماڵەی ئاشیرەتی کورد داگیر بکەن. زۆرجار عەشیرەت بە تۆبزی لە ناوچەکانی خۆیان دوور دەخرانەوە، زۆربەی ئەو کاروانە عەشیرەتانە لەو ڕێیەدا دەمردن، بەڵام بەشێك لە ئەوانەی دوورخراونەوە ئێستاش هەر ماون، نموونەیەك لە ئەوانە، کوردانی نیشتەجێ لە خۆراسانن. تایبەتمەندی ئیمارەتی کورد ئەوە بوو کە هەموو ئاشیرەتەکانی سەر بە ئیمارەتێك مەسڵەحەتیان لە ڕاگرتنی دەسەڵاتی ئیمارەتەکەدابوو. ئەگەر چی ساختاری عەشیرەتی کورد لە چەشنی تۆڕێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیی و کولتوری گشت کوردستانی

دەگرتەوە، بەڵام بیری هەر عەشیرەتەی لە مەودای تەسکی ناوچەی بندەستی تێنەدەپەڕی، بۆ عەشیرەتی کورد، کوردستان وەك قەوارەیەکی خاوەن دەسەڵاتی سیاسیی سەربەخۆ مانایەکی نەبوو. عەشیرەتەکان تەنیا سەرەڕۆیی و بەرژەوەندی خۆیان لەبەرچاو بوو. ناسیاوێکیان لە مەسڵەحەتی نەتەوایەتی و نیشتمانی کورد وەك قەوارەیەکی یەکپارچە نەبوو، هەر نێوی خۆیان لەسەر زار بوو.

نووسەرو گەڕۆڵە دەرەکێکانیش ناسیاوێکی دروستیان لە ئەو تۆرە عەشیرەتییە (کە گشت کوردستانی دادەپۆشی) نەبوو. ئەوان گشت جەماوەری کوردیان بە رەچەلەکی ئێل و عەشیرەت دادەنا، لە حاڵێکدا ئاغاو عەشیرەت چینێکی خاوەن زەوی بوون، هەر بۆیەش لە مەودای کۆمەڵناسی بەشیکی زۆر کەم لە کۆمەڵگەی کورد ئاشیرەت بوون. بەڵام خەڵك و جەماوەری پاکار لە ناوچە ئاشیرەتێکاندا هەر بە نێوی ئەو ئاشیرەتە دەناسران، کە خاوەنی وڵاتەکە بوو. لەبەرچاوگرتنی تەواوەتی یان زۆرینەی گەلی کورد لە ساختاری ئاشیرەتیدا هەڵەیەکی گەورەیە، کە لەلایەن بەشێك لە نووسەران دەبیندرێ، زۆرتری ئەو ڕوانگانەش سەبارەت بە گەلی کورد لە دژی بەرژەوەندی کورد بەکار بردراون.

ئاشیرەتەکان هەتا سەر لایەنگری دەسەڵاتی ناوچەیی (ئیمارەت) نەبوون. کاتێك دەستیان بە تفەنگ ڕاگەیشت سەربزێویان دەستپێکرد بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی ئیمارەت هاوکاری دەوڵەتی ناوەندیان دەکرد، دیارە کاتێك دەسەڵاتی ئەمارەت نەیدەتوانی بەرگری لە سەربزێوی دەستدرێژی و راووڕووتی ئاشیرەتەکان بکات مەشروعییەتی بوونی خۆی لەدەستدەدا.

دەوڵەتانی ناوەندی بەلایەنگری ئاشیرەتەکان توانیان ئیمارەتەکان بنەبڕ بکەن، ئەوکات بە هاودەستی ئاشیرەتەکان لە کوردستان حکومەتیان دەست پێکرد، بۆ ئەو بەرنامەیەش پێویستیان بە قشوون نەبوو. بە لایەنگری و پێهەڵکوتن بەلایەنێك و تووڕەیی لە بەرەیەکی دی، ڕقەبرکێ بۆ خۆ لە دەوڵەت نزیککردنەوە لە ئاغاو ئاشیرەتەکان پەرەی گرتبوو. دەوڵەتیش لەو چەمکە بۆ پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆی لە کوردستان کەڵکی وەردەگرت و پێویستی بە

قشوونی دەوڵەتی بۆ دابینكردنی كوردستان نەبوو، بۆ نموونە كاتێك شازادەی قاجار حاكمی ناردراو بۆ ئەمارەتی موكری لە ساڵی ١٨٨٠ز بە هروژمی خەڵك بە ڕێبەری شێخ عوبەیدیللا ناچار كرا شاری مەهاباد (سابلاغ) بەجێ بهێڵێ، پێشتر شازادە لە دەوڵەتی ویستبوو كە هێزی هیمدادی بۆ بنێرن، نادر میرزای نایب سەلتەنەی قاجار(٢٠)، دەنووسێ ئەو حاكمە ناشارەزایە نازانێ كوردستان تەنیا ولاتێكە بۆ دابینكردنی پێویستی بە قشوونی دەوڵەت نییە، حاكمی وریاو لێهاتوو ئەو كەسەیە بتوانێ لە رقەبەرایەتی ئاشیروت و ئاغاكانی كورد بۆ حكومەت كەڵك وەربگرێ! (هەمان سەرچاوە)

وەك ئاماژەی پێكرا كاتێك ئاشیرەتەكان ڕاوو ڕووتیان دەكرت دەسەڵاتی ئیمارەت مەشروعییەتی خۆی لە دەست دەدا، لە سەدەی ١٨ و ١٩ ئیمارەتی موكری بە ئەو گرفتە دوچار ببوو، تاكوو لە (١٢٥٦ ك.م. ١٨٤٠ز) زۆرتری ئاشیرەتەكانی سەربە ئیمارەتی موكری شاری سابلاغیان گەمارۆداو دەسەڵاتی نیمچە سەربەخۆی ئیمارەتی موكری لە ناوبردرا. دواتر تا هاتنە سەركاری ڕەزاشا، ئاشیرەتەكان دەرەبەگایەتیان دەكرد، چون دەوڵەت توانای بەرگری لە دەستدرێژی ئاغاوەت نەبوو، لەسەرەتای بە دەسەلات گەیشتنی رەزاشا خەڵك لەدەست دەرەبەگان ڕزگاربوون، بەڵام دواتر كە دیتیان ئەو دەوڵەت– نەتەوەیە، هەویەتی كورد لە ناودەباو كورد لە دەسەڵات بەلاوە دەنێ، ئەوجار زۆرینەی خەڵك كەوتنە ئەو بیرە كە كوردیش دەبی دەوڵەت– نەتەوەی خۆی هەبێ.

ئاشیرەتەكان و بیری كوردایەتی:

كوردایەتی بە ڕواڵەت ئاماژە بە هەوڵ و تێكۆشان بۆ ڕاگرتن و ڕێزگرتن لە بەرژەوەندی و پێناسەی گەلی كورد دەكات، دیارە ترۆپكی ئەو چەمكەش بەخاوەن دەسەڵاتبوونی گەلی كوردی لێ دەكەوێتەوە، بەڵام زاراوەی كوردایەتی زۆرجار وەك دروشمێك بۆ خۆ نواندن و داپۆشینی گشت كردەوەی دوور لە بەرژەوەندی گەلی كورد بەكار دەبردرێ، وادیارە ئەو ڕەوتە لە نێو هەلپەرستان جێكەوتووە، هەركارێك دەكەی بیكە، بەڵام خۆت بە كوردایەتییەوە هەڵواسە، بەو چەشنە خۆت دەپەرێنییەوە!

كاتێك دەسەڵاتی ئاغا و دەرەبەگ لە كزیی دەدا، بیری كورد بوون ( بە زاراوەی ئەوڕۆ كوردایەتی) سەرۆك ئاشیرەتەكان دەگەشاوە، ئەوجار دەرەبەگەكان بە نێوی ڕاگرتنی دەسەڵاتی كورد لە دەوڵەتی ناوەندی ڕادەسان و جەماوەر وەدوویان دەكەوتن، بیری كوردایەتی تا دامەزران و بەهێز بوونی دەوڵەت– نەتەوە لە توركیاو ئێران– بە ڕێبەری دەرەبەگەكان وەگەڕدەكەوت . كەسایەتی ئایینی و كوردایەتی، بە لە ناوچوونی دەوڵەتە ناوچەییەكانی كورد، دانیشتوانی كوردستان زۆر بێپەنا مابوونەوە، دەرەبەگەكان تەنیا چاودێری ناوچەی بندەستی خۆیان دەكرد. لەو سەردەمەدابوو كە شێخەكان وەك نوێنەرانی ئایینی بە چەشنێك بۆشایی نەبوونی دەسەڵاتی میرەكانیان پڕكردەوە. شێخەكان ببوونە جێی هیواو ئومێدی زۆرینەی گەلی كورد، دەستڕۆیوی شێخەكان هۆی پاراستنی خەڵكی بێ دەوڵەت بوو، دوای لاچوونی میرە كوردەكان، یەكەمین ڕاسانی كوردان (لە دەوڵەتانی زاڵ بە سەر كوردستاندا) بە ڕێبەری شێخ عوبەیدیڵڵای شەمزینان بوو (١٨٨٠ز.) دواتر وردە وردە ئێل و ئاشیرەت بە تەواوی لە باوكەوتن، بە دوای واندا ئەوجار كوردایەتی بوو بە دروشمی ڕووناكبیران، ڕێكخراوە سازدران، كوردایەتی ڕەوتێكی نوێی بە خۆی گرت تا ئەو دواییانە كەسایەتی ئایینی لە بزووتنەوەی كورداندا بەشدارێكی بەرچاویان هەبوو. بەڵام لە ڕابردوودا جووڵانەوەكان وەك ئەوڕۆ بە بەرەی ئایینی و غەیری ئایینی دابەش نەكرابوون.

ئەوەی كە دەڵێی: كورد" هەوڵی زۆریدا لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامدا دەوڵەتی میدیا بە شێوازێكی دی زیندوو بكاتەوە"، وەك لە سەرەتای ئەو پرسیارە ئاماژەم پێكرد، ئەگەر مەبەستێكی وا لە ئارادا بووبێ، ئەمن زانیارێكم لە ئەم هەوڵانە نییە، بڕوا ناكەم كورد لە ئەو سەردەمەدا لە مێژووی مێدیا ئاگادار بووبێ و هەوڵی زیندووكردنەوەی چەشنێك دەسەڵاتی ئەوتۆی دابێ، ئەگەر ئاگاداری لە مێژووی میدیا لە ئارادابا، دەیانزانی هۆی پێكهاتنی دەوڵەتی میدیا، یەكگرتوویی بووە، لەحاڵێكدا ئێمەی كورد كە شانازی بە میدیا دەكەین ئێستاش لە كردەوە و بیردا، بنەمایەك بۆ یەكگرتوویی نابیندرێ، ئەوەش هۆی بێ

دەسەڵات مانەوەی نەتەوەی ئێمەیە کە گەورەترین گەلی بێ وڵات و دەسەڵاتی جیهانین.

وڵاتی میدیا، لەلایەن ئاشورێکانەوە، تاڵان دەکرا، دانیشتوان بە تۆبزی ڕادەگوێزران و بە دیل دەگیران، لە ئاخریداسەرۆکانی میدیا بەو ئاستە گەیشتن کە دەبێ یەکبگرن، ئەو کارەیان کردوو سەرکەوتن، بەڵام لە سەردەمی سازدانی ئیمارەتەکاندا تا لەناو چوونیان (کە پتر لە یەك هەزارساڵی خایاند) هەوڵێك بۆ یەکگرتوویی لە ئارادا نەبووە.

لە خوێندنەوەی مێژووی میرنشینە کوردییەکان نەبوونی بیری یەکگرتوویی و پێکهێنانی قەوارەیەکی سیاسیی بۆ کوردستان زۆر بەرچاوە، لە ڕەوتێکی ئەوتۆدا کوا دەکرێ بڕوا بکەین لە سەدەکانی پێشوودا بیری یەکگرتوویی و پێکهێنانی دەسەڵاتێك بۆ گشت گەلی کورد لە ئارادا بووبێ؟

**+ مێژووی دوورو درێژی کورد وابووە سەرکردەو دەسەڵاتدارەکانی میرنشین و شۆڕش و ڕاپەڕینەکان کەسانی ئایینی بوون، ئایا بۆچی ئەمانە نەیانتوانیوە لە ژێر کاریگەری ئایینیشدا بێت بیر لە پرۆژەیەکی لەو شێوەیە بکەنەوە و میللەتەکەیان لە قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك ڕزگار بکەن؟**

ئەبریشەمی: دەسەڵاتدارانی میرنشینەکانی کورد، موسوڵمان بوون. زۆریشیان لە ڕێزەی کەسایەتی ئایینی بوون. دوای لە ناوچوونی میرنشینەکان زۆرتری سەرکردەی شۆڕش و ڕاپەڕینە گشتێکان کەسایەتی ئایینی بوون (وەك ڕاست بوونەوەی شێخ عوبەیدیڵلا، شێخ مەحموود، شێخ سەعید و...تاد)، ئەوانە گشتیان بیریان لە پرۆژەیەکی ئەوتۆ کردۆتەوە "کە میللەتەکەیان لە قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك ڕزگار بکەن". بەڵام کوا ئایین دەتوانێ هەموو گرفتەکانی کۆمەڵگە چارەسەر بکات؟ ئەگەر وابا تا ئێستا وێنەیەك دەدیترا.

لەوەڵامەکانی پێشوو ئاماژە کرا کە کورد زۆر درەنگ بەم قۆناغە گەیشت کە پێویستە گەلەکەی خاوەنی قەوارەی سیاسیی دیاریکراو بێت، کاتێکیش بەوئاستە گەیشت، دەسەڵاتەکانی زاڵ بەسەر کوردان دا زۆر بەهێز بوون و بەرگریان لە سەرکەوتنی پرۆژەیەکی ئەوتۆ دەکرد و ئێستاش دەیکەن. ئەو سنوورانە بە تۆبزی

له نێو خاکی کوردان کێشراون و نیشتمانی گەلی کوردیان لەت و کوت کردووه. ئەو سنوورانه به پیرۆزو ئاسمانی دادەنێن تا کورد باس له گۆڕینیان نەکات.

له بەرامبەر کورداندا تورکان له هەزار ساڵ له مەوبەرەوه که ڕوویان له ئێران، کوردستان و ئاسیای بچووك کرد له بیری دامەزراندنی دەسەلات و قەوارەی تایبەت به خۆیان بوون و ئەو کارەشیان له سەرەتاوه به ئەنجام گەیاندووه، دەسەڵاتدارانی تورك به دوای دامەزراندنی دەسەلاتی بەرفراوان و گەوره بوون، بەلام دەسەلاتدارانی کورد به دەوڵەتی ناوچەیی ڕازیبوون، هەرچەند دەیانزانی ناتوانن له بەرامبەر دەسەلاته زلەکاندا له دەسەلاتی ناوچەیی خۆیان بەرگری بکەن (بڕوانه ئەو مەسەلەی کوردی: ئەگەر زۆرهات، قەباڵه بەتاڵه) بەلام بۆ دۆزینەوەی شێوازێك بۆ یەکگرتوویی و بەهێزکردنی توانایی پاراستنی میرنشینەکان سەرکەوتوونه بوون. ورده ورده کوردان دەسەلاته ناوچەییەکانیشیان لەدەستدا، دوای لەدەستدانی دەسەلاته میرنشینەکان ڕاپەڕینەکان به ڕێنوێنی کەسایەتی ئاییندار دەستی پێکرد، ئەو ڕەوته هاوبەشێکی بەربلاوی جەماوەری بەجوولانەوەکاندا، تۆوی کوردایەتی داچاند. بەلام وەپاشکەوتوویی بیری جەماوەرو شێوازی وەدواکەوتووانەی جوولانەوەکان له بەرامبەر هێزی تەیارو ڕێنوێنی سەرۆکه پڕ له فرۆفێڵی دوو زلهێزه به نێو موسوڵمانەکان تێکدەشکان. لەو جوولانەوانەدا بیری ئایینی بۆ تیندانی هەستی ڕاپەڕین و ڕزگاری وێڕای هەست و بیری نەتەوایەتی له گەڕدابوون. جوولانەوەکان لێکدابڕاو نەبوون.

(۲۰۰) ساڵ بەرلەوەی هێرشی بەربلاوی تورکان بۆ ئێران و کوردستان و ئاسیای بچووك دەست پێبکات کوردان خاوەن دەسەلات و دەوڵەتی ناوچەیی بوون، وەك ئاماژەی پێکرا، له سەرەتای سەدەی سێیەمی کۆچی "سەدەقە"نێوێك (له کوردانی موسڵ که به "زریق" ناوبانگی دەرکردبوو)، بەرەو ڕۆژهەلات هات و شاری ورمێی گرت و کردی به پێتەختی خۆی و باڵی بەسەر ئەم ناوچەیه کێشا (که ئەوڕۆ ناوی ئازربایجانی ڕۆژئاوایان بەسەردابڕیوه)، سەدەقه بۆخۆی و براکەی له ورمێ قەسرو بارەگایان سازکرد. له ساڵی (۲۰۹ ك.م). مەئموون خەلیفەی عەباسی فەرمانی والی ئازربایجان و ئەرمەنستانی بۆ دەرکرد.

لە كوردستانی باكووریش كوردان لە ساڵی (٣٥٦ ك. م). دیاربەكریان كردە پێتەختی خۆیان. ئەحمەد كوڕی مەروان كە لە ساڵی (٤٠١) پادشای وێ بوو، لەلایەن خەلیفەی عەباسی لەقەبی"ملك عادل ناصرالدولة"ی پێدرا. ئەو سەردەم كە توركانی سەلجوقی خەریكی پەرەپێدانی دەسەڵاتی خۆیان بوون و توانیان گەورەترین ئیمپڕاتوری درێژخایەن لە جیهان دروستبكەن، مەلك عادل لە دەربارەكەیدا ٣٦٦ ژنی كۆكردبۆوە(٢١) وەك دەبینی سەردارەكانی كورد لە فیكری پێكهێنانی قەوارەیەك بۆ كورد نەبوون. ئاییندارەكانی كوردیش كاتێك دەیانتوانی قەوارەیەك لە دەسەڵات دابمەزرێنن كە سەركردەكان بیرێكی ئەوتۆیان هەبا، موعاویە بیرێكی ئەوتۆی بۆ دەسەڵاتی بنەماڵە عەرەبەكان هەبووە، بنەماڵەكانی عەشیرەتی دیكەی عەرەبیش بیرێكی وایان هەبووە.

عەباسێكان بۆ ماوەیەكی درێژ ئەو بیرەیان لە ژێر دروشمی بنكەی دەسەڵاتی ئیسلامیی پاراست. بەڵام سەركردە كوردەكان بیرێكی ئەوتۆیان سەبارەت بە پێكهێنانی قەوارەیەك بۆ گەلی كورد نەبووە. كوردان بە پێچەوانەی گەلانی دی زۆرتر لە خزمەت دەسەڵاتی غەیری كورددا كۆدەبوونەوە. بیرتەسكی سیاسیی و كۆمەڵایەتی پەیوەندێكی ئەوتۆی بەئایینەوە نییە.

بۆ لە خۆمان ناپرسین كوردان بەر لە ئیسلام چ بوون؟ كام قەوارەی سیاسیی دیاریكراویان هەبووە؟ بۆ بەر لە ئیسلام خۆیان نیشاننەداوە؟ گەلی كورد (وەك گەلانی ناوچە) بەر لە ئیسلامیش ئایینی بوو، بەڵام ئایین و كەسانی ئایینی (چ بەر لە ئیسلام و چ دواتر) نەیانتوانیوە "میللەتەكەیان لە قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك ڕزگار"بكەن. ئیسلام دەڵێ: هەر گەلێك تا گۆڕانكاری لە دەروونی خۆیدا پێك نەهێنی، ئاڵوگۆڕێكی بەسەردا نایە.

گەلی كورد بە هاتنی ئیسلام نێوی هاتە نێو نێوان، ئاستێكی سیاسیی پەیدا كرد، بەڵام قەوارەی جوگرافیای كورد زۆر بەربڵاو بوو، كوردان لە بەرامبەر عەرەبەاندا لە خۆزستان و ناوچەی فارس (شیراز) شەڕیان دەكرد، دەڵێن ئەو سەردەم (٥٠٠) هەزار ماڵی كورد لە فارس و باشووری ئێران بوون. ئەوڕۆ لەو مەڵبەندە بەرینە، قەوارەیەكی جوگرافیایی لە كورد نابیندرێ، ئەوسەردەم بە

وڵاتە کوردنشینەکان (اقلیم الجبال) دەگوترا. بەڵام ئەرمەنستان لە سەرەتاوە قەوارەی تایبەتی هەبووە، مەئمون خەلیفەی عەباسی زریقی کورد دەکاتە فەرمانڕەوای ئەرمەنستان و ئازربایجان، لە حاڵێکدا زۆرتری وڵاتی بندەستی زریق کوردنشین بووە، بەڵام قەوارەیەکی سیاسیی– جوگرافیایی بە نێوی کوردستان لە نێو نێوان نەبووە.

قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك بۆ کورد لەقەیرانی بیرتەسکی سیاسی و کۆمەڵایەتی ساز بووە. بیرتەسکی سیاسیی، پتر لە هەموو هۆکارێك بۆتە هۆی بێ قەوارەیی کورد. تۆوی پرۆژەیەکی سیاسیی و کۆمەڵایەتی کاتێك لە نێو کۆمەڵگەیەك دەچێندرێ (دەگۆڕێ و دەپشکوێ)، کە زۆرینەی جەماوەر بەتایبەت دەسەڵاتدارەکان هەوڵی بۆ بدەن و بڕوایان بە پێویستی پرۆژەیەکی ئەوتۆ هەبێ بۆ ئەوەی لە نەبوونی قەوارەیەکی ئەوتۆ ڕزگارمان بێ، پێویستمان بە تەکاندن و خاوێنکردنەوەی خدەو بیروڕامان هەیە. بنەمای بیری سیاسیی– کۆمەڵایەتی کورد پێویستی بە گۆڕانکاری هەیە، ئەو گۆڕانکارییە وەك پێویست پێکنەهاتووە، دەرفەتەکانی مێژوویی لەدەست چوون، بەڵام نابێ هیوا لەدەست بدەین، ئەگەر بمانەوێ دەتوانین گۆرانکارییەکی قووڵ و بەرین لە خدەو ڕەفتاری خۆماندا پێك بێنین.

تا ئەو دواییانە سەرکردەکان بیریان لەوە نەکردۆتەوە کە خەڵکی خۆیان وەك گەلێکی تایبەت چاو لێبکەن و بە پێویسی بزانن کە ئەو گەلە دەبێ خاوەن دەسەڵات و قەوارەیەکی دیاریکراو بێ. سەرکردەی کورد وەك سەرکردەی تورك یان گەلانی تر لە سەرەتاوە هەستیان بە ئەو ڕاستییە نەکردبوو کە لە دنیایەکی ئاخندراو لە فێڵ و ملهوڕی نەدەکرا پشت بە دەسەڵاتێکی بچووکی وەك ئەمارەت بەسترابا. بەڵکو دەبوو لە فیکری یەکگرتوویی ئەو ئەمارەتانەو پەرەپێدانی دەسەڵاتی هاوبەشدابان.

بڕوانە لە سەرەتای ئیسلامەوە لە کوردەواریدا جگە لە بنەماڵەی صەلاحەدینی ئەیوبی– ئەویش لە دەرەوەی کوردستان– پادشایەتی گەورەو بەردەوام یان کەسایەتی خاوەن بیری پێکهێنانی قەوارەیەك بۆ کوردستان هەڵنەکەوتووە، کورد

كەسێكی وەك فیردەوسی نەبووە، یان لە نێو كورداندا كەسایەتی دەنگهەڵبڕی وەك حەسەنی سەباح نەدیتراوە. فیردەوسی پتر لە یەك هەزار ساڵ لەمەوبەر لە ڕوانگەی بیری قەوارەو دەسەلاتێكی ئەفسانەیی بۆ ئێران هەستی پێكهێنانەوەی قەوارەیەكی سیاسی– فەرهەنگی لە نێو فارسەكاندا داڕشتووە. حەسەنی سەباح بەخۆی و جەماوەریك لە شێوازی كۆمەڵەیەك بۆ بەرەو پێشبردنی بیری خۆیان زۆریان كاركرد و دەسەلاتە گەورەكانیان تۆقاند. ئەو كۆمەڵە نەدیارە بۆ بەجێهێنانی مەبەستێك وا تەعلیم دراو بوون كە دەسەلاتە زلەكان لێیان دەترسان، ئەوان توانیان لە دژ سەلجوقیان و گشت دەسەلاتدارنی سەردەم ڕۆبێن.

بە كورتی لە نێو كورداندا پادشایەتی بەهێزو بەردەوام پێك نەهاتووە، خاوەن بیری وەك فیردەوسی نەدیتراوەو پێكهاتەی وەك جەماعەتی حەسەنی سەباح هەڵنەكەوتووە...

مەبەست ئەوە نییە كە شێوازی بیرو كردەوەی دامەزراندنی پادشایەتی فرەخوازی تالانكەرو داگیركەر ڕەوتێكی پەسندكراو بووە، بەلام تا ئەو جیگایەی بۆ بەرگری لە دەسەلاتی خۆی كورد پێویست بووە، دەبوو بیر لەو چەمكە كراباوە، تێكۆشان بۆ پێكهێنانی قەوارەیەك بۆ كورد لە ئارادا با!

كورد لە چ سەردەمێك پەی بە ئەوە برد كە ئەویش نەتەوەیەكەو دەبێ خاوەن دەسەلات و قەوارەیەكی تایبەت بە خۆی بێت؟ كەی لێی حاڵی بوو كە ولاتەكەی دابەشكراوەو بێ قەوارە ماوەتەوە؟

كەی بۆی دەركەوت دوو زلهێز كە خۆیان لە بن عەبای ئاییندا حەشار داوە، ولاتی گەلی كوردیان كردۆتە مەیدانی شەرانخێوی خۆیان و شەڕیان بە سەر ئەو خەڵكە بێدەرەتانەدا سەپاندووە؟ ئەو دوو زلهێزە بە نێو موسوڵمانە، بەكرێگیراوی نەفسی فرەخوازی خۆیان بوون نەك ئایین. ئەوانە لەهەر لایەك میرنشینە كوردەكانیان دژ بە یەك هاندەدا و بە زۆرەملی واداریان دەكردن پەلاماری ئەو ناوچە كوردنشینانە بدەن و كاولیان بكەن، كە گوێ لە مستی ئەوان نین یان لە بەرەی زلهێزەكەی تر!

دیاره ئەورۆ کورد دەتوانێ هیوای به ڕزگاری گەلی خۆی بێ، کوردیش دەتوانێ هەوڵ بدا وەك گەلانی تورك و عەرەب و فارس خاوەن دەسەڵات و قەوارەی تایبەت به خۆی بێ، له ئایینی ئیسلامدا نەهاتووه که کورد دەبێ بندەستی گەلانی هاوسێ بێ، وڵاتەکەی له بندەستی هاوسێکانیدا بێ و بۆخۆی بێ قەواره بمێنێتەوه.

سنووره داتاشراوەکان لەسەر شێوازی ئایین یان ویستی گەلی کورد پێکنەهاتوون تا پیرۆز و نەگۆڕ بن، ئەو قەوارانه کاتێك پیرۆزن که دانیشتوانی وڵاتەکه له تەواوی مەودای دەسەڵاتدا هاوسان و هاوبەش بن. ئەگەر هاتوو لەم قەوارەیەدا گەلێك وەك بندەست چاوی لێکرا، پێکهاتەی ئەو قەوارەو دەسەڵاتە، پیرۆزی و مەشروعیەتی خۆی لەدەستدەدا.

بەڵام لەمەر سەرکردەو دەسەڵاتدارەکانی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان که جووڵانەوەی هاوچەرخی گەلی کورد دەگرێتەوه قسه زۆره، جووڵانەوەی ڕێنوێنی کراو پێویستی به لەبەرچاوگرتنی گەلێك چەمك و ئەوزاع هەیه. بەڵام نەگونجاو نییه، پلان و پرۆژەو ستراتیژی لێکدراوەوه بنەمای جووڵانەوەی ڕێنوێنی کراون. پلان بۆ قەوارەیەك تایبەت به کورد چەمکی گشتی دەگرێتەوه، هەر بۆیەش پلان بۆ جووڵانەوەی ناوچەیی نابێ دژ به پلانی گشتی بێت.

ئێمەی کورد نابێ هیوای ڕزگاری لەدەست بدەین، ئەگەر پادشایەتی تالانکەرو مرۆڤکوژو داگیرکەرمان نەبووه، ئەوه جێی شانازییه، بەڵام باشتره ئەو شانازییەی گەلی خۆمان به جیهانیان رابگەیەنین، خۆمان به دەروجیران بناسێنین.

دەسەڵاته زاڵەکان پێناسەی گەلی کوردیان له لای گەلانی دەرەکی و ناوخۆی وڵات ناحەز کردووه. له جیهانیشدا وێناچێ ئاگایان له مێژووی گەلی کورد هەبێ، ئەو ڕاستییه داپۆشراوه که گەلی کورد گەلێکی داگیرکەر نەبووه، گەلی کورد له (٥٠٠) ساڵی ڕابردوودا له ڕێگای سەرکەوتنی ڕۆژئاوا (له ئەنجامدا گشت جیهان) چ خەسارێکی له بن نەهاتووی لێکەوتووه. ئەو گەله بۆ بەرژەوەندی ڕۆژئاوا له (٥٠٠) ساڵی ڕابردوودا نیشتمانەکەی کاولکراوه.

جیهان ئاگای لەوە نییە کە زلهێزەکانی رۆژئاوا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، بە داتاشینی دەوڵەتە نوێیەکان و بەکەمایەتی دەرهێنانی گەلی کورد لەو دەوڵەتە داتاشراوانەدا چ زوڵمێکیان لەگەلی کورد کردووە؟

ئەم وڵاتە داتاشراوە تازە پێکهاتووانە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەلایەن رۆژئاواییەکان بە تایبەت بەریتانیا قەوارەیان بۆ پێکهات، ئەو قەوارە داتاشراوانە بەسەر گەلی کورددا سەپان، لەم قەوارە دەستکردانە گەلی کوردیان کرد بە کەمایەتی و ناکوردەکانیان کرد بە زۆرینەی داگیرکەرو فەرمانڕەوا. بەداخەوە ئەم وڵاتە داتاشراوانە لە بەر زۆر هۆیان کەوتۆتە مەودای بەرژەوەندی دەسەڵاتە زلەکانی ناوچەو جیهان.

لە لایەکی دیش جێگای سەرسوڕمانە کە ئەو گەلانەی لە مێژوودا خاوەنی دەوڵەتانی داگیرکەرو تالانکەر بوون ئەورۆ ئاستێکی بەرزیان لە نێو وڵاتانی جیهاندا هەیە، لە چاندێکی ئەوتۆی سیاسیدا گەلی کورد وەبەرچاو نایەت! پێویستە رواڵەتی مرۆڤدۆستانەی مێژوویی خۆمان بە جیهانیان بناسێنین. وەك مەولەوی دەڵێ:

قوت از حق خواهم و توفیق و لاف تا به سوزن برکنم این کوه قاف

**پەراوێزەکان:**

١– ئەوەش حاشای لێناکرێ لایەنێك لە بیروباوەڕی بەرەی مرۆڤ (چ ئایینی و چ غەیری ئایینی) لەسەرەتاوە تا ئەورۆ، تێکەڵاوی خورافە بووە.

٢– ئەبریشەمی عەبدوڵا، کتێبی "هویت تاریخی و مشکلات کنونی مردم کرد" نشر ئانا، تاران، ١٣٨٥ لاپەڕەی ٢٣٥، قادری، حاتم، فصلنامه مگالعات ملی، ش. ١١ ص. ١٣٣.

٣– وەرگیراو لە کتێبی نووسەر: "مبانی فرهنگی دولت"، چاپی تاران، ١٣٧٠ ـ ١٩٩١ز.

٤– سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٥٦.

٥– سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕەی ٦٢ و ٦٣.

٦- بروانه كتێبی توسعه و تچاد، نووسراوی رفیع پور، فرامرز، تاران، شرکت سهامی انتشار، ص ٤٨١

٧- عقلمند پرویز، مشاهری ئازربايجان غربی، مؤسسه قصیده سرا، مقدمه ص ٢٩، وەرگیراو له کتێبی سفرنامەهای ونیزیان، انتشارات خوارزمی، تاران، لاپەڕەی ٤٧٨)

٧- رندل یوناتان، "با این رسوایی چه بخشایشی"، وەرگێر بۆ فارسی ئیبراهیم یونسی، لاپەڕەی ٣٠ (ئەو کتێبه لەلایەن کاك سەلاحی ئاشتی وەرگێرراوەته سەر کوردی).

٨- اسلامی ندوشن، محمد علی، ڕۆژنامەی ئیتلاعات، ٢٨/ ٨ / ١٣٧٧.

٩- هینتس والتێر، کتێبی "تشکیل دولت ملی در ایران" ١٣٦٢، نشر خوارزمی تاران.

١٠- تاریخ عیمانی، ج. ٢ ترجمه دکتر وەهاب ولی، ص ٣٠٧ الحاق اناتۆلی سرقی به عیمانی (له سەرەتای ج ٢ی مێژووی کوردستان، نووسینی مردۆخ، ئەو ڕێککەوتننامەیه نووسراوە).

١١- فارسی بابەتەکه له لاپەرەی ٧٢ (هینتس): فصلی از تاریخ ئاق قوینلو که بخصوص از نظر تاریخ فرهنگ و مدنیت شیرین و جذاب است و به بحث ما نیز ارتباط دارد در این مقام مستحق امعان نظر بیشتری است...

١٢- هتد. لاپەڕەی ٧١.

١٣- هتد، لاپەرەی (٤٤ و ٤٥).

١٤- لاپەرەی (٨٥) کتێبی نووسەر: هویت تاریخی و مشکلات کنونی مردم کرد، وەرگیراو له د. م. سالح ئیبراهیمی.

١٥- احمدی حمید، قومیت و قوم گرایی در ایران از افسانه تا واقعیت، چاپ تهران، نشر نی، ص ١٩٢ (له کتێبی هویت تاریخی و مشکلات کنونی مردم کرد، نووسەر، به درێژایی (٨١) لاپەڕە وەڵامی ئاڵۆزکارێکانی ئەو مامۆستایەم داوەتەوە.

١٦- بۆ زانیاری پتر، بڕوانه سه‌رچاوه‌ی پێشوو فه‌سڵی ٢. ئه‌و بابه‌تانه له کتێبی نووسه‌ر (هویت تاریخی، پێشوو) به ووردی که‌وتوونه به‌ر باس. لاپه‌ڕه ١٠٤

١٧- بڕوانه کتێبی جغرافیا و تاریخ کردستان/ وقایع نگار کردستانی، عه‌لی ئه‌کبه‌ر، انتشارات توکلی، تاران.

١٨- وان برۆیین سێن مارتین، کتێبی شیخ ئ‌غا دولت، وه‌رگێر ئیبراهیم یونسی

١٩- نادر میرزا، نایب السلگه قاجار "تأریخ و جغرافیای دار السلگنه تبریز"، چاپ سنگی اقبال

٢٠- (هویت تاریخی... پێشوو، لاپه‌ڕه‌ی (١٠٤).

٢١- سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

# نووسەرو لێكۆڵەری زانستی ژیۆپۆلۆتیكی حوسێنی مەدەنی



**نكولی ناكرێ تا ئەم سەردەمەش نەخشی رێبەرانی دینی لە بزاڤی رزگاریخوازیی كورددا زۆر زەق و بەرچاو بووە، ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر خوێندنی ئەو زانستانەی كە لە حوجرەكان فێریان دەبوون.**

- 1938 له سابڵاخ له دایکبووه.
- 1975 له زانستگای تاران ماستەری له زانستی جیۆپۆلۆتیکدا وەرگرتووه.
- له ئامادەییەکانی شاری مەهابادو زانکۆی ورمێ بابەتەکانی جوگرافیاو کۆمەڵناسی وتووەتەوە.

بەرهەمە چاپکراوەکانی بریتین له:

1 ـ منابع أب وانرژی سد مهاباد.
2 ـ شرکتهایی سهامی زراعی سنندج.
3 ـ وچع معیشت در روستای "بەلەبان" پیرانشهر.
4 ـ جنبشهای آزادیبخش ملی در کردستان.
5 ـ ترافیك شهر تهران.
6 ـ کارتۆگرافی شهرستان مهابادو پیرانشهر.
7 ـ أزسوما تا آشنویة.
8 ـ دینامیزم مبارزاتی خلق کرد در کردستان ایران.
9 ـ کوردستان‌و ستراتیژی دەوڵەتان ـ دووبەرگ.

- ئێستا بەهۆی دۆخی سیاسییەوە دانیشتووی سنووری قەزای کۆیەیە له کوردستانی عێراق.

**+ بە بۆچوونی تۆ وەکو پسپۆڕێکی بواری جیۆپۆلیتیکی سیاسیی، بۆچی کورد کیانو قەوارەیەکی سەربەخۆی خۆی نییە؟ لە کاتێکدا لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە زیاتر لە (40) ملیۆن کەسە؟**

حوسێنی مەدەنی: نەتەوەی کوردو کوردستانیش وەك نیشتمانی نەتەوەی کورد دوو ئەکتەری خولیای مێژینەی سروشت و کۆمەڵمرۆی بەستنی جوگرافیی ئەم گۆی زەوییەن کەتێیدا گووراونەتەوە، وارە تایبەتییەکانیان لە رووی مورفولۆجیو مرۆییەوە سەرنجڕاکێشن لە ئاوێتەبوونی ساختارە سروشتی مرۆیی و سیستمە سیاسییو ئابورییەکاندا پانۆڕامای مێژووی سیاسیی کورد نەخشێندراوە، لەو نەخش و نیگارەدا خاڵە نێگەتیڤو پوزەتیوەکان راگرو پاڵنەری پێناسەکردنی مافە نەتەوەییەکانی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستانن لە فۆرمە جۆراو جۆرەکانی مافی دیاریکردنی چارەنووس داخۆی دەردەخات و هەتا بەرەو هەڵکشانی لوتکەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی لە ئافراندندایە، بە گشتیی هۆکارەکان بە تاكو بە کۆمەڵ شوێندانەربوون.

وەك نموونەیەك لەم بابەتە دەکرێ ئاماژە بە نەبوونی کەناراوی دەریایی لە کوردستاندا بکەین، دەتوانین وەك لاوازترین خاڵیش توێژینەوەیەکی چڕو پڕیشی لەسەر بکەین، کوردستان لەبەر نەبوونی رێگای بە دەریا ئازادەکانی جیهان تووشی گەمارۆی سەرزەمینیو قەیرانی جیۆپۆلیتیکی بووە، لە نێو بازنەی هێڵی سنووری وشکانیی وڵاتە دراوسێکاندا قەفی خواردۆتەوە، کە هەرکام لەوانە شانازی بە هەڵکەوتی شازی جوگرافیاییو مێژووی ئوستوورەییو جسناتی رەگەزییان دەکەنو لە دەربڕینی سۆزی ئایینی و خۆپەرستییاندا کەم وێنەن لەسەر یەك چاخی ئیمپراتۆریەتی سێگانەی ئێرانو عەرەب و عوسمانی شوێندانەربوون لەسەر دامرکاندنی مەشخەڵی پڕ هیوای کوردەکان لەم ئاقارە ئیقلیمییەدا، ناسیۆنالیزمو ئایین دوو چەمکی بەهێزی ئەم چاخە نوێیەن، کە خاكو نەتەوەی کوردیان کردۆتە پاشکۆی شکۆداریی ئیمپراتۆریەتی وڵاتەکانیان لە دوو

ههزارهی رابردوودا.

له بهكگراوندێكدا ئهگهر سهیری مێژینهی كوردستانیش بكهین به دوای رووخانی ئیمپراتۆریهتی مادو پاشهكشهی مادهكان بۆ ناوچه شاخاوییهكانی زاگرۆس، كوردستانو كوردهكان به یهكپارچهیی لهناو كیانی نیشتمانیو نهتهوهیی خۆیاندا نهماونهتهوه، ئهو (40) ملیۆن حهشیمهته كوردهی كه ئێوه ئاماژهی پێ دهكهن، مخابن ناكرێ وهك نهتهوهیهكی یهكگرتووی (40) ملیۆن كهسی له حاڵی ئێستادا سهیری بكهین؟ نهتهوهیهكی به ئانقهست پارچه پارچه كراوه، لهناو تهوژمی لافاوی ناسیۆنالیزمی فهرمانڕهواكاندا پهلهقاژهی خۆدهرباز كردنێتیو ئێستا له ئاستانهی خۆبووژاندنهوهیدایه، جارێ مهودای گهیشتنی به ستراتیژییهكی یهكگرتووی نهتهوهیی نهبڕیوه، پرۆسهكه هێشتا دهڵهمهیهو نهیتوانیوه ببێته پۆتانسێلێكی(جهد ،قدره) بهوزهی نهتهوهیهكی (40) ملیۆن كهسی، ئهگهر واخهلهستی له قهوارهی نهتهوهیهكی پڕ چهشیمهتدا رهوڕهوهی مێژووی ژیارهكهی ڕهتێكی دیكهی دهبرد، ئهو تانو پۆ كۆمهڵایهتیی سیاسییهی كه ئێستا بۆته وارشهی ژیانی سیاسیی كوردو له مافه نهتهوهییهكانی دووری خستۆتهوه دهبێ وهك دیاردهیهكی نائاساییو سهیرو سهمهرهی ئهم سهردهمه سهیری بكهین.

**+ ڕووبهری جوگرافی كوردستان له (500) ههزار كیلۆمهتر دووجا زیاتره كه له ڕووبهری ههر یهك له ولاتهكانی ( بهریتانیا، هۆڵهندا، بهلجیكا، سویسرا، دانیمارك) زیاتره، بۆچی ئهم ڕووبهره فراوانه دهوری نهبینیوه له بونیادی كیانێكی سیاسییدا بۆ كورد؟**

حوسێنی مهدهنی: حهشیمهتو رووبهر دوو ماكی رهسهنن بۆ دامهزراندنی قهوارهی ههركیانێكی سیاسییو دهوڵهتێكی سهربهخۆ لهم جیهانهدا، چهندیو چۆنییهكهیان لهسهر هێزو دهسهڵاتی ولاتان راستهوخۆ شوێندانهرن، ئهو فاكته نهرێتییانهی له بارهی حهشیمهتهوه سوری نالهبار له كوردستاندا دهگێڕن بۆ دانیشتوانی كوردستانیش ههمان رێسا پێڕهو دهكهن، له حاڵهتێكدا كه نهتهوهی

کورد لێك دابڕاوەو هەر کوتەی لە ژێر پۆستاڵی داگیرکەراندا دەچەوسێنرێتەوە، ئەتۆپیایەك بە جەستەی یەکگرتووی نیشتمانی لە ئارادا نامێنێ، کەواتە ئەم کوردستانە بە خەیال یەکگرتوو ناکرێ و بە پێوانەی (500) هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەش فەرمییەتی سیاسییو دیپلۆماتیکی نێونەتەوەیی پێ نابەخشرێ، لە ئەمری واقیعدا سنوورێکی دەستکردو ناسروشتی خاکەکەی لێك دابڕ دابڕ کردووەو لە روانگەی ریئاڵ پۆلیتیکییەوە یاسای نێودەوڵەتیش فەرمییەتی سیاسیی و نێونەتەوەیی بەم سنوورە دەستکردانە بەخشیوەو دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە نێو دەوڵەتە میللیەکانی ناوچەکەدا بە پارچە پارچە کراوی پێناسە کراوە. هەر پارچەیەکیش لە ژێر کارتێکردی نیزامێکی نادیموکراتیکی دژی گەلی چەوساوەتەوە، میکانیزمی جۆشدارانەوەی ئاڵقە لێکترازاوەکان و وەرێخستنی فەرمانی تاك حکومی لەسەریان وێنای کیانێکی سیاسیی لە ناو ئەو گێژاوە سیاسییانەدا لێ دەربازبوونی نەك کردێکی ساناهی نییە ، بەڵکو زۆریش زەحمەتە، بێتوو سنووری وڵاتانی ناوچەکە گۆڕانی تێدا نەخولقێو بە شێوەیەکی لۆژیکیو لەسەر بنەمای ئیتنیکییەوە دانەڕێژرێتەوە بەو پێودانگە دەوڵەتە میللییەکان بنیات نەنرێنەوە، قەوارەی یەکپارچەیی کوردستان هەروا لە خەیاڵدا دەمێنێتەوە، بەر لەوەش کوردستان لە رووی حەشیمەتو رووبەرەوە بەیەکێك لە وڵاتە گەورەکانی جیهان دەژمێردرێت، بەلام لە بارەی کولتووریو ئابورییەوە جێی رامانو وردبوونەوەیە - باوبوونی دیالێکتەکانی زمانی کوردیو جووتسایدبوونی پیتی لاتینی - عەرەبی لە کوردستانی باکوورو کوردستانی باشوور لە خۆیدا رێگای بۆ جۆرە سیستمێکی دێستانترالیستی فۆرمێکی کۆنفیدرالی کردۆتەوە، دەبێ لە تێزی ستراتیژیەتی یەکگرتووی نەتەوەییدا ئەم تایبەتمەندییەی کە لە نێو پارچەکانی کوردستاندا هەیە وەبەرچاو بگرین، تەنانەت تا ئێستاش ئیدارەی هەرێمی کوردستان لەسەر ستانداردکردنی خوێندنی زمانی کوردی، جۆری بۆچوونەکان نالێکن، سیستمی پەروەردەیی هەرێمی کوردستان هەروا بە سەقەتی

ماوەتەوە لەسەر یەکگرتوویی زمانو ئەدەبی کوردیو بە فەرمی کردنی یەکێك لە دیالێکتەکانی سۆرانی یان بادینی کێشەی کولتووری هەیە، ئەمەش بۆتە کۆسپێکی ناوازە کە کورد وەکوو خۆی خستوویەتە سەر رێگای سەقامگیربوونی ماددە چواری دەستووری عێراق کە زمانی کوردیو عەرەبی کردۆتە هاوتای یەکتریو بە رەسمییەتی ناسیون.

**+ پێتوایە هۆکارەکان زیاتر پێوەندییان بە سەردەم و قۆناغە جیاوازە مێژووییەکانەوە هەیە کە دەرفەتەکان نارەخسێت هەر لە هۆکارە خودییەکانەوە تاوەکو بابەتییەکان یان ڕەوتی مێژوو بواری گۆڕانی بۆ نەڕەخساندووە؟**

حوسێنی مەدەنی: هۆکارە ئەکتیوەکان دوو بەشن: سروشتیو مرۆیی، هۆکارە سروشتییەکەکان نەگۆڕن، هەروا نەگۆڕیش دەمێننەوە، هۆکارە مرۆییەکانیش بە پێچەوانەوە بەردەوام لە حالەتی گۆڕاندان، قۆناخ بە قۆناخ ریز دەبەستنو دێنە مەیدان، بە دوای رووداونیشیان فۆڕمێك بەرهەم دێننو رێسایەك بە دووی خۆیاندا رادەکێشن، دەبنە پاژنێی خولدانەوە لە مێژوودا، رووداوەکان لە خولەکاندا وێستگەی وچاندانیان هەیە، لە وچانەکاندا دەرفەت دەرەخسێنن، دەرفەتەکان دوو رەهەندین، هێندێکیان خودئاسایین، بەشەکەی تریشیان لاوەکینو لە لاوەڕا خۆدەگرن، کەشو هەوا دەخولقێنن، لەو بوارە گرینگ ئەوەیە تاکی کورد لە پلەی کەسایەتی سیاسییداو کۆمەڵی هۆشمەندیش لە حەزی پەرەستێنییدا بتوانن دەرفەتەکان بقۆزنەوەو لە کیسی نەدەن، ئەگەر راستیمان گەرەکە، زۆرجار لە قۆناخەکانی مێژوودا دەرفەت بۆ کورد هەڵخراوە، بەڵام کوردەکان لە توانایاندا نەبووە لەو دەرفەتانە کەڵك وەرگرن نموونە زۆرن، دوای شەڕی چاڵدێران سوڵتان سەلیم دەستی میرە کوردەکانی ئاوەڵە هێشتەوە لە نێو خۆیاندا میری میران هەڵبژێرنو ئەمارەتێکی یەکگرتوو دابمەزرێنن، بەڵام نەخشی نەباوی مەلا ئیدریس بەتلیسی نەیهێشت ئەمارەتە کوردەکان یەك بگرنەوەو لە بەرامبەر دوو ئیمپراتووری عوسمانیو سەفەویدا ببنە جەمسەرێکی یەکگرتووی سەربەخۆ!!

پاش جەنگی یەکەمی جیهانی جامیعەی میلەل بە بەستنی قەراردادی سێور، بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی دا، ئەو کاتیش دەمارگریی ئایینی شێخ عەبدولقادری نەهری لاگیری لە سیاسەتەکانی کەماڵ ئەتاتورك کرد، کە لە هیچ بارێکەوە لەگەل بەرژەوەندیی نەتەوەیی کورد نەدەهاتەوەو هەلە زێڕینەکەی لە کیس کورددا و پەیماننامەی سێوری زیندەبەچاڵ کرد، بەو پێودانگە دروست نییە لە روانگەی عاتفییەوە بیر لە رەوتی مێژووی خەباتی رزگاریخوازانەی کورد بکەینەوە. رەوتی مێژوو پرۆسەیەکی بێگیان و نەزۆك و خۆڕسك نییە لە خۆوە هەڵقوڵابێ و بەسەر چارەنووسی کورددا داسەپابێ، هەر هێزو دەسەڵاتدارێکی توانیبێتی لە راستای دابینکردنی بەرژەوەندییەکانیان چالاکترو دەقیقتر خۆیان نیشان بدەن و هەلومەرجەکە بخوێننەوە بەرگی براوەشیان لە ئامێز گرتووە، ئەوانەی ئامانجەکانیان نەپێکابێ بە دۆڕاوی مێژوو دادەنرێن و بەرپرسایەتییەکەیان دەکەوێتە ئەستۆی سیاسەتە غەڵەتەکانیان، کەوابوو رەوتی مێژوو لە ئاستی تێشکانیان هیچ تاوانێکی لە ئەستۆ نییە، ئەوە سەرکردەکانن دەبێ باجی بۆچوونی غەڵەت و هەڵوێستە سیاسییەکانیان بدەنەوە.

**+ کە ئێمە نەمانتوانیوە سوود لە دەرفەتەکان وەرگرین، کەواتە کێشەی نەتەوایەتییمان بۆ مێژوویەکی کۆنتر دەگەڕێتەوە ؟**

حوسێنی مەدەنی: هەروەك كە باسكرا پرسی نەتەوەیی لە کوردستان بە گشتیی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و دامەزرانی دەوڵەتە میللیەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هاتە ئاراوە، پێشتر چەوسانەوەی نەتەوەیی بە میعیارەکانی سەردەم لە نێو وڵاتانی ناوچەکە لە گۆڕێدا نەبووە، کێشەی نەتەوەییش کە پاساودانەوەی چەوسانەوەی نەتەوایەتی بێ لە گۆڕێدا نەبووە، لە ناوکی دەوڵەتە میلییەکاندا چەوساندنەوەی نەتەوەیی وەك ئامانج و هزرێکی فرەخوازی کە نەتەوەیەك بکاتە سەروەرو باڵادەستی نەتەوەکانی تر، هاتە ناو شەقامی حاکمییەت و فەرهەنگی

سیاسیی حکومەتەکان لە ناوچەکەدا، کاتێك سیستمی ئیداریی و پەروەردەیی نەتەوە باڵادەستەکان سەقامگرتوو دەبێ. کێشەی نەتەوەیەیش قوڵترو زەقتر خۆی دەردەخاو لە پێناو داکۆکی لە پێناسەی نەتەوەییدا بە تەوژمترو رادیکاڵتر هاتۆتە ناو کۆڕی خەباتی رزگاریخوازیی نەتەوەیی.

لەسەریەك لە ئاوێنەی مێژوودا ئەگەر سەیری کوردو کوردستان بکەین بە گشتیی تووشی دوو جۆر کێشە بوون، یەکیان ئەوەیە، هەر لەشکرێکی بێگانە پەلاماری خاکی کوردستانی دابێت، کوردەکان زۆر بەتووندیی بەگژیاندا چوونەتەوە. بە واتەیەك هیچ بێگانەیەك لە خاکەکەیدا نەحەساوەتەوەو سەرنجام چۆڵی کردووە یان پاشەکشەی پێکراوە، هێندێك جاریش دەسەڵاتداران بە ئەرکی ئایینی بەرەنگارییان بوونەوەو بێدەسەڵاتیی کردوون، لە قۆناخی گەشەسەندنی سەرمایەداریی جیهانیو سەرهەڵدانی کۆلۆنیالیزمو سانترالیزەکردنی دەوڵەت لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوین ئەمارەتە کوردییەکان سەریان تێداچوو، بەڵام شۆڕشی رزگاریخوازی نەتەوەییش لە کوردستاندا سەریهەڵدا، دەتوانین خاڵی سەرنجڕاکێش لەو بزاڤەدا شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە ساڵی 1880ز ناوبێنین کە بۆ یەکەم جار بۆ دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ شۆڕشی کرد.

**+ ئەوەش هەیە لە پاش دەرکەوتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە کوردستان، کورد توانی چەندین ئەمارەتی سەربەخۆو نیمچە سەربەخۆ پێك بهێنێ، بەڵام پیلانی دوژمنان و دووبەرەکی و شەڕە ئیمارات وایانکرد یەك لە دوای یەك ئەو ئیمارەتانە لە ناو بچن؟**

حوسێنی مەدەنی: دوای هەرەسهێنانی خیلافەتی ئومەوییەکان، عەباسییەکان شاری بەغدایان کردە ناوەندی جیهانی ئیسلام، وڵاتی کوردستانیش بوو بە شاڕێی ئەو کۆمەڵە خەڵکە موسڵمانەی کە لە چوارقوڕنەی ئەم جیهانەدا دەچوونە زیارەتی مەککەو مەدینە، شاڕێگاکانی بوونە هۆکاری ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و گەشەسەندنی شارو شارستانییەتو بەهێزکردنی هەستی وڵاتپارێزی لە

کوردستانو پێشوەچوونی زانست و هونەر، هاتنە سەرکاری حکوومەتی شەددادەکان، حەسنەویە، مەڕوانییەکان لە نێوان سێ دەسەڵاتداری بەهێزی وەکو ئیمپراتۆریەتی ڕۆمی شەرقی، خولەفای عەبباسی، حکومەتی ئالبوویە(بوەیهییەکان) کە حوکمڕانانی بەهێزی ناوچەکە بوون، دامودەزگای بەهێزی حکومڕانیان دامەزراندبوو، بەڵام هێرشی تورکە سەلجوقییەکان بۆ ئاسیای ڕۆژئاوا (سەدەی پێنجی کۆچی) وەزعی دیموگرافیاو شارستانییەتی ناوچەکەی بە تەواوی تێکدا، کوردستان لەو نێوەدا زیانێکی گەورەی بەرکەوت، نەیتوانی پشتی خۆی راست بکاتەوەو خۆ بگرێتەوە، کاتێك ئالی عوسمانیش لە ئاسیای بچووك بوونە ئیمپراتۆریەتی بەهێزی عوسمانی، کوردستان چەند قاتی تریش نوشوستی هێنا، ئەمارەتە کوردییەکانیش مەخابن هەتا بڵێی ناتەباو لەگەڵ یەکتریی نەگونجاو بوون، لە رکەبەریی ئایینی نێوان شیعەی سەفەویو عوسمانییە سوننەکاندا نەیانتوانی کەڵك وەرگرنو تێدا چوون، میرە کوردەکان بە حوکمی ئەوەی سوننی بوون، دەبوا پشتی عوسمانییەکانیان گرتبان لە حاڵێکدا بێ ئەوە ئامانجێکی روونی سیاسییان هەبێ، لە نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆرەدا ئەمبەرو ئەوبەریان دەکرد بێجگە لە رەنج بەخەساربوونیان هیچ دەستکەوتێکیان تۆمار نەکرد.

**+ مێژووی دوورو درێژی کوردیش وابووە سەرکردەو دەسەڵاتدارەکانی میرنشینو شۆڕش و ڕاپەڕینەکان کەسایەتی ئایینی بوون، ئایا بۆچی ئەمانە نەیانتوانییوە تەنانەت لە ژێر کاریگەری ئایینیشدا بێت بیر لە پرۆژەیەکی لەو شێوەیە بکەنەوە کە میللەتەکەیان لە قەیرانی نەبوونی قەوارەیەك ڕزگار بکەن؟**

حوسێنی مەدەنی: میرە کوردەکان خۆیان گیرۆدەی سۆزی ئایینی نەدەکرد، زۆرتری سەرقاڵی حکومڕانی میرنشینەکەی خۆیان بوون، نزیکەی (٥٠) میرنشین لە کوردستاندا بوون هیچ کامیان پێوەندییەکی سیاسیی، ستراتیژێکیان بۆ پارێزگاری لێکتر لە نێوخۆیان دانەمەزراندبوو، جیهانبینیەکەیان لە سنووری

جوگرافیای میرایەتییەکەیان تێنەدەپەڕی، ئەو بیرتەسکیە قەت نەیدەتوانی ئامانجێکی بەرزی نەتەوەیی کە هەموو کوردستان دابگرێ وەبەر خۆی بدات. پرسی ئایینی بۆ میرە کوردەکان کە بتوانێ یەکگرتوویی نەتەوەیی دەستەبەر بکات، هیچ رۆڵێکی نەدەبینی.

هەرچەند لەوەش نکولی ناکرێ تا ئەم سەردەمەش نەخشی رێبەرانی دینی لە بزاڤی رزگاریخوازیی کورددا زۆر زەق و بەرچاو بووە، ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر خوێندنی ئەو زانستانەی کە لە حوجرەکان فێریان دەبوون و دەوریان بۆ دەکردەوەو پێی رادەهاتن و شعووری نەتەوەپەرستی و ولاتپارێزییان تێدا دەگۆرا، بەلام ئەوانیش لە ژێر فەرمانی ئەو ترادسیۆنە کۆمەلایەتییەی بەسەر کوردستاندا زالبوو، نەیدەتوانی سنووری فەرمانڕەواکەی بەرفراوانتر بکات، لەم بەشەدا حەزدەکەم ئاماژەیەکی کورت بە دیاردەی شێخایەتی و نفوزی رووحی شێخ لەناو کۆمەلی کوردەواریدا بکەم:

شێخەکان لە نێو خەلکدا مەعنەوییەتێکی بەرزیان هەبوو، بێجگە لە توێژی ئاغاوەت بەفەقیرو دەولەمەندەوە رێزیان دەگرتن، شێخەکان ببوونە پەناگای لێقەوماوان، بێجگە لەمەش شێخەکان لە بەرامبەر تەشەنەکردنی ئایینی مەسیحییەت لە کوردستاندا ببوونە لەمپەر لە ئاستی مسیۆنێرەکاندا بەرهەلستکارێکی بەهێزبوون، هەر لەبەر ئەوەشبوو دەولەتە ئۆروپاییە مەسیحییەکان زۆر بە توندی موخالیفی نەخشی شێخەکان لە کوردستان بوون و بەردەوام لە دژیان دەخوێندن.

حکومەتەکانیان لە شێخەکان هاندەدا، هەرکاتێکیش شێخەکان شۆڕشی ڕزگاریخوازیی نەتەوەییان وەڕێخستبا بەرەنگارییان دەبوونەوە، وەکو شۆڕشی شێخ عوبەیدوللای نەهری، شۆڕشی شێخ رەزای دەرسیمی، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، حکومەتی شێخ مەحموودی حەفید، شێخانی بارزان، سەرباری ئەمانەش پێویستە بلێم، پرسی نەتەوایەتی و راپەڕین و شۆڕشی رزگاریخوازی

نەتەوەیی پرۆسەیەکی مۆدێرنە کە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی پێی هەڵگرتووەو خۆی ناسیوە، کوردستان لە چاو گەلانی زوڵملێکراوی ناوچەکە، لە بواری رەهەندی زەمانیو شوێنگەوە خۆڕاگرو بەوزەو پێشەنگی کاروانی خەباتی نەتەوەیی بووە، بەو حاڵەتە پۆزەتیوەش لەناو رێگاکەدا چەقبەستوو ماوەتەوە.

**+ سێ هۆکاری گرنگ بنەمای دواکەوتن و ماڵوێرانی بوون بۆ کورد هەندێکیان لە مێژەو هەندێکیان نوێیە کە بریتیین لە هۆکارە نێو خۆییەکان (شەڕی نێو خۆو خۆ خۆری)، هەروەها هۆکارە ئیقلیمییەکان (نەگونجانی وڵاتانی دراوسێ)، هۆکارە دەرەکییەکان یاخود نێو دەوڵتییەکان کەئەمەیان نوێترە، هەروەکو م.س لازاریف دەڵێ: مەسەلەی کورد وەکو کێشەیەکی نێو دەوڵەتی لە سەرەتای چەرخی نۆزدەوە سەریهەڵداو لە سەدەی بیستەمیش دوای شەڕی یەکەمی جیهانی لە سەر ئاستی نێو دەوڵەتی بایەخی زیاتربوو، پێتوایە تاوەکو ئەمڕۆ ئەو سێ هۆکارە رۆڵ دەبینن لە دواکەوتن و وەستانی قەزیەی سیاسیی کورددا یاخود بەهۆی گۆڕان و پێشکەوتنە خێراکانی دنیاوە گۆڕانیش بە سەر ئەمانەدا دێت؟**

حوسێنی مەدەنی: ئەو سێ هۆکارە گرینگەی ئێوە ناوی دەبەن، هەتا ئێستاش بە هێندێك تێبینییەوە هەر لە سەر جێی خۆیان ماونەتەوە، رۆڵی نالەباریش دەگێڕن ناتەبابوونی کوردو کێشەو شەڕی ناوخۆیی نەریتێکی نەرێنی نێوخۆیین، زادەی دەسەڵاتە خۆجێییەکانی میرەکانن لە کوردستاندا کە لە پاوانی بنەماڵە - هۆزدا قەتیسیان کردبوو - ئەهلی وێکهەڵکردنو یەکگرتوویی‌و سەرەنجام بەرفراوانترکردنی دەسەڵاتە خۆجێییەکانی کوردی نەبوون، هەروا لەناو بازنەی بەرتەسکی دەسەڵاتدارەتییاندا خۆیان حەشار دەداو گیانی لێبوردەییان لەگەڵ یەکتر زۆر لاوازبووە، ئەو کولتوورە ئێستاش هەر لەناو رێبەرانی کلاسیکی کوردیدا کاردانەوەی هەیە بەرژەوەندیی تاکو رێکخراوەیی لەبان بەرژەوەندیی نەتەوەییدا خۆیان فەرز دەکەن، زۆرجار سنووری بەرژەوەندیی نەتەوەیی ئاڵۆز دەکەن، حزبایەتی لە ئامرازەوە دەبێتە ئامانج، لە جێگۆڕکێی ئەو ساختارەدا بەرژەوەندیی

ڕێکخراوەیی ئەوەندە پیرۆز رادەگیرێت، کە بەتەواوی جێ بە بەرژەوەندییی نەتەوەیی لێژ دەکات، ئەو دیالێکتیکەش جەوهەری بەرژەوەندییە نەتەوەییەکەمان لێ بزر دەکات، لە حالێکدا بۆ ئێمەی کورد بەتایبەتی بەرژەوەندیی نەتەوەیی دەبێ ببێتە ئەستوونگێك لەژێر سێبەری رەشەماڵەکەیدا خۆمان بدۆزینەوە، با خاوەن ئیدەو بۆچوونی ڕێکخراوەیەکیش بین نابێ دەمارگرژیی ڕێکخراوەیی لێمان ببێتە ملە، کێڵگەی بەرژەوەندیی نیشتمانیمان لەسەر خاکی کوردستان بنکۆڵ بکات، پێویستە لە ئەرکی ڕێکخراوەییدا هونەری سیاسەت لە راستای دەستەبەرکردن و داکۆکی لە بەرژەوەندیی نەتەوەییمان مسۆگەر بکردرێت، مەخابن ئەو شێوازە هونەرە سیاسییە لە نێو ئەحزابی کوردیدا دەگمەن و لاوازە، بێجگە لە نێگەتیڤبوونی هۆکارە نێوخۆییەکان، هۆکارە دەرەکییەکانیش تا ئێستا لە بەلاڕێدا بردنی بەرژەوەندیی نەتەوەیی کورددا پراکتیزە کراون، رەوتەکە لە سەدەی (19)ڕا بە دەخالەتی دەوڵەتە ئۆروپییەکان دەستی پێکرد بەتایبەتی ئاڵمانییەکان بە هانای سوڵتان مەحموودی عوسمانییەوە هاتن و بە گەلەکۆمەگیی رووسیای قەیسەری و قاجارەکان هێرشیان بردە سەر میرنشینی رەواندزو تێکیان شکاندو رووخاندیان، بە گشتیی دەخالەتی کولونیالیە ئۆروپییەکان و هاوکاریی وڵاتە دراوسێکان و راوێژکاری مەلا ئیدریسی بەدلیسی و فتوای مەلای خەتێ وەك هۆکاری نێوخۆیی دەستیانداوەتە دەستی یەکتری، میرنشینە کوردەکانیان تووشی هەرەسهێنان و فەوتانی هەمیشەیی کرد، بە تایبەتی سیاسەتی کولونیالیستی ئینگلیس دوای بڕانەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی بەرامبەر بە کوردستان لە هەمووان بەژانترە، شێخ مەحمودی حەفید لە 1923زدا لە شاری سلێمانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دامەزراندبوو، بەڵام چونکە شێخ مەحموود نەبۆتە داردەستی ئینگلیسەکان، حکومەتەکەیان لێ تێکدا، هاوچەرخ لە کوردستانی ئێرانیش ئەو سناریۆیەیان لە دژی شۆڕشی سمکۆ دووپات کردۆتەوە، بە یارمەتیدانی ماڵی و نیزامی پشتی رەزا خانیان گرت و ڕێگای تێکشکاندنی

شۆڕشی سمکۆیان خۆش کرد، لەسەروبەندی کۆتایی هاتنی شەڕی دووەمی جیهانیش بە ڕێبەری پێشەوا قازی موحەممەد کۆماری کوردستان دامەزرا، ئەو کۆمارەش هەر بە فیکی دەوڵەتە ئیقلیمییەکانو زلهێزی جیهانی ئەوکات لەناو بردرا، لەو کۆبەندەشدا وڵاتە دراوسێکانو دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان تا ئێستاش لە شوێن دانەمەزرانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی کۆدەنگو موخالفی بوون، هەنووکە پرسەکە بەنیسبەت عێراقو هەرێمی کوردستان وەرچەرخانێکی بەسەردا هاتووە کە جێی رامانی زیاترە.

سەرهەڵدانی دوو دیاردەی ئیسلامی سیاسییو تیرۆر لە ڕۆژهەڵاتی ناوینو ڕووداوی (١١)ی سێبتامبر لە نیۆیۆرك، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەغیار کردەوە بە دیپلۆماسییەتو سیاسەتی ستراتیجێکی ناوچەکەدا چوونەوە، عێراقی دوای سەددام حوسێنو هاتنە ئارای هەرێمی کوردستانو ئەزموونی سەرکەوتووانەی ئەم هەرێمە لەسەر دابینکردنی ئاسایشو ئاوەدانکردنەوەی ئەم هەرێمە کێشی کوردیی کردۆتە فاکتێکی گرنگ لەسەر بونیاتنانەوەی عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵی دیپلۆماسییەتی ڕێبەرایەتیی کورد لە هێڵی کلاسیکی ترازاوەو خەریکە بەرەو جیهانبینییەکی نوێ لە گۆڕەپانی سیاسەتدا خۆی دەبینێتەوە.

ئێستا پارامێترێکە بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشو سەرخستنی سیاسەتەکانی (پرێزیدنت بۆش) لە ناوچەکەدا، کەواتە رەوتی موناسەباتە دیپلۆماسییەکان خوێندنەوەیەکی ئەمڕۆیی گەرەکە، پێویستە لەوە ئاگابین بە پێچەوانەی ساڵانی پێشوو ئاڵۆگۆڕەکان خێراتر هاتوونەتە گۆڕیو لەداهاتووشدا شاهیدی ئەو جۆرە گۆڕانکارییانە دەبین، بۆ وێنە خەڵکی کوردستان چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لە ئاستی پلەی ژیانی سیاسییدا دەستکەوتی زۆر لەوە بەبایەختر تۆمار بکەن، ئیتر بە وەبەرچاوگرتنی هەموو تێبینییەکان پێویستە بەرپرسانو سیاسەتوانانی کورد لە هەرێمی کوردستان پێوەندییە دیپلۆماسییەکانیان لەسەر بنەمای ساتو

سەوداكانی رابردوو تەنیا راگرتنی سەری خۆیان تۆمار نەكەن، هەقوایە بەرژەوەندیی نەتەوەیی بخەنە بان هەموو بەرژەوەندییەكانی تاكەكەسیو رێكخراوەیی، ئەمەش بزانن تەنیاو بە پلەی یەكەم دەبێ پشت بە نەتەوەی كورد ببەستنو لە هزری نەتەوەییاندا كۆمەڵگای كورد لێك هەڵناوێرنو فەرقو جیاوازییان لەنێو دانەنێن.

**+ پێتوایە كولتوری داگیركەران كاریگەری نێگەتیڤی لە سەر كولتورو فەرهەنگی كوردی بەجێ هێشتبێ ؟**

حوسێنی مەدەنی: لەوە حاشا ناكرێ بە تایبەتی لە درێژایی یەك سەدەدا، كولتورو نیزامی داگیركەریو زەبری نەتەوەی حاكمو سەروەریی نەتەوەیی بەسەر دەروونو گیانو هزری كورددا خۆی سەپاندووە، بەم كارتێكردنەش خەسارێكی فرەی بەشێرازەی یەكگرتووی نەتەوەیی كورد گەیاندووە، كورد لە خۆی نامۆ كراوە، زمانو نووسینیان لێ شێواندووە، بڕوا بەخۆبوونیان لێ بزر كردووە، زۆریان بە گوێیدا خوێندووە، كە كورد قەت نابێ بەهیچ!! كوردستانی بوونی كوردو كوردی بوونی كوردستان داركاریی كراوە، كوردەكان لە باتی ئەوە بە كوردستانی بوونیان پێناسە بكرێن، بە من ئێرانی، تۆ عێراقی، ئەو سورییایی ناو دێركراوین، ئەمەش نەخۆشییەكی بەژانو كوشندەیە، كە هەموو ئەندامەكانی لەشی كوردی گرتۆتەوە، عیلاج و دەرمان و ویرۆسی ئەم ئارێشەیە تەنیا بە خودی كورد دەكرێت، ئەگەر من و تۆو ئەو لەنێو خۆماندا یەكدەنگ بین و بە خشڵی نەتەوەیی خۆمان ئاراستە بكەینو لە بوارەكانی هونەری، مێژوویی و ئەدەبییەوە بەخۆماندا بچینەوە، وێدەچێ لە دەیەكانی داهاتوودا نەوەكانمان رەنگی تەواو كوردستانی بوونی هەڵێنن، لە خۆمانەوە دەست پێ بكەینو بۆ خۆمانی بكەینو لە ناو كوردستاندا گشتگیری بكەین.

**+ مەسەیەك هەیە دەڵێ: هەركەس كۆنترۆڵی هەموو كوردستان بكات باڵادەستی**

**لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆخۆی دابین دەكات، ئەوەش بووەتە زیان بۆ كورد، ئەی كورد بۆخۆی ئەو سوودەی لێ نەبینی؟**

حوسێنی مەدەنی: دەڵێن هەركەس كۆنترۆڵی هەموو كوردستان بكات باڵادەستی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بۆ خۆی دەستبەر دەكات، ئەم مەعریفەیە هەڵگری خاڵێكی زۆر بەهێزە، سەنگو قورسایی كوردستان لە حەستەمترین شوێنی ئەم جیهانە بە ترازووی زلهێزە جیهانییەكان هەڵدەسەنگێنێ.

ئەگەر ئەم دەستەواژەیە بە فاكتی ئێستانداردی جیۆپولیتیكیو ستراتیجێكی ببێتە پاڵنەر لەو حاڵەتەدا دەستی رێبەرانی كورد ئاواڵە دێڵێتەوە، دەتوانن بە ژیرییو وریایی مانۆڕی سیاسیێ بدەنو سەرنجی زلهێزەكانی پێ راكێشنو ئیمتیازی پێ وەرگرنو لە ئاستی بەرژەوەندیی نەتەوەییدا كەڵكی لێ وەرگرن، كوردستان لە ئاوو پێترۆڵدا دەوڵەمەندو سەرنجڕاكێشە، لە ستراتیجیەتی وشكانی لە ناوچەكەدا بێ رەقیبە تەجروبەی شەڕی ئەفغانستانو عێراق بە ئەمریكاو ئوروپای سەلماند تێكنۆلۆجیای نیزامی هەموو شتێك نییە، لە تیۆریی زاڵ بەسەر وشكانیدا هۆكاری دیكەش هەن دەبنە شوێنەواری سەرەكیو ئاكامی شەڕەكە بە لای خۆیاندا دەشكێننەوە بۆ وێنە تێكنۆلۆژیای پێشكەوتووی ئامریكا توانی لە چەند رۆژێكدا دوو حكومەتی تالیبانو سەددام حوسێن لە ئەفغانستانو عێراق بڕوخێنیو هەردوو وڵاتەكە داگیر بكات، بەڵام كێشەكانی پاش داگیركردن نەیهێشتووە ئاسایش بگەڕێتەوە ناو ئەو دوو وڵاتە. ئەوە راستە هێزی ئاسمانیو دەریایی ئەمریكا لە جیهاندا بێ رەقیبە، بەڵام كە دێتە سەر وشكانی تووشی تەنگو چەڵەمەیەكی بێ ئەژمار دەبێ، بە وەرگرتنی ئەم تێزەی باسم كرد دەتوانین لەسەر دینامیزمی كوردستان خوێندنەوەیەكی ئاكادیمیانەو هاوچەرخمان هەبێ، بواری ستراتیجێكیو جیۆپۆلۆتیكی كوردستان لە رۆژهەڵاتی ناویندا قورسایی خۆی هەیە، زلهێزێكی وەك ئامریكاش نیازی بەو شوێنە گرینگانە هەیە، كە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەكانی ئامریكا بكات، بە كورتی ئەمریكا پێویستی بە

کوردستانە، کوردیش پێویستی بە پشتیوانی سیاسیی ئەمریکا لەناوچەکەدا هەیە، ئەو پێوەندییە دوولایەنی بە فۆرمۆلی سیاسیی خۆی هەیە بە "دان" و "ستان"ەوە سەردەگرێ لەو "دان"و "ستان"ەشدا جۆرە هاوکێشەیەك بۆ راگرتنی لەنگەری بەرژەوەندییە سیاسییو ئابوورییەکان پێویستە لە نێوان هاوپەیمانێتی دابمەزرێ، ئەم فورمۆلە لە بەشێکی خاکی کوردستان کە هەرێمی کوردستانە بۆتە ئەمرێکی واقیع کە ئێستا هەمووومان بە چاوی خۆمان دەیبینین، لە پاڵ ئەم باسەدا پێویستە سەرکردایەتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بە شرۆڤە کردنی زانستو ئەزموونی سیاسیی بارودۆخی ناوچەکە هەڵسەنگێنێ، ئەوەش بزانێ مانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ناوچەکە درێژخایەنە کوردستانیش لەناو بازنەی سیاسەتی ستراتیجێکی ئەمریکا لە حاڵی خولدانەوەیەو لەناو هێلکەدا دەمێنێتەوە بەو پێودانگە نابێ رێبەرانی کورد لە ئاست ئەمریکادا لاوازی بنوێنن و دەست بە گوچان برۆن و پێیان وابێ ئەمریکای خێرەومەند لە بواری مرۆییەوە دەیانپارێزێت، لەو شێوە خوێندنەوەیەدا بە نەتیجەیەك دەگەین، یەکەمیان: لەوەدا کە رێبەرانی هەرێمی کوردستان ئەمریکایان لەم قۆناغەدا بە دۆستی خۆیان هەڵبژاردووە نەك هەڵەیان نەکردووە هەڵوێستێکی دروستیشیان لە پێناو پێکاندنی ئامانجی نەتەوەییدا رەچاو کردووە، ئەو دەستکەوتانەی تا ئێستاش وەچنگ هەرێمی کوردستان کەوتوون لەو رێبازەوە بەرهەمدار بووە، مەرجیش ئەوەیە کورد لە هەرێمی کوردستاندا نەخۆی بەکەم بگرێ و نە بێ منەت لەخۆدەرچوونیشی پێوە دیاربێ، هێمنانەو ژیرانە لەگەڵ رووداوەکان هەڵسووکەوت بکات و مەنتیق نەدۆڕێنێ و سۆزەکانیش ئاوێتەی کاری سیاسیی و دیپلۆماسییەت نەکات.

دووهەم: بە سوودی هەرێمی کوردستان نییە لە ئاستی دراوسێکاندا رەوشتی پەسیووبوون لە سیاسەتدا رەچاو بکات و ئیمتیاز بە لایەنەکانی تر بدات، ئەوەش راستە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیختیاری هەڵبژاردنی وڵاتە دراوسێکانی نییە

تەنیا دەبێ بە سیاسەتی حەکیمانە لەگەڵ دراوسێکانی هەستان و دانیشتن بکاتو سنوورەکان ئەمن و ئارام رابگرێ و بیانوو نەداتە دەستیان، ئەو بەرپرسارەتییەش هەر لە لای حکومەتی هەرێمی کوردستان دروست نابێ، هەموو لایەنە دراوسێکان لە مبارەوە بە قەد یەکتری ئەو بەرپرسیاریەتییەیان دەکەوێتە ئەستۆ، بۆوەی هەرێمی کوردستان خۆی لە قەیدی بەسترانەوەی ئابووری بە ولاتانی دراوسێ بێنێتەدەر، پلانرێژیی بۆ گەشەپێدانی ژێرخانی ئابووریی نیشتمانیی ئەرکی هەنووکەیی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، هەتا پلانەکە بەرەو پێشتر بڕوات لە رادەی بەسترانەوەی بازاڕی کوردستان بە ولاتە دراوسێکان کەمتر دەکاتەوە، ئەم پرۆژەیەی سەرکردایەتی هەرێمی کوردستان بۆ پتەوکردنی سیاسەتی سەربەخۆیی نەتەوەیی یارمەتیدەرێکی پۆزەتیڤە کە ئیرادەی نەتەوەییمان بەهێزتر دەکات، بێ لەمانەش ئەوەندەی هەرێمی کوردستان پێویستی بە دەرگای ئاوەڵەی سنوورەکانەوە هەیە، ئەوەندەش زیاتر ولاتە دراوسێکان موحتاجی کرانەوەی سنوور بۆ ئاڵوویری بازرگانی و سەرمایەگوزاریی و ناردنی هێزی کار بۆ ناو خاکی هەرێمی کوردستانن، حکومەتی هەرێمی کوردستان پارێزەری ئاسایشی سنوورەکانێتی لەچاو رژێمەکانی پێشووی عێراق، قەت سنوورەکان ئەوەندی ئێستا ئاسایشی بەخۆیەوە نەبینیوە ئێرانو تورکیاش زیاتر نێگەرانیی خۆیان لە بوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان نەشاردۆتەوە، بە بیانووی دزەکردنی گەریلاکانی پەکەکە بۆ نێو خاکی ولاتەکانیان بەردەوام سنووری هەرێم دەبەزێنن و بە بوردومانکردنی ناوچە سنوورییەکان ئاسایشی دانیشتوانی سنوورەکانیان تێکداوەو ئالۆزییان خستۆتە ناو هەرێمی کوردستان و سنووربەزێنی تورکیا و ئێران بۆ ناوچە سنوورییەکانی خاکی هەرێم، بەرهەڵستێکی ئاشکرای ئەو دوو دەوڵەتە لە دژی حزووری نیزامی ئەمریکا لە ناوچەکەدا نیشان دەدات.

تێبینی: لەسەریەك بارودۆخی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوین و سیاسەتی زلهێزە

جیهانییه‌كان له چاو ده‌یه‌كانی رابردوو بۆ كورد زۆر له‌بارتر هاتۆته ئارا، گرینگ سیاسه‌توانانی كوردستانن چۆن ئه‌م دره‌فه‌ته زێرینه ده‌قۆزنه‌وه، به‌ر له هه‌ر كارێك ده‌بێ گیانی كوردایه‌تی ده‌مه‌زه‌رد بكه‌ینه‌وه، تیژترو وریاتر كوردستان بهزرێنین، له‌ناو سنووری به‌رته‌سكی هه‌رێمایه‌تیدا ئۆمانیزمی كورد قه‌تیس نه‌هێڵینه‌وه، ئه‌مرۆ تاكی كورد ده‌بێ به چه‌كی كوردایه‌تی‌و عه‌قڵی سه‌رده‌م ته‌یار بكرێت‌و به‌ره‌و لوتكه‌ی ستراتیجییه‌تێكی یه‌كگرتووی نه‌ته‌وه‌یی شه‌قاو به‌رز بكاته‌وه.

**+ هه‌ستده‌كه‌یت شكستیه‌ك له ده‌روونی كورددا هه‌بێت، هه‌میشه خۆی به‌كه‌م وه‌زڵووم و بێهێزوو دۆڕاو زانیوه‌و داوای مافی خۆكردنی كه‌مبووه‌و به‌رگری زۆر بووه؟**

حوسێنی مه‌ده‌نی: ده‌بێ پێ له‌و راستییه بنێین، باری ده‌روونی كورد به هۆی جه‌ربه‌زه‌ی رۆژگاری ناسازگاره، شاده‌ماره‌كانی له‌شی تێك به‌زیون، پشووی سواره‌و تووشی دڵه‌راوكێ بووه، پێی ده‌وێ خۆی له‌و گێرۆده نه‌فس نزمییه ره‌ها بكات، كه‌سایه‌تییه‌كه‌ی تا بڵێی داركاری كراوه‌و مه‌ینه‌ت‌و ئازاری چێشتووه، زه‌مانی ده‌وێ ببووژێته‌وه‌و خۆی دابرێژێته‌وه له‌سه‌ر جه‌سته‌ی ره‌سه‌نایه‌تی خۆی، له خۆڕا نییه كورده‌كان له ئاستی نه‌ته‌وه بالا ده‌سته‌كانی فارس‌و تورك‌و عه‌ره‌بان خۆی به‌كه‌م ده‌گرێ‌و سه‌روه‌ریی ئه‌و نه‌ته‌وانه به‌سه‌رخۆیدا به‌شتێكی فه‌رزكراوی هه‌میشه‌یی ده‌بینێ، له كارو كرده‌وه‌ی رۆژانه‌شدا مۆركی نزمبوونه‌كه‌ی پێوه دیاره، به‌تایبه‌تی تاكی كورد زه‌بوونی‌و ژێرده‌سته‌یی له روخساریی ناشاردرێته‌وه، به راستی له ئاستی لایه‌نی به‌رابه‌ردا گێل‌و مه‌نگه له به‌رامبه‌ر ئه‌و دوشداماویه‌و ده‌روونرووخاوییه‌دا ته‌نیا توانیومانه له ماندوو بوونی خۆمان داكۆكی بكه‌ین، به‌ڵام له داكۆكی كردن له مافه ڕه‌واكانی نه‌ته‌وه‌ییمان دوور كه‌وتووینه‌ته‌وه، ئه‌مه‌ش تراژیدییایه‌كی ترسناكه له ئاستی مافی دیاریكردنی چاره‌نووسی سیاسیی بۆ نه‌ته‌وه‌ی كورد. له‌و حاڵه‌ته‌دا ده‌رده‌كه‌وێ ماكه‌ی خه‌للاقییه‌ت‌و داهێنه‌رمان جاری

هه‌روا به‌ كاڵ و كرچی ماوه‌ته‌وه‌و خۆی نه‌گرتووه‌و پێی هه‌ڵنه‌گرتووه‌، زۆرجار به‌ ئانقه‌ست "ته‌جزیه‌ ته‌له‌بی"یان لێ كردووینه‌ته‌ مۆته‌كه‌. بۆ وه‌ مۆركی ته‌جزیه‌ته‌له‌بیمان پێوه‌ نه‌نووسێ، ئێرانچێتی، توركچێتی، عێراقچێتی، ئه‌وه‌نده‌ پێ تۆخكردوین، شه‌رم دامان ده‌گرێ و له‌ داخوازییه‌ ره‌واكانی نه‌ته‌وه‌ییمان به‌ سوودی نه‌یاران پاشه‌كشه‌ ده‌كه‌ین، ئه‌وه‌نده‌شمان بۆ داشكاندوون كه‌ زۆرجار ده‌بێ خۆمان له‌ جسناتی ره‌گه‌زیی داگیركه‌راندا به‌ عه‌سڵ و نه‌سه‌بتر داده‌بنێین، به‌و حاڵ و باڵه‌ش له‌و تۆبه‌كارییه‌شمان نابوورن و حازر نابن ده‌سته‌ونه‌زه‌ر له‌ خزمه‌تیاندا راوه‌ستین و وه‌كو خۆیان بمانخه‌ملێنن، هه‌ر به‌چاوی ئاغاو نۆكه‌ری سه‌یرمان ده‌كه‌ن، دڵیان به‌رایی نادا وه‌ك نه‌ته‌وه‌یه‌ك بمانخوێننه‌وه‌و ده‌رگای برایه‌تی و دۆستایه‌تییان له‌سه‌ر گاڵه‌داوین، له‌وه‌ش نزمتر ئاماده‌نین له‌ ریزی كه‌مایه‌تیدا مافه‌كانمان دابین بكه‌ن.

**+ بۆ چی سه‌ركرده‌یه‌كی نه‌ته‌وه‌یی هه‌مه‌لایه‌ن و بیرمه‌ندێكی گه‌وره‌ی كورد دروست نه‌بووه‌ كه‌ ده‌سه‌ڵاتی ناوچه‌یی تێپه‌ڕێنێ و هه‌موو لایه‌ یه‌ك بخات و ئاراسته‌یان بكات؟**

حوسێنی مه‌ده‌نی: سه‌ركرده‌ی نه‌ته‌وه‌یی ئه‌گه‌ر پێویستیش بێ ته‌نیا به‌ ئاره‌زوو دروست نابێت، ئێلێتی تایبه‌ت به‌ خۆی گه‌ره‌كه‌، له‌سه‌ره‌تاوه‌ ده‌بێ زه‌رووره‌تی سیاسیی، كۆمه‌ڵایه‌تی نه‌ته‌وه‌یی كوردستان هه‌ڵگریی ئه‌م په‌یامه‌ بێ، دواتریش هێندێك بنه‌ماو خه‌سڵه‌تی سه‌رنجڕاكێش كه‌سایه‌تیی وه‌كوو پێگه‌ی جه‌ماوه‌ری، نرخی كه‌سایه‌تیی سیاسیی، گیانی لێبورده‌یی و ئه‌خلاقی شۆڕشگێڕی تێدا به‌هێز بێت، له‌سه‌ر یه‌ك و به‌ واته‌یه‌ك سه‌ركرده‌یه‌كی كارێزما بۆ ئێستای كوردستان به‌ پێویست ده‌زانم، چونكه‌ ئه‌و په‌یامه‌ دوو ده‌ستكه‌وتی سه‌ره‌كیمان ده‌توانی بۆ ده‌سته‌به‌ر بكات، یه‌ككگرتوویی نه‌ته‌وه‌یی، یه‌كده‌نگی سیاسیی، رێبه‌ری كارێزما ده‌توانێ هه‌موو ویست و داخوازییه‌ نه‌ته‌وه‌ییه‌كانی خه‌ڵكی كوردستان بخاته‌ سه‌ریه‌ك و پرسی كورد له‌ قه‌واره‌ی نه‌ته‌وه‌یه‌كی بێ ده‌وڵه‌تی(40) ملیۆن كه‌سی

موتوربە بكات، لە پاڵ ئەم ئیدە سۆزدارەدا نابێ ئەو بارودۆخە ناهەموارەی بەسەر دۆزی كوردو حاكمییەتی چەند لایەنی كوردی پارچەكانی كوردستاندا زاڵە لەبیری بكەین، زەمان و خۆماندووكردنی دەوێت، بەدوور لە هەر چەشنە پاوانخوازییەك و خۆ فەرزكردنێك دەبێ زەمینەكانی بۆ بڕەخسێندرێت.

**+ بۆچی كورد لەمێژوویدا نەیتوانیوە ئایین بكاتە هۆكارێك بۆ دروستكردنی كیانێكی ئایینی مەزهەبی كوردی وەك عەرەب و فارس و تورك كردیان؟**

حوسێنی مەدەنی: لە هێرشی لەشكری ئیسلام بۆ سەر كوردستان كوردەكان نەیانتوانی ئایینی زەردەشتی خۆیان بپارێزن و لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە، زۆربەی خەڵكەكە ملیان بۆ ئایینی ئیسلام راكێشا، سامی رەگەزكان كە عەرەبن لە هەموو گەلانی ناوچەكە زیاتر لە ئایینی ئیسلام كەڵكیان وەرگرت، لە دەروازەی دینییەوە زمان و رەگەزو كولتووری خۆیان لە سەرتاسەری نیمچە دورگەی عەرەبستان و باكووری ئەفریقادا جێگیر دەكردو گەشاندیانەوە، صەلاحەددینی ئەیوبیش هەر لە خزمەتی دینی ئیسلام و كولتووری عەرەبدا خەباتی كردو لە شەڕی سەلیبییەكاندا فەرمانڕەوایی دەكردو بۆ شكۆمەندیی ئیمپراتۆریەتی ئیسلام جوامێرانە لەگەڵ ریشاردی شێردڵ هەڵسووكەوتی كرد، كوردەكان بە خاتری دوو فاكتی سەرەكی وەكو "سروشت و ژیان" كوێستانەكان - ئاژەڵداری) ببوونە ئەستوندەكی ژێرخانی فەلسەفەی ژیانی كوردەكان، ئەم ژێرخانە ئابوورییە كوردەكانی ناچاركردبوو بەمانەوە لەزێدو نیشتمانی خۆیان و بەرگریكردن لە خۆیان، نەیاندەتوانی هێڵی شێوازی ژیانەكەیان بگوازنەوە، بۆیە لەوەی كە هەبوو زیاتر بڕیان نەدەكرد، لە حاڵێكدا ئیسلام كە لە نیمچە دوورگەی عەرەبستان سەریهەڵدا لە هەر چوارلا ڕا ببوو بە مەیدانی تەراتێنی لەشكری ئیسلام و پێشڕەوییان دەكردو بە تەواوی بەریان ئاوەڵەبوو، خەڵكی حیجازیش سەرقاڵی بازرگانی بوون، هەوڵیان دەدا بۆ دەستپێڕاگەیشتن بە كاڵا بازرگانییەكان، شوێن و وڵاتی تازەو بازاڕەكانیان بدۆزنەوە، سەردارانی عەرەب هەڵگری پەیامی تازەی

دینی بۆ گەلانی جیهانو دونیای مەسیحییەت بوون، بەردەوام هاندەدران بۆ برەوپێدانی ئایینی ئیسلام شەڕی ناموسڵمانەکان بکەنو وڵاتەکانیان داگیر بکەنو بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانیان دەستیان بگاتە بازاڕەکانیان، نیازەکانی ژیانو بژێوی، چەمکێکی بزوێنەرو هاندەر بووە بۆ عەرەبەکان لە رێگای برەوپێدانی دینی ئیسلام وڵاتانی دیکە داگیر بکەنو کەڵك لە بەروبوومیان وەربگرن.

دوای شکستی ساسانییەکان، عەرەبەکان تاقی کیسرایان داگیرکرد، بەڵام ئێرانییەکان هەرچەند ئایینی ئیسلامییان قبووڵکردبوو، لە ئاستی کولتووری عەرەبدا حازرنەبوون خۆیان قال بکەنەوەو ملکەچیان بن، بۆیە هاتن لەناو ئایینی ئیسلامدا لقێکیان کردەوەو شیعەگەرییان کردە باو کوردەکان لە نێوان دوو بەرداشی شیعەو سوننەدا تەراتێنیان دەکرد، لە بەرامبەریاندا نە دەبوونە دەمارگرژیی هیچ کامیانو تەنیا سەری خۆیان پێ رادەگرتنو لەناو ئەو موزماسیۆنەی کە سروشتو ژیان پێکیان هێنابوو، قەتیس مابوونەوەو خۆیان بە ژیانی خودکەفابوون راهێنابوو، سروشت هۆکاری سەرەکیی شێوەی ژیانی کوردەکان بوو، بە واتەیەك کوردەکان گیرۆدەی سروشتی کوردستان بوون، بۆیە کوردەکان لە درێژایی مێژوودا شاخو داخەکانی کوردستانیان بەرنەداو لەبەر ئەو خاڵە لاوازە هەلە رەخساوەکانیان لە مێژووی ژیانیاندا نەقۆستەوە، بۆ وێنە: عەبدورڕەحمان پاشای بابان کاتێك لەسەر داوای فەتح عەلی شای قاجار هێرشی بردە سەر بەغداو گرتی، حازر نەبوو تکاو رەجای خەڵکی شارەکەش بۆ والییەتی بەغدا قبول بکاتو تێیدا بمێنێتەوە! کوت "قومەئاوێکی کانیاوەکانی کوردستان بە هەموو بەغدا ناگۆڕمەوە."!!

میر موحەممەدی رەواندزیش هەر ئەو بەزمەی گێڕا، خەڵکی ناوچەکانی (بين النهرين)یش ئامادە بوونی خۆیان بۆ فەرمانبەریی لە میر موحەممەدی رادەگەیەنن، میر موحەممەد لە وەڵامیاندا دەڵێ: "ئەمن دەخلی مەنتەقەی

حكومەتی پاشای ئیسلامیی ناكەم، خودا تۆفیقم بدات ئەو حكومەتانەی لەدەست دەرەبەگی كوردستاندان زەبتو تەسخیریان دەكەم".

ئەمە گیروگرفتی كورد له مێژوودا، نەك هەر نەیتوانی ئیمپراتۆرییەك لەناوچەكەدا دابمەزرێنیٚ، بەڵكو ئەوە ئیمپراتۆرەكان بوون ببوونە ملۆزمێك بەسەر كوردەكاندا فەرمانیان دەداو باجو پێتاكیان له پشتی كوردەكان قایم دەكرد، شەڕی مەقاوەمەتو خۆڕاگریی كوردەكان له عورفی نیزامیدا سەرەنجامەكەی هەر شكستو سەرتێداچوونە، قەتیش نەیدەتوانی بۆ كورد ببێتە نانو ئاوو خێر بداتەوە

.

**+ له چ قۆناخێكدا ڕوحی كوردایەتی و نەتەوەیی لای كورد بووەتە ئایدۆلۆژیا تا سوودی لێوەر گرتبیٚ بۆ هەڵسانەوە؟**

حوسێنی مەدەنی: ئەزموونی دوو سەدە خەباتی رزگاریخوازیی له كوردستان كە بیٚ پسانەوەو بە دوی یەكدا رێچكەیان بەست هەر له خۆڕا و خود ئاسا لەسەر خاكی كوردستان هەڵنەقوڵیون، گشتیان پێوەندیی دیالێكتییان بەیەكەوە هەیە لەسەرچاوەی كوردایەتی ئاویان خواردۆەتەوە، بەڵام بە زۆر هۆ ئەو گیانە كوردایەتییو نەتەوەییە نەیتوانیوە یەك جیٚ هەموو كوردستانو نەتەوەی كورد لە خۆیەوە بگرێت سنوورە جوگرافییەكە له ناوچەی مەڵبەندێكی كوردستانو ئەوپەڕەكەی پارچەیەكی كوردستان بەولاوەتر نەترازاوە، وێنەی زیندوو شۆڕشی ئەیلول له كوردستانی باشوورە، كاتێك بەدوای پەیمانی ئەلجەزائیر، شۆڕش بە سەرۆكایەتی مستەفا بارزانی هەرەسی هێنا، هەرچەند ویژدانی هەموو كوردێكی بریندارو بە پەرۆش كرد، ناهومێدییو بیٚ هیوایی كوردستانی گرتەوە، كەچی دیسانیشو سەرلەنویٚ رۆحی كوردایەتیو نەتەوەیی هەر له كوردستانی عێراق وەجۆشو خرۆش هاتووەو بە برِشتترو بە وزەتر له جاران له هەمان هەرێم هەڵپەی

سه‌ندووه‌و یه‌كیه‌تیی نیشتمانی له‌ دایك بووه‌و شۆڕشه‌كه‌ی هه‌ڵگیرساندۆته‌وه‌، ئه‌م قۆناخه‌ له‌ بزافی رزگاریخوازیی نه‌ته‌وه‌ییدا هه‌رچه‌ند حاڵه‌تی لۆكاڵی هه‌بوو به‌ خاڵێكی به‌ پێزو سه‌مبولی ئایدۆلۆژیای نه‌ته‌وه‌یی ده‌توانین مه‌زنده‌ی بۆ بكه‌ین، خاڵی دره‌وشاوه‌ دوای هێرشی نیزامیی ئه‌مریكا بۆ سه‌ر عێراق هاته‌ دی، ده‌ستپێكی ئه‌م سیناریۆیه‌ پێكهێنانی به‌ره‌ی كوردستانیو سه‌ره‌نجام هه‌ڵسانه‌وه‌و راپه‌ڕینی جه‌ماوه‌ریی له‌ سه‌رانسه‌ری هه‌رێمی كوردستان بوو، كه‌ دامود‌ه‌زگای رژێمی به‌عسی له‌ هه‌رێمی كوردستاندا ته‌فروتونا كرد، به‌رهه‌مه‌كه‌شی دامه‌زراندنی حكومه‌تی هه‌رێمی كوردستان و هه‌ڵكردنی ئاڵای سێ ره‌نگی كوردستانه‌. له‌سه‌ر یه‌ك له‌ مێژووی خه‌باتی رزگاریخوازیی كوردستاندا رووحی كوردایه‌تیو نه‌ته‌وه‌یی هه‌تا ئێستاش هه‌ر له‌ناو سنووری لۆكاڵیدا ماوه‌ته‌وه‌و نه‌یتوانیوه‌ گشتگیر بێتو هه‌موو به‌شه‌كانی كوردستان دابگرێت. پانو به‌رینی خاكی كوردستان، نایه‌كگرتوویی گیانی نه‌ته‌وه‌ییو نیشتمانیی، هه‌لومه‌رجه‌ نایه‌كسانییه‌كان، به‌ربه‌ستی سه‌ره‌كی بوون له‌سه‌ر پێنه‌گه‌یشتنی ئایدۆلۆژیایه‌كی خۆماڵی، به‌ ئامانجی راچڵه‌كاندنو هه‌ڵسانه‌وه‌، قۆناخێكی ئه‌وتۆ تا ئێستاش له‌ كوردستان له‌دایك نه‌بووه‌.

# بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئـا: عەبدولـدائیم مـەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |

| | | |
|---|---|---|
| ١٦ | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| ١٧ | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، | فەرهاد شاکەلی |

| | | |
|---|---|---|
| | ڕووناكبیر و دەسەڵات | |
| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێكۆڵینەوەیەكی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەكانی بوخاری و موسلیم | ئامادەكردن و وەرگێڕانی: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەكخستنی میرنشینە كوردییەكاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد كاكە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەكان، ڕەواندنەوەی كۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەكانی ئیسلام | ن: دكتۆر كەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی كوڕی عەففان، كەسایەتی و سەردەمەكەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خوانی ڕووح، توێژینەوەیەكە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەكردنی: ڕەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماكانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەكەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |

| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی راگەیاندن و راگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
|---|---|---|
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |
| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صدیق عەبدولعەزیز |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو رێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا (بەرگی یەکەم) | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفى محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحيم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحيم معرفتی |

| | | |
|---|---|---|
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیە ؟<br>وەڵامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووســـینی: ڕوقیـــە صـــدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووســـینی: ناصـــح ئیـــبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بـــیری ئوســـوولّیی ئیـــسلامی (لـــەنێوان خوێندنـــەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | دەروازەیەك لەمەڕ كێشەی ڕۆچوون<br>هۆکار.. کاریگەرێتی .. چارەسەر | ئامـادەکردنی : یاسـین ئەحمـەد زەنگەنە |
| ٥٥ | ئاین لە فیکری مەسعود محەمەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غفور |
| ٥٦ | ئیسلام لە نێوان نەزانی عالمەکانی و بێ توانایی نەوەکانی | نووسینی: جەمال حەبیبولّا |
| ٥٧ | تاك و حکومەت لە شەریعەتی ئیسلامدا | نووسینی:<br>دکتور عبدالکریم زیدان<br>وەرگێڕانی:هێمن ڕێنوار |
| ٥٨ | جوگرافیای ئاو و هەوا | نووسینی: د.عەلی ئەحمەد غانم<br>وەرگێڕانـــی : گـــۆران ڕەشـــید ئیمامی |
| ٥٩ | کۆزارا | نووسینی:<br>حمە ڕەشید نادر هەورامی |

| ٦٠ | ڕۆژمێری تیشك | ئامادەکردنی : ئیکرام کەریم |
|---|---|---|
| ٦١ | سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە | نووسینی: دکتۆر ئەکرەم زیائولعومەیری<br>وەرگێڕانی : ئیحسان بورهانەدین |
| ٦٢ | دۆزی کورد | ئامادەکردنی: ئارام عەلی سەعید |